# کاروان



گۆڤارێکی رۆشنبیریی مانگانەیە.. نەمیندارێتی گشتیی رۆشنبیریو لاوان بەزمانی کوردی و عەرەبی دەری دەکا

سەرنووسەر

**حکمت حاجی سلیم**

جێگری سەرنووسەر

**حسین رەشوانی**






ئەیلوول و تشرینی یەکەم

١٩٩٠

ساڵی نۆیەم


## • لەم ژمارەیەدا


**تۆمارێکی تایبەتی**
هاشم جەباری، مغدید سوزان، قسیم حسن (٤)
ساجد ئاوارە، مکرم تاڵەبانی،
عبدالخالق سەرسام، صدیق شرو،
حسن تەنیا، ئازاد محمود، هەڤاڵ ابوبکر
علي عارف، عبدالعزیز خیاط خالد حسین
سعید یحیی، معد الجبوري

**مێژوو**
بدران احمد خالد (٢٧)

**زمانەوانی**
عبدالوهاب خالد (٣٨)

**رەخنەو لێکۆڵینەوە**
کاکەی فەللاح، یوسف روستم احمد (٥١)
فائیز ملا بکر

**هونەر**
ئازاد دڵزار، عمر رسول (٨٦)

**رۆشنبیریی گشتی**
اسماعیل رۆژبەیانی (٩٧)



ئەدرەس:
هەولێر ئەمیندارێتی
گشتیی رۆشنبیریو لاوان
گۆڤاری کاروان ت ٢٠٨٨٢

لەنامەخانەی کتێب و بەڵگەنامەکان لە بەغدا ژمارە ٤٨٣، ی ساڵی ١٩٨٢، ی دراوەتێ.

● ئەو ووتارانەی نەشیان بۆ بلاوکردنەوە: نادرێنەوە بە نووسەرەکانیان.

لەچاپخانەی رۆشنبیریو لاوان لە هەولێر چاپکراوە

نرخی «٥٠٠» فلسە

# ملف خاص

## العراق الجديد
## في ضمائر
## شعرائنا ومهرجانهم

# تۆمارێکی تایبەتی

## تۆمارێك
## دەربارەی
## ئەو میرەجانە
## شیعرییەی لە هەولێر ساز درا



# ملف عن المهرجان الشعري الذي أقيم في أربيل

تحت شعار «العراق الجديد من زاخو الى البحر في ضمائر الشعراء» وبحضور الرفيق حسن علي عضو القيادة القطرية لحزب البعث العربي الاشتراكي أمين سر فرع تنظيم الشمال وبرعاية السيد جعفر عبدالكريم البرزنجي رئيس المجلس التنفيذي لمنطقة كردستان للحكم الذاتي وحضور السادة الأمناء العامين لادارات الحكم الذاتي ورئيس إتحاد الأدباء والكتاب الكرد وجمهور غفير من الأدباء والشعراء الأكراد ومحبي الأدب والشعر، أقامت الأمانة العامة للثقافة والشباب بالتنسيق مع اتحاد الأدباء والكتاب الكرد على قاعة مديرية المسارح في أربيل مهرجاناً شعرياً يوم الثلاثاء ٩/١٠/١٩٩٠ الساعة الحادية عشر صباحاً إشترك فيه العديد من الشعراء من محافظات منطقة كردستان للحكم الذاتي ومحافظة نينوى.

وقد تم افتتاح المهرجان بقراءة سورة الفاتحة على أرواح الشهداء بعدها ألقى السيد أمين عام الثقافة والشباب الأستاذ حكمت حاجي سليم كلمة بالمناسبة وقدمت فرقة الانشاد التابعة للأمانة العامة للثقافة والشباب أناشيد وطنية ومن ثم ألقى الشعراء الأكراد والعرب المشاركون في المهرجان قصائدهم تباعاً والتي **أنشدوا فيها للعراق العظيم وقائده الهمام الرئيس المناضل صدام حسين (حفظه الله) متصدين فيها للهجمة الأمبريالية التي يتعرض لها قطرنا المناضل مستنكرين الحصار الاقتصادي على بلدنا وجرائم الغزاة والصهاينة.**

وفيما يلي القصائد التي ألقيت في المهرجان المذكور.

لە ژێر دروشمی **«عیراقی نوێ لە زاخۆوە تا دەریا لە ویژدانی شاعیراندایە»**و بە ئامادە بوونی هاوڕێ حسن علي ئەندامی سەرکردایەتی ی هەرێمایەتی ی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست ڕازگری لقی ڕێکخستنی باکوورو بە چاورێری ی بەڕێز جعفر عبدالكريم بەرزنجی سەرۆکی ئەنجومەنی ڕاپەراندنی ناوچەی ئۆتۆنۆمی ی کوردستان و ئامادە بوونی بەڕێزان ئەمینداره گشتییەکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی‌و سەرۆکی یەکیەتی ی ئەدیب و نووسەرانی کوردو جەماوەرێکی زۆر لە ئەدیب و شاعیرە کوردەکان و ئەدەب و شیعر دۆستان، ئەمینداریەتی ی گشتی ی ڕۆشنبیری‌و لاوان بە هاریکاری لەگەڵ یەکیەتی ی ئەدیب و نووسەرانی کوردا لە کات ژمێری یازدەی سەر لە بەیانی ی ڕۆژی ٩/١٠/١٩٩٠ میهرەجانێکی شیعری ی فراوانی لە هۆڵی بەڕێوەبەریەتی ی شانۆ لە هەولێر ساز کرد چەندان شاعیر لە پارێزگاکانی ناوچەی ئۆتۆنۆمی ی کوردستان و پارێزگای نەینەوا بەشدارییان تێدا کرد.

سەرەتا میرەجانەکە بەخوێندنی سوورەتی فاتیحە بۆ گیانی پاکی شەهیدان دەستی پێ کرد پاشان بەڕێز ئەمینداری گشتی ی ڕۆشنبیری‌و لاوان مامۆستا حکمت حاجی سلیم وتەیەکی بەم بۆنەیەوە خوێندەوە، دوای ئەوە تیپی سروودبێژی سەر بە ئەمینداریەتی ی گشتی ی ڕۆشنبیری‌و لاوان چەند سروودێکی نیشتمانی ی گوت، پاش ئەوە شاعیرەکان یەك لە دوای یەك تر هۆنراوەکانیان خوێندەوە تێیان دا بە باڵای عیراقی مەزن سەرکردە لێهاتووەکەی‌دا سەرۆکی تێکۆشەر **صدام حسین (خوا بیپارێزیت)** هەڵیان دەداو بەرەنگاری هێرشی ناڕەوای ئیمپریالیزم دەبوونەوە کە وڵاتە تێکۆشەرەکەمان ڕوو بە ڕووی بووەتەوەو نارەزایی خۆیان دژ بە گەمارۆدانی ئابووری‌و تاوانەکانی داگیرکەران و زایۆنیزم دەردەبری.

ئەمەش ئەو شیعرانەیە لەو میرەجانەدا خوێنرانەوە..

# هەڵۆ صدام

هاشم جەباری

کەی روی داوە؟!..
کونە پەپو
هاوڕێی قەلە ڕەش
بەدخو...!
هەندە ئازاو
بەغیرەت بێ...!
چاو قایم و
بەهیمەت بێ...!
لە کەلاوەو تاریکەشەو
لە خواردنی گۆشتی بۆگەن
دور بکەوێ...!
بەرەو بەرزی
بەرەو ئاسمان
سەر بکەوێ..
تاکو لەوێ
بەرەنگاری هەڵۆیەکی
چاو نەترس و تیژ ڕۆ
دڵ بەهێز و بڕوا بەخۆ
بێ...!
نەخێر...

نەبوەو نە دەشبێ
هەلۆ
نێچیری کوندەبۆ و
خواردەمەنیی
قەلەرەش بێ...
چونکە، هەڵۆ
شای ئاسمانی، سروشت و جوانیی
کە هاتە دەست

نە کوندەبۆ و نە دۆستانی
خۆ ناگرن
لەبەر چنگی
وەك پڵنگی
تورەو بە سۆ...
بۆیە لە ترسان، هەر
لەنێوەی ڕێ
باڵی دەشکێ و
ئەژنۆی دەمرێ
بۆهێلانە تاریکەکەی
بەگوڕ دەفرێ.. نەوەك بمرێ

کەچی ئەمرۆ
بۆشی پەپو و تاتشەرەکەی
لە روی قەل دا
قەلی رورەش، خۆ دەنوێنن
بەرەو قەڵای
شکومەنیو
صدام حسین
هەنگاو دێنن...
تابتوانن
پێشکەوتن و شارستانیی
ئەم عیراقە
بەتاوان و ستەمکاری
بخنکێنن....
بەڵام..
هەڵۆ صدام
بە تیشکی چاو گەڕ بروانێ
نەك هەر باڵیان
نە ئەژ نۆیان
بەڵکو پەڕو مێشك و چاویان
هەر لە ئاسمان
پارچە پارچە
بەرەو زەوی..
بەرەو دەریا..
بەرەو دۆزەخ..
شۆڕ دەبنەوە
تاس ایەوێ
لەگەل دۆستی دێرینەیان
لەگەڵ شەیتان
باوەش بۆ یەك بگرنەوە
نەفرەت، لە بەختی خۆ بکەن
جوا ناوی شەرمەزاریی
بسڕنەوە...

# سوارەی بەیان

مەجید سۆران

سوارەی بەیان
نامەبەری چاو هەلێنان
لەخورپەی شاعر دەروانی
لەدەردی عاشق دەزانی
بەبێ نەخشەی زنیدە خەوا
بەبێ رازی مانگە شەوا
دلەی زارم ژان گرتووە
گری شیعری تێپەریوە
بە نەوای دەرویش عبدالله
لەگەڵ گۆران
بۆ مانگی شیعر
پەرواز دەکا
لە پاوانی گەورەی جیکۆر
حەزلە مەلەی
دەریای چاوی
(هوما) دەکا
بەڵکو خوابی
لە ئاهەنگی بیرو هەستە
لەتاسەی عیشقی ئەم گەشتە
لەمزگێنی ئاسۆی گەشی
سرووشی شیعرم پێ بەخشی!
بیرێ دێنم
بیرێ دەبەم
ئایا لەکوێ دەست پێ بکەم
لەو رۆژەوە لە دایك بووم
یا لەو ساتەی بەکێو هەلچووم
لە خەونی رووناکی بەریندا!

لە ئازارو خۆشی ژیندا
لەلاپەرەی مێژووی دوێنێ
دەها «نێرۆن» خۆی دەنوێنێ
دەردومینەت تووشەی رابوو
ئوومێدی گەشت گەوارابوو
وەلێ ئازارو ئەشکەنجە
سوتاندنی دەست و پەنجە
کاری نەکردە سەر مێران
بە رابەری سوارەی سواران
وتیان نابێ سام بخەوێ
هەرگیز جەمبوڵ سەربکەوێ
تا لەرێگەی رەنج و خەبات
لەدوورگەی ناو
لە لوولەی تریشقەی هەتاو
رۆژی ئازادیمان هەڵات
لەو کاتەوە
سوارەی سوارانمان هاتەوە
سەرکەوتنی هێنایەوە
ئێستاو سبەش
لە رۆژی گەش
یا شەوی رەش
لە هەڵبەستم
لە قوولایی بیرو هەستم
مەشخەلی گەل
پێشەوای گەل
تۆی مەبەستم
تۆی مەبەستم

# روژا مێرا

صدیق شرو

ترس و برسێ ژمە شەرمە
ئەڤینا ئاخا وەلاتی یادگەهێتن
هەر یاکەلەو هەر یاگەرمە
چ دلدارە دلبەراخو دێ هێلیتن
ژسینگ و بەرێت وێ ب رەڤیتن
چ عەگیدە خەنجەراخو
روژا شەری دڤەشێریتن
هەسپێ کمێت بشەهێتن
چ شەرکەرە ل مەیدانێ
ب تلیلیا تڤەنگاخو گەرم نابیتن
چ شەرڤانە ب کرتژینا زاروکێ خو
تێر نەبیتن
بلا بهێن مەبرسیکەن
ئەو چ کەسەڤی وەلاتێ هوساشرین
ژدەریایێ هەتازا خو جارەکادی
بوچەپەلێت ئینگلیزی دێ هێلیتن
ئەم نەئەوێن ترس و برساڤە حەوین
ئەم نە ئەوین سەرێ بلند
بو چەپەلا ڤەچەمینین
هندی خرببن هندی ب جەحێن
لە دیلانەو پێتر ملێت
خو ل گوڤەندێ دەژێنین
ئەم دتێرین دبرسی نینین
ژگرنژینا دجلەو فرات
گولیا گەنمی دیشکوژتین
مەنەدیتیە شێر ژبرسادا بمرتین
ژمێرانیا سەروکێ خو
سەرکەفتنی ئەم دبینین...

# کل وگل

قسیم حسن أمین

ل هەر وارەکێ
ل شین بارەکێ
ئەم دگەل تەینە
مرن و ژیانێ پیڤەینە
ل هیڤینا تبلا شەهدا ئەینە
گەل تەکۆتی
مەچاڤ کلدان
هێوار کێلان
کاو دان پیڤان
جەبلخانا تاقێ قشلێ
سینگێ عیراقا نۆکەینە
گل هەر کلەو
شیرخۆر مەینە
بانگ هەلدیران و قەلغەینە
هزێلڤانێن وارێ تەینە
ئەڤرۆکەینە
هەر دوژمن و دۆرندنە
ڤاڤێرکرن
مێرخاس هەمی
چەکدار کرن
ئاڤا بەرێ رەشبوش کری
تافیل کرن
هەرچی زیوانا بیانی
هەرچی رهێت بیناگەنی
هەلما شکودارا رەنیو
خەیارکرن
ئەڤرۆکەینە
ب دعل و گیان
ئەم دگەل تەینە
سۆیندا .... م واط و حەهی
رێژنە چەڤێت پر سینەهی
وار کەلشتیو بەیار مەهی

ڤەزێتە سەر
کەنی مێرگ و
بەرەف قیبلەکا
ئاڤە هی...
ئەڤرۆکەینە...
ب ڤین و ئایین و هەیڤەینە
ب ئەینا عیراقا خەتیرە
نە شەڤا دی ونە
هەرا گەشەو نەڤەمیرە
ب شورشڤاناو شارستانا
ڤی وەلاتی
ب هەمی داستان و ئەفسانا

ب سەرۆکاتی
مە باوەرێ زوی
پێهاتی
تۆ خەلاتی...
تۆ خەلاتی...
داخازا مێژوویە ساتی
دهەوارا بویك و زاڤە بێت
باژێرەکێ
ستێر هژمارتی..
ل دایکبو نەکا خور هەلا
ئەڤرۆکەینە
ب نێرومیيا
ل هەر چوار کنارا حزبیا
ئەم دگەل تەینە
هەر ئێڤارا
پەیڤێت زارو خویندەوارا
هوزانەکا بێ پیت و خالێ
ب ئاوازەکێ شادو نهالێ
مژدەکا نوی
سیبەرا هەیڤەکا ئاڤی
دبۆ هۆ ژینن..
ل دەف تەت چینن
گوهـ چنینن
هەر د بەزن
داب گەهینن
سلاڤێت پر
هیڤیا مەزن
هیڤیا مەزن

---

تیبینی -
م ـ مکه ـ مدینه
ط ـ محمد المصطفی حی
حه ـ الحجاز

یارێکی تایبەتی

# پێنج پارچە شیعر

سلیمانی: ساجد ئاوارە

١٩٩٠/١٠/٥

## ١. ئەمەریکا ساڵی ١٨٣٢

لە ئەوروپا
کام تاوانکار
دزو جەردە
کامە زۆر دار
خۆیان گەیاندە
ئەمریکا

●●●

ئەوەی رەسەن
ئەمریکی بوو
پێستی سووری
رەنگ ، رەشی بوو
خوێنی ئەمان
حەڵاڵ کرا
لە هەر بستە
خاکێکیان دا
هەر پێست سووری
مەیلەو رەش بوو
خوێنی، رژا

●●●

تاوانبارانی ئەوروپی
خۆیان ناو ناوە ئەمریکی
کەوتنە گیانی
پێست رەشانی
..... ئەفریکی
پاپۆر پڕ بوون
لەم رەشانە
مێژوو، شاهێدی
عەیانە
وەکو ئاژەڵ دەفرۆشران
لەرەگ و ریشە...
دەرکێشران
لەژیارو شارستانی
ئەم رەش و سوورە...
دابران

## ٢. دەنگی رۆشنبیران و شاعیرانی ئەمریکی رەسەن

دەنگی پێست رەش
وەک ئاگری گەش
رووەو زۆر دار
هەستایەوە
رۆشنبیرانی عەقڵ دار

بەبێ دەنگی نەمایەوە
خامەی «ئالن لوك» بەشیعری
تاوانی والا کردەوە
«شارلز جیلین»
شانۆی کۆنی، روون کردەوە
«بول روبنسن» بەدەنگی قین
بوو بەمارشی گشت سەر زەمین
نە ئاوەها
نەدیبانی
پێست رەشانی
گشت ئەمریکا
بەگژ زەبرو زەنگا ئەچوون دەزگای رژێمی ئەوروپا
لە ئەمریکا حەیا چووبوون
ئیتر جەردەی (کوکلوکس کلان)
کە بە دۆلار خوێنی ئەرژان
ئەی پێست رەش
تێکۆشەری
لانە شێواو
رۆژەو سەدەی بیست و یەکە
ژێر دەستەو مل کەچی تەواو

## ٢ـ خاوەن بۆرسەو کارگە ئەمەریکا دەبەن بەڕێوە

ناوچەی (ئۆهایۆ)، (رۆکفولەر)
مەچەکی خستە، سەر کەمەر
کارگەی (ستاندەر ئۆیلێ)
هێنایە بەر
(ئۆرمەر)و (دیوك)و (مورجان)
وا هاتنە سەر، خێرو بێری
شیلەی ژیان...!

ئێستا ئا ئەم خێزانانە
بگرەو بکوژ، هەر خۆیانن
...... لەم ژیانە
بەناو دەوڵەتی ئەمریکین
جێی سەربەستیو دیموکراسین
وەك ماری حەوت سەر ئاوەهاد
پیشەی ژەهرە، بۆ گشت گەلان



لە چ ناو چەو، چ جێگایەك
گەردەلوول بێت، رەشە بایەك
دەستی ئەمریکای تێدایە
نوێنەری، لەوێ دایە
لەناو دەریا کە دووماسی
بەشەر هاتن
نەخشەو پلانی ئەو جەنگە
لەبۆ ئەمریکای ئەباتن
دوو مەل، دەنووك لەیەك ئەدەن
هەر ئەمریکا، فیتی ئەدەن
چ جەنگ لەناو دەوڵەتانا
کە ئێسان پێی هەراسانا
ئۆباڵ لە گەردنی دایە
بێ ئاژاوە، ئۆقرەی نایە
لەناو ئەمریکای لاتینی

ـ ئەفریقا. لەباشوری
لەناو لوبنان، لە فەلەستین
هەرتنۆکە خوێنی ئەرژێ

بە فرمانی ئەمەریکا
خوێن، ئەپڕێ.
ئەژدیها یەو

سەدان ساڵە
بەمیللەتان
ئەکا، گاڵە

## ٤. ڕێبازی ئێستای ئەمریکا

ئێستا سەرەك کۆمار

بووشە
تێر نەخۆرو دەریا
لووشە
بە خەیاڵی باپیرانی
کلکی ناوەتە سەرشانی
وا ئەزانێ ئەم دونیایە
هەر بۆ ئەوانەو ڕەوایە
جێ گۆرکێ کاو
ڕژێم تێك داو
چی دڵ بێ گرێ
جێ لەوەری بۆ خۆش بکرێ

## ٥. بۆش و پلانی بو سەر عیراق

بۆش ئەمجارە
بێ بازارە
پەل ئەهاوێ
بۆ ئاژاوەیە ناچارە
لە کتێبی ڕەش قینی
کەنداوی عەرەبی بینی
ئەلقە لە گوێ کانی بزوان
بەڕای ئەوان
هێنایە بەر
کەرەسەی جەنگ
نەخشەی پلان
وای ئەزانی (میرە جورجی)
شاری (کوێت)
بە چەشێرە
نەی ئەزانی، بەفیکەیەك
ئەو ئەکەوێ
لەو هەڵدێرە.
گەلە کۆمەکی ئەورووپا
لەناو دەشت، ئاسمان و دەریا
گەماڕۆی عیراقیان داوە
میرو چلکاوخۆر لە دوواوە
ئەو جازوو، زەندەقیان چووە
عیراق، ڕوو بەڕوویان بووە
گەلی عیراق لەسەر پێیە
بۆ پاراستنی نیشتمان
لەپیر لەگەنج، ئەوەی مێیە
بۆ بەرەنگاری دوژمنان



هەتا «صدام» رابەرمان بێ
تا سەربەستی ئاواتمان بێ
با (بوش) بمرێ بەوەمەراقە
(کوێت) شارێکی عیراقە

---

١ـ ئالن لووك / شاعری پێست ڕەشی ئەمریکایە
٢ـ شارلز چیلین / ئەویش ئەکتەر نووسەری شانۆیە پێست ڕەشە
٣ـ بول ڕۆبنسن / پێست ڕەشی گورانی بێژی ئازادی بەناوبانگە
٤ـ ڕوکفولەر / خاوەن کارگەو بۆیسانە
٥ـ ئۆرمەر / دیوك / مورجان دەوی ٤٠٠ خێزانن دەستیان بەسەر زوربەی کارگەو بۆرساتەوە هەیە یا ئەمەریکا لەسەر پەنجەی ئەوان دەسوڕێتەوە سەرمایە دارن.
٦ـ کوکلوکس کلان / پیاو کوژی ئەمریکا بوون بەپارەی سەرمایە دارەکان

# نیشتمان

مکرم تاڵەبانی

نیشتمانی من یارێکە پرچ خەنەیی
بەژن زراف، مەچەك ئەستوور
لەجوانیدا
تاك.. بێسنوور
هزاران هەزار ساڵە
بۆمن داڵدەو.. خانوو
جێو رەشماڵە
لەسێبەری ئەو پرچەیدا
ئاسۆم ئاڵە
رێم فراوان، بیرم رەوان
ئاشقی ئەو چاوانەم
پێیان دەروانێتە جیهان !

★

ئەمێستاکە، جەنگ خوازەکەن
هاتوون.. داواڵیون
دەیانەوێت ئەو پرچانە
بەئاگری رق و کینە بسووتێنن
چاوی گەشی دڵدارەکەم
بەنێزەی قین دەربهێنن
شیری فەرو خواپێ داوی
لە زارووەکان.. بفرێنن!
پیرەمێردو بە ساڵ دا چوو
لەبرسان دا لەناوبەرن
بەژنی رێکی دڵدارەکەم
بەبزماری کینەی هەزار ساڵە
کون کون بکەن.. دایرووخێنن!
ئەو بازووە ئەستوورەی یار
لەناو کۆت دا دارزێنن
ئەو جوانییەی زەوت بکەن
گری کۆنی تێبەربدەن
کانیاوەکان ژاراوی کەن
رووبارەکان بەرەو دواوە ببەنەوە
خەرمانەکان بسووتێنن

پەرەی رەشی تاوانەکان
هەڵ دەنەوە
پاچی تیژی بێ ویژدانیی لێ هەڵبگرن
رەورەوەی رێی ئەم دەڤەرە
خر رابگرن
مێشك و بیری گشت دڵدارێك
بتەننەوە
کۆرپەو دایك و خاك و مرۆڤ
لەیەکتری بکەنەوە
پەرەی سەدە تاریکەکان
دیسان لەنوێ پەرت و بڵاوبکەنەوە!

★

جەنگ خوازەکان
هاتوونەوە
وێرانکاری، تاوانکاری
پەرت کەنەوە
ناوچەکەمان
بۆ سەردەمی (ئەبوو ناجی)
ببەنەوە
بەرو بوومان تاڵان بکەن
گەلەکەمان رەو پێ بکەن
نەوت و فەرمان هەڵبلووشن
سنگی خۆیان دەرپەرێنن
پێکی بێ هۆشی بنۆشن
لاف لێ بدەن.. لاف لێبدەن
گوێی جیهانی پێ کەر بکەن!!

★

ئەو جەنگ خوازە بێ مێشکانە
با بزانن منی ئاشق
ئەم دڵدارەم وا خۆش دەوێت
دڵدارەکەم نیشتمانە
بە خوێنی دڵ دەیپارێزم
چەکی بیروباوەری خۆم هەڵگرتووە
لەسەنگەری بەرگریدا
سەنگەری خۆم لێ گرتووە
تك.. تك.. بەخوێن
بەچەندان ساڵ
ئەو جەژنەیەم.. پەروەردە کردوو
لەپێناوی چاوانیدا
لەپێناوی ژیانیدا
شەوبێداریو ماندوویەتیو
شەونخوونیم لێ چەشتووە
بەم چەکەیەم وا لەشانم
بەم خوێنەیەی.. وا لەگیانم
تادوا هەناس دەیپارێزم
هەتا لەژیان دا ماووم
رێگە نادەم..
دوژمنەکان پەنجەی ناردوایی
بۆیەك تاڵە پرچی درێژ بکەن
خاکی کۆشکی بەرهەتاوی
بەپێی چەپەڵ.. بێ نوێژ بکەن!!
ئەم خاکەیەم.. ئەم یارەیەم
بڕوایەکە لە مێشکم دا
کەس ناتوانێت جێی لەق بکات
لەنێو شانەی ئەم مێشکەم دا
[illegible]
تفەنگێکە لە شانمایە
گوللەی تیژی
لەرێی ماف دا
رووەو دوژمن..
دوایی نایە.. دوایی نایە!!

# کش مەلیک

عبدالخالق سەرسام

چ دهۆڵ و زورنایە چ ئاوازێکی ناسازە
وا دێ لەدوور بێ ئەندازە...
ئەمەریکایە ئەڵێن هاتووە...
هاتووە بێ بە ئیسلام و نوێژ بکا
یا بیابانی پاکی حیجاز
بەبێ نوێژو بەقرێژ بکا
ئەمریکایە ئەڵێن هاتوود
هاتووە بۆ حەج کەشیدەی زەرد
لەسەربنێ...
یا کەشیدەی باپیرانمان سەر لێژبکا..
ئەمریکایە ئەڵێن هاتوود
دەست نوێژ بشوا بەنەوتی رەش

(فهد) عدد مەسینەیە
دەستێکی لەسەر سینەیە
یەکی لەسەر مەسینەیە
ردێن تەوشوو
لێرە عەگال لەسەر دەنێ
لەوێ کابۆی لەبەر دەکا
(دیسکۆ دانسەر)..

وەك ئەکتەری سینەمەیە
(عەینەن) دەڵێی سینەمەیە
ئەمریکایە ئەڵێن هاتووە
پارێزگاری مەکە دەکا
لە هێرشی ئیسلامەکان
قەل بە کۆتری ووت رووت رەشە
لەو عاجباتیە لەو نوکتەیە
«ئەنگۆ» ئاگاو لەوبەزمەیە
هەزاران هەژار لەبرسان مرد
ئەمەریکا دەنگی نەکرد
دەها وولاتیان داگیرکرد
ئەمەریکا هیچی نەکرد
کەنەوت فرۆشێ هاواری کرد
ئەمریکا هات بەدەست و برد
هاتووە شیری منال ببرێ
هاتووە بکوژێ هاتووە ببرێ
هەر بۆ ئەوەی کشی لەمەلیك فهدنە کرێ
کشی لە قاروونی کوێت نەکرێ
لێیان پرسی بۆچی هاتووی
ئەی رێگا چەوت
بە ئەنقەسەتە یاخو هەڵکەوت
بێ شەرمانە بەدەمی خۆی
ووتی بۆ نەوت...
ساڵە هایە قاروونی کوێت

لەسەر بیری زێری هەزاران جێ‌نیشە
هەزارانیش لەووڵاتی گەورەی عەرەب
بەبێ نانە بەبێ ئیشە
لە شەوانی رۆژ ئاوادا پارەرێژی
مێزی قومارو رابواردن بوون
بێ شەرمانە لەم سەرو سوکتو لەم ریشە
چەند کەسێك بوون نەخوێندەوار
پارە تەنیا راو بیریان بوو
بێ مێشك و هۆش و ئەندیشە
ئەی ئەمیری (نەء)

ئەی ئامێری دەست و پەنجەی ئەمەریکا
بۆ خۆت برۆ بۆ لای جۆرج بۆش
لێدە زورناو بەرمیلی بۆش
چیتر بۆن نەوتت لێ نایێ
لەپێش دەرگای دابنیشە
خەنجەر ئەدەیت لە هاوخوێن و
برای پشتیت
نازانی کە...
سەربازانی ئەم عیراقە
زری پۆش و دەستی ئاگرو ئاسنیشە
گەرایەوە باوەشی دایك
شاری کوێتی خۆشەویست
کە منال بووم بەبیرم دێ
گەلی عیراق ئەمەی ئەویست
گەرایەوە ئەم پارچەیە
باشە پێم بلێن چ عەیبێکی تێدا هەیە
وا ئەمریکاو کلکەکانی
بەلاش خەریکی لەوغەیە...
کاروان دەروا سەگ دەوەرێ
باشترین چەك بۆ کاروانچی
گۆچانێك و دوو چغەیە

# گڤەی ..بەرد

ـ حسن تەنیا

**تێکۆشەرێکی فەلەستینی کاتێ بیستی کوێتی ئاوارەو سەر لێ شێواو بەرەو هێلانەی دێرینی خۆی دێتەوەو لە باوەشی پڕ سۆزی دایکی نیشتمانیا ئارام دەگرێ، ووتی:**

دەنگی زەنگی ناخی گڕم
بڵند ئەکەم..
خڕە بەردی بازووی پڕم
وەکو گوللە
وەکو مووشەك
بەرەو سەری زایونی‌یەکان
توندتر ئەکەم..
بەرووناکی ووشەی هاوار
وەك خۆری نوێ
خاك و ئاوو دۆڵی وولات
رۆشن ئەکەم..
لەگەش بینی و تواناو گوڕی
عێراقی لووتکەو بلندی
ئەم جیهانە جەنجاڵەوە
تواناو بازوو.. و
کڵپەی گڕی هۆشو بیرم
خۆشتر ئەکەم..
ئەو عێراقەی لە مەزنیدا
لە ژێر ئاڵای بڵندیدا
بۆ مێژووی گشت سەر کەوتنەکان
دەشنێتەوە..
کوێتی نازدار بۆ باوەشی
دایکی مەزن
دێنێتەوە
هەموو هێزی خواکانی جەنگ
بۆ ناو ناخی چلکاوی مەنگ
بۆ ناو چاوی کوێری پڕژەنگ
ئەبرێتەوە..
ئەو عێراقە ئاشتی خوازە
هیوای بەرزی خاکی منەو
فەلەستینی داگیر کراو
وەکو هەموو لقێکی‌تر
بە ئامێزی
پڕ لە سۆزی
دایکی جوان و میهرەبانمان
شادو شوکر
دەبێتەوە
خەتی سنوور لە نێوانا
دەسڕێتەوە..



خڕە بەردی رەق و جوانی
ووڵاتەکەم
شەوی ئاڵی رابواردنی
جل خوارەکان شڵۆق ئەکا..
هێزی باوەر لە دەروونی
شۆڕشگێران
قایم ئەکا..
فەلەستینی بریندارم
ساوایەکە توورەو گڕۆز
بۆ باوەشی دایکی دڵسۆز
**شیوەن ئەکا..**
**بەرەو هەموو خێر خواهان و**
**گشت میللەتانی سەر زەمین**
**هاوار ئەکا..**
فریام کەون
وا دوژمنی ئاشتی و مرۆڤ
پیرۆزی‌یەکەی مەککە و قودسم
گلاو ئەکا..
دەریاو چیاو بیابانم
بەرابەری خائینان و خۆ فرۆشان
بەندو ریسواو
وێران ئەکا..

# وانەی مێژوو

شیعری / ئازاد مەحمود مستەفا

ڕۆژان وانەی
قوتابخانە
باسکردنی دوژمنێ بوو
کە سەرمایەو خێرو فەری
میللەتانی دەبرد دەرۆی
چەکی شەری دابەش دەکرد
خێریش بۆ خۆی.
ئەم دوژمنە
لەوانەکانی مێژوودا
ساڵ لە دوای ساڵ
ڕق و کینەی
خێر خوازانی
وەك خۆڵەمێش
دەکرایە چاو
ساڵ لە دوای ساڵ
ڕسوا دەکراو
هەر سەرە تاتکێی لەناکاو
دێنیو دەبا
بەبێ هیوا
بە چوار دەوری
زەوی‌و ئاوی
ئاسودەگی باپیرمانا
دێت و دەچێ
ئەم دوژمنە بەنجەکانی
زایۆنی‌یەو شەر خوازانی
عەرەب بەناو

★ ★ ★

ئەمەریکا..
ناوی گەورەی
پڕ ترس و لەرز
گەورەپیاوانی سیاسەت
بازرگانی.. هەیبەتی بەرز
تەنیا ئەمە قەواڵەیە
ئەم چوارچیوە بەتاڵەیە
گفتی درۆی
بۆ گەلانی ئاشتی خوازەو
هەرچی خێرو فەریشی هەیە
هەمووی بۆ خۆی

★ ★ ★

دیسانەوە جاریکی تر
ناوی رەش و
قیزەوونی
زایونی‌و ئیمپریالیزم
دێنەوە نێو
وانەی مێژوو
بەردەبنەوە
سکی برسی پیرو مناڵ
وەکو زەروو
خوێن دەمژن و
لەم سەر زەمینی
ئازادی و هیوایەدا
خول دەخۆن و
نیازیان وایە
جێ پێی هەڵکەنراوی
دوینێ بکەنەوە
نیازیان وایە
دیسانەوە چنگی بەتاڵ
پرکەن لە زێر.. خوێنی مناڵ

★ ★ ★

ئەی هەمیشە
دوژمنی گەلانی هەژار
ئەمجارەیان
وەك یەکەمجار
دەرفەت نیە
ساڵان بێت و لەژێر سایەی
ترس و شومی تۆدا بژین
بەبرسێتی ژین دەربەین
وورد وورد بمرین
ئێستا ڕۆژی ڕاپەرینە
ڕۆژی گەورەی میللەتانی
پڕ لەقینە
ڕۆژی گەورەی سەرکەوتنە
ڕۆژی سەرفرازی ژینە
بەر لەوەی کە ڕسوا بیی
ئەم سەرزە مینە جێ بێڵە
جارێکی تر خاکمان لە خوینا
مەکێڵە
ئەی ئەمەریکای چارە ڕەش
بەناچاری
سەری شۆرت بکێشینەوە
ئێمەی عیراقی گیان پۆڵا
بەهەرەشەی بۆشی بۆشت ناتوینەوە

# بچاڤێ عراقیەکی دخوینم

خالد حسین

گۆتن.. بۆمه
کەڤن ژکەڤن،
هەستی هێشتا
نازك و تەر
بنقه.. بنقه.
دەنگێ سەرا
وێ تێ
دهێتن،
ژترسا چاڤ
دچون سەر ئێك
دل دلەرزی
ژترس و سەهما
لێ ئەڤرونه
ساخم..
لڤرم
ناچم ناچم
حام دێحینم
هەر هەر هومه.
ئەڤرو دوژمن سورێ چاڤ سیڤن
یان ئەو دەڤخوین
سەرکرینکه
لێ بێ ترسه

چونکه..
وەلات
ئەڤ نیشتمان
خودان
خەبات،
خودان پرسه
بوچی بترسه.
سەر رێکا ژین
بو کەسە روژا سەرزەمین
بەردو پێشڤه
ئەز دچم و هەرێ چومه.
ئەڤرو وێ تێن
تەڤ دوژمنێ
مروڤانی
امپریالك.
هەر بێ بەشێخانی
ئەز دێ بێم
ژین بومەیه.
مان بوعراقا
سەرکەفتی.
دێ سەرکەڤن
چونکه گەهشت

سەربەستی.
ناڤه گەردت
ناراوەستن.
دێ هەرمینم
چونکه مروڤێ عراقی
ئەز بخومه.. ئەز بخومه.
چاوا خوین خوارێ ژیانێ
بو زێر ڤانێ
بیابانێ.
هاتیه گوتن:
دزو مالخوی مالا مەزن
خوە کرفه ئێك
گا دکولفێراوابرن.
لێ دوستییا
بلەزتێتن
چەند روژەکا
دێ ڤەکێشت
لێ چاوا هات
دێ وەچیتن
باودریاوا
نەیا کومه
هۆ مروڤو
دەستا بدەن هەق
بێژن دوژمن:
ڤێت راوەستی.
هو هو هوڤو.
وەلاتێ مەهند مەزنه
لدور دوژمنی وەك بازنه.
هەر سەرکەفتن
بارا منه
هەر ما بومه.

# بانگێك

«هەڤاڵ أبوبكر هەڵەبجەیی»
پایزی ١٩٩٠ / سلێمانی

کاتێ پرچی هێرۆ شیماو نەکە زاکی،
بەدەستی ئەمریکای‌یەکان..
بن بڕ کرا
ئاسمانیان لێ کرا بەگڕ
بە دووکەڵی بۆمبای ئەتۆم،
گشت لایەکیان لێ قانگ درا
وەکو ڕەوە پەپوولەیەك..،
باران لێی‌دا
لاشەی ئینسان..
گشت ئەکەوتن بەسەریەکدا!..
خوێنێکی زۆر...
ڕژایە سەر پەرەی مێژوو
بەردەکانیش، هاتنە گفتار
نە نەتەوە یەکگرتووەکان،.
نە هێزەکانی ڕۆژ ئاوا...
نە ڕۆژ هەڵات..،
نە هاتنە زار...!
چونکە چاوی پڕ لە قینیان،
ئاسۆی لەلا هەر دۆلارە
چونکە زمانی ڕزیویان،
لەنەوت زیاتر.. گشت چیژێکی
لەلا تاڵە، ژەهرەی مارە..
چونکە گەروی ووشك و کونیان،
تەنها ڕەوگە بۆ نەوت ئەکا
دەستی چەپەڵ و درێژیان،..
بۆ سامانی گەلانی تر..،
بەرەو پێشەوە ڕەوت ئەکا
کێ بوو کانزاو زێرەکانی
پێست ڕە شەکانی تاڵان کرد..؟!
کێ‌بوو خەنجەری تاوانی،
بەناو لاشەی گریناداو
پەنەمادا...،
هێناو ئەبرد؟!
کێ‌بوو نەشتەری ناپاکی
خستە نەخشەی جیهانەوە؟!..،
چەندان دیوارو سنوری
خستە نێو دەوڵەتانەوە؟!..
ئەی لەم هەموو کارانەدا
لەم تاڵانی‌و ستەمکاری‌و
لێزمە بۆمبا بارانەدا، گشت هێزەکانی ڕۆژ ئاوا،
گشت نەتەوە یەکگرتووەکان،..
گشت ڕۆژهەڵات...،
لە پێخەفی شەویاندا بوون؟..،
یا وەك مارێکی ژەهراوی،
لە کیفی مت بوونیاندا بوون...؟!
ئەی بۆ کاتێ زایۆنیزم ،
چەقۆ ئەسوێ
لە جەستەی فەلەستینی‌یەکان
خاوەن زەوی دەربەکات و،
بەبێ شەرم...،
دێتە سەر خاك
نە نەتەوە یەکگرتووەکان،..

نە هێزەکانی رۆژئاوا،..
نە رۆژ هەڵات...،
نایەنە دەنگ..؟!
بۆ لاڵ ئەبن،
لە ئاستی هەموو راستێکاو..
بوگەن ئەکەن..،
وەك ئاوی مەنگ؟..
وا بانگ ئەدەم..
هاوار ئەکەم..
ئەی مرۆڤە هەستدارەکان
خاوەن سۆزی راستەقینە
ئەی گەلە ئاشتی خوازەکان،
دوژمنانی رق و کینە
گوێم بۆ بگرن..
پەیامێکی سپیم پێیە
فرۆکەم کۆتری ئاشتی‌یەو،
ئەگاتە گوێی هەموو کەسێ...
ئەگاتە سەر هەموو جێیە
پەیامەکەم تیا نوسراوە..
ئەم وولاتەی تیایا ئەژیم،
لە ئامێزیدا گەورە بووم
چاوی ناحەز لێی ئەبراوە
مەلی هیواو خواستەکانمان،
چەندان داوی بۆ تەنراوە..
لەبەر ئەوەی، مرۆڤەکانی ئەم خاکە
هەنگاو بەرەو دوژمن نانێن
ئاڵای رەشی نەخش ئێسك..،
لەسەر کەشتی‌و پاپۆرەکانیان
دانانێن..
لەبەر ئەوەی مرۆڤەکانی ئەم خاکە،..
نابنە دار دەست..
نابنە پرد..
رێگا بۆ دوژمن خۆش ناکەن..

لەبەر ئەوەی خاوەن توانان
لەهیچ هێزێکی سەر زەمین..،
سڵ ناکەن و،
رێ چۆڵ ناکەن..
دەسا ئەی هەموو ئینسانێ،
کە ئینسانیەت لە ناختدا..
پەلك و رەگی دا کوتاوە
لە هەر کوێ بێت..،

لەسەر نەخشەی ئەم جیهانە خنکێنراوە
بەهەر چ زمانێك ئەدوێیت و،
دڵت بۆ راستی سووتاوە
وەرە دەنگ و...
دەنگت لەگەڵ دەنگی ئێمەی ئاشتی خوازا..
بکە بەیەك..
تا ئەم جیهانە رزگار کەین..،
لە ناپاکی، لەخەم، لە چەك
تا بۆ دوا جار ریشەی چەکە ئەتۆمەکان
ئامێرە مرۆڤ کوژەکان،..
لەناخەوە دەربهێنین...
تووی ستەم و ئەندێشە،
لەگەڵیدا بسووتێنین...
قەل و داڵە لاك خۆرەکان،
تەرەکەین و
شاباڵەکانیان بشکێنین
تا باڵندە ئاوارەکان..،
کۆترە سپی‌یە نەخشینەکان
چڵە زەیتوون بە دەنوکیان بگرنەوە
بەستەی خۆشی‌و ئاشتی خوازی،
بۆ گشت جیهان...
بڵێنەوە... بڵێنەوە....



# ئاموژگاریەک ژبوش را

«عبدالعزیز خیاط»

هێڤە هێڤە
بەرێ خو بدە ئالێ من ڤە
چ گوتنن
چ بریارن
تێ دوەرینی ژ ریا رێڤە
هویرك هویرك
هزرا خو بکە
هزرا نەکە ب سەرڤە سەرڤە
مەزن دبێژن
«یاتێر ئەوە دمینت دبنڤە»
یاتەدڤێتن
تو نابینی
نە ژدویرو نەژنێزیك ڤە
هێڤە هێڤە
بەرێ خوبدە ئالێ من ڤە
ودسا نینە
کە «بەدیهی»
بێژی نیڤا سێ یا چەندە
یێ دی بێژیت
ئێك و نیڤە
چەند تو هزرەك
مەزن ژخو بکەی
هند ژبەرامبەری خو بکەو هێشتا ویڤە
کەسەك هەڤالێ تەنینە

ژدەڤی پیڤە
نابێژیە من
توگەفا دکەی ب هێڤیا کیڤە..؟

★ ★ ★

هێڤە هێڤە
بەرێ خوبدە ئالێ من ڤە
باودر بکەو
بنەنیاتەکەم
دارو باریت ودلاتێ من
دێ بن برۆت دێ شنکرن
گاردو مەتین
دێ بن ڤولکان دێ ئازرن
ب هەلەگوردو هندرین ڤە
مللەتێ من
لسەر سنورا
هەمی دقەبن هەمی دخورن
ب ژن و مێرڤە
ئەمێلن کو [illegible] ب جهـ بێتن
ویڤە ژکویڤەو.. ویڤە زکویڤە

١٩٩٠/٩/٢٢
دهوك

# شنەی بێ دەنگ

عەلی عارف
١٩٩٠/٤/٣٠

دەپێم بڵێ
بۆ بێدەنگی ...!!
کێ هێندەی من تۆی خۆش دەوێ
کێ تەمەنی دەکاتە مۆم
لەشەوە زەنگ ،
رەهێڵەدا
بەدیار ، رەنگ و تابلۆتەوە
دا ئەگیرسێ .. ؟!
دەپێم بڵێ ..
وا بێدەنگی دەتخواتەوە
من نەمزانی ڕاستیو ..
ئەڤین
لەگەردوونی ژینی تۆیا
چەند ساتێکەو ..
بەهارە ، خەو ئەبیاتەوە
وا من لێرە ..
تەنیایی .. تەنیا هاوەڵە
نامۆییش .. کزە بایەکە
شمشاڵی دووریت ئەژەنێ
دە پێم بڵێ ؟!
سەردەمێکە لە بێدەنگیت ئەخۆمەوەو
نەهەنگی گومان، لوشم ئەدا
وا پێ ئەچێ ..
کۆچێکی کوێر .. لە حاجیاوە
سەرم بکات بەهێلانەی
دەیان ئازاری بێسنوور ..
بۆ بێ دەنگی ..
پێم ئەڵێی ؟!
شەوو ڕۆژی هونەرمەندان
دوورو درێژە ؟
ئێمە کە یەکترمان ناسی
پەیمانمان دا ..
ژیان بکەینە دوورگەیەک
من ووشە بم
تۆ خۆراک بێ ..
هەرگیز خۆر لێی ئاوا نەبێ
ئەوا ئێستا .. وا هەست ئەکەم
چرایەکم و
رەشەبای دوا هەلوێستی تۆ
داگیرسانم ئەخنکێنێ
دەپێم بڵێ ..
هێشوی ووشەی بڕوای لێوت
کەی ئەڕنی ؟
یادگارەکان کڵۆ بەفرن
هێدی .. هێدی
لاشەی ماندووم دا ئەپۆشن
چەقۆی ڕستە کولەکانت
گەرووی خەونە کۆرپەکانە
لەم ساتە پڕ نەهاتەدا
هەڵئەدرێ
دەپێم بڵێ ..
بەتاسەوە
تینوی چرپەیەکی گەشم
بۆنی هەواڵی تۆی لێبێ
بۆ بێ دەنگی
کە بروانامەی جیهانیو
ناو نیشانت بۆ هەڵبەستم
دەرگای هیوات .. بۆ لێگرتم ؟؟!..
دەپێم بڵێ ..
بۆ بێ دەنگی ؟!
چاوەروانی ... مردنێکی
لەسەر خۆیە
ترس و دڕۆش
تا بووتی ئەو
گری هەرگیز نەکراوەیە ..
وا بێ دەنگی ئەتخواتەوە
کەی دەرگای شاری برسیەکان
بە قڵچەکەت
نیگار ئەکەی ؟
دڵنیابە ..
مۆمەکەم ناکوژێتەوە
هەتا تۆ خۆت فوی لێنەکەی
بەس بزانم
کەی تابلۆکەت ..
دەست پێئەکەی ..

ملف خاص

# القضيّة..

تنويه لابدّ منه:

أطلقت هذه القضية على احدى الصحف عصفوراً محلقاً فنتف المحرر ريشه وكسر جناحيه، فانتابني حزن شديد. قرأها صديق فأشار عليّ بان اقامر بها في لعبة الشعر. فان تمرّدت على التفعيلة أو الوزن أو غرقت في بحوره فعذري انني لست شاعرا. وان اذعنت وراق لها اللعب. فالفضل لهذا الصديق اولاً واخيراً.

سعيد يحيى

ها قد اتوا جميعاً
سلالةُ الدمِ الأزرقِ
والجلدِ الأزرقِ
والعينِ الزرقاءْ
أحفادُ اللّوردات والدّوقات والكونتاتْ
أبناءُ الشيوخِ والعجائزْ
أتوا بلا استثناءْ
أتوا بلا ابطاءْ
جميعهُم جاءوا هنا
يستعرضونَ مسرحياتٍ هزيلةْ
أفكارُها هزيلةْ
ديكورُها. تمثيلَها. تلقينُها. اِخراجُها. اكسسواراتُها.
هزيلةْ
جاءوا يقدّمونَ عَرضَهمْ
لعضلاتٍ مفتولةٍ هزيلةْ
جاءوا يُذيعونَ تعليقَ الاذاعاتِ الهزيلةْ
ويُصدرونَ صُحُفاً عميلةْ
يستعرضون كلَّ مايوُهمِهُم
بانهمّ بهذهِ التّفاهةْ
قد يكبُرُون ذرّةً بعيننا
أوقد ينالوا خصلةً واحدةً
من شَعرنا

فهذه.. أسرابٌ من غربانهمْ
وذاكَ اسطولٌ سادسٌ
وسابعٌ.. وعاشرُ
اتوا هنا جميعُهم
لأنهم لبّوا نداءَ صاحبِ الجلالةْ
لأنهمْ..
كالخَدَم المُطيع في آسطبلاتِ صاحبِ الجلالةْ
اتوا هنا لأنهمْ
يُريدونَ الحاكمَ العربيَّ راقِصةً
تهزُ بطنَها على هَواهمْ
يُسَبّح بحَمدهِم..لايَحْمَدُ سِواهمْ
يحملُ في جُيوبهِ السِّواكَ والنَشُوقَ
ومَسبَحةً طويلةْ
يُلقي على الأمّةِ في النّهار
الخطبَ الرّنانةَ الطويلةْ
يدعو الى تحرير يافا والجُولان والجليلْ
يزعَقُ ملأ فمه:
جئناك يا قُدسُ.. وانّا
على ابوابكَ يا جليلْ
يلغو بمفرداتِ اللُّغةِ الثّوريّةْ
وفي المساءْ.. يَغرَقُ في فراشهِ الوثيرْ
يَلْعَنُ جَدَّهُ باللّغةِ العِبريَّةْ
يَعْبَثُ في جَسدِ شقراءٍ صَهيُونيّةْ
تَعْمَلُ في بلادهِ
باسمٍ مستعارِ
لدى رئيس جمعيّتهِ خيريّةْ
يُريدونَ الحاكمَ العربيَّ
مُسَمّراً الى كرسي الخِلافةْ
مُسَمّراً الى مِنضَدةٍ
من آبنُوسٍ أسودٍ.. خشبيّةْ
مُسَمّراً الى سجادةٍ شرقيّةْ
الى زخارفَ ونقوشٍ مغربيّةْ
يريدونه لايَبرَحُ المكانْ

إلّا بأمر الهاتفِ الملّونْ
لايركبُ الحصانْ
إلّا بأمر الهاتفِ الملّونْ
لايأخذُ أوراقَ اعتماداتِ السُّفراءِ
إلّا بأمر الهاتفِ الملّونْ
لايُحْضُر مؤتمراتِ القِمّةِ أو الحضيضِ
أو اجتماعاتِ القبيلةِ
إلّا بأمر الهاتفِ الملّونْ
لايأكلُ، لايشربُ، لايجوعُ، لايَسْمَنُ، لاينَامُ، لايَنهَضُ،
لايَعْطَشُ، لايَشهَقُ، لايَعطَسُ، لايَحْلَمُ، لايسأمُ،
إلّا بأمر الهاتفِ الملونْ
والهاتفُ الملّونْ
خطوُطهُ تفضي الى الأحلافِ العسكرّيةْ
خيوطهُ تمتدُ الى السِفارةْ الأجنبيّةْ
يريدونهُ
متسلّطاً، متعنتاً، متربّصاً، مترمّتاً، متكبّراً، متجبّراً
متأمركاً، متراجعاً، متخاذلاً، متعاوناً، متشائماً..
وزراؤه.. كلٌ الى دويلةٍ ينحازُ أو يَحتمي
كلٌ الى جهاز مخابراتٍ ينتمي
فوزيرُ الخارجيّةْ
يتلقىّ الأمرَ من وزيرِ الخارجيّةْ
والدِفاع من الدِفاعْ
والرّي والتخطيطِ والاعمار والاوقافِ
من وزيرِ الداخليّةْ
دمىً تلعبُ، ومُهرّجون يرقصُونَ
ويضحكونَ ويَشتمُونَ
يَسكتُون ويتحرّكونَ.. بأشارةِ الأيدي الخفيةْ
يريدونه حاكماً.. بألفِ وجهٍ
وجهٌ يستقبلُ رئيسَ دولةٍ آسيويّةْ
ووجهٌ يودّعُ سفيرَ دولةٍ افريقيّةْ
وثالثٌ يَلقى بهِ الرعيّةْ
ورابعٌ، وخامسٌ، وتاسعٌ
يَلبَسهُ صَباحاً

وآخرُ في الليل..
حينَ لقاءِ العاشقةْ المحظيةْ
يريدونه..
مفصّلَ الثياب من جلدِ الرعيةْ
وفردتا نعاله من فروة عبدٍ من عباد الله
تجرّأ يوماً، وصارت عنده قضيّةْ
يريدونه..
أن يأمرَ السيّافَ بقطع رأس كلّ من
كانتْ له قضيّةْ
وليس على وجه الأرض مخلوقٌ او خالقٌ
ليسَ له قضيّةْ
فاللهُ والانسانُ والقمحُ والجرادُ والماءُ والسّماءُ
والبرقُ والسّحابُ والقلقُ المهاجرُ
والرّملُ والبحر والشّطآنُ والحيوانُ
كلٌّ له قضيّةْ
حاكماً
يأمرُ من بيتِ مال المؤمنينَ
مبالغَ ترصّفُ كالأجر على موائد القِمارْ
مبالغَ تُعمّرُ احياءَ مدن الاسفلتِ
والضباب والغباء والجريمةْ
فمرقصٌ هنا، ومبغىً هناك
ومرتعٌ مكيّفٌ مسيّجٌ لخيوله
واخرٌ لكلابه وصقوره
ومبلغا تبنى به أو تُشترى
قصورٌ للحريم والغلمانْ
وجوقةِ الخلاّنْ
ومبلغاً تبنى به خزانةٌ منيعةْ
يحفظ فيها - دامَ ظلّهُ -
خواتمَ مرصعةً، وساعاتٍ ذهبيّةْ
واخرى لجواربه.. وسروج خيله
وعطرٍ وطلاءِ أظافر المحظيهْ
يريدونه
أن يبلغَ الرّصيدُ في المصارف الغربيّةْ
اكبرَ مليارَ مرةٍ
من بيتِ مال المؤمنينَ نفسه
ومن أرصدةِ المصارفِ الوطنيةْ
يريدونَ حاكماً
يقبعُ خلفَ أسواره المنيعةْ
يسجنُ كلّ الشعب في حصونه المنيعةْ
يمنعُ عن أفراده الشمسَ والبحرَ
وألوانَ الطبيعةْ
يهديهُمْ طناً من الكلام الأجوف كلّ ساعةْ
يهبهُمْ سياطَهُ
على اكتافهم في كلّ ساعةْ
الحاكمُ العربيُّ يريدونه
من كان جدّه أو عمهُ او خالهُ
خادماً في دار الحاكم السيّاسي
مرتزقاً عاش على فُتاتِ الحاكمِ السّياسي
أو مخبراً
يُدبّج التقريرَ تلوَ التقريرْ
عن جاره أو داره
عن اخته.. عن أهل بيت عمهِ أو خاله
يرفعه للحاكم السياسي
يريدونَ حاكماً
يستورد السّعالَ والسّلَ والسفلسَ والأيدزَ
يستورد الأدويةَ القديمةْ
يستورد حبوبَ التخدير والتقدير والتبرير
ومُنشّطاتٍ تقودنا الى الهزيمةْ
يمتلكُ جزيرةً جميلةً خلاّبة
في بحرٍ منَ المرجانْ
وقصوراً في الكناري وراس القمر
ومنتجعاتٍ في (نيسَن) و (كانْ)
يريدونه سائحاً..
يصطاف في العواصم الغربيةْ
يمضي الشهورَ والسنينَ والقرونَ كلّها
في المدن الغربيةْ

يكتسح الحاناتِ والباراتْ
وسكنى الداعراتْ
يكتسحُ المطاعمَ الليليةْ
يلبس (شورتاً) عريضةَ البدايةْ
ممزقةَ النهايةْ
وسترةً من دونِ أزرارٍ أو أكمامْ
وفوقَ رأسه، قبعةً عديمةَ الألوانْ
تميل خلف رأسهِ الى أمامْ
يدخّن الحشيشَ أو التبنَ - لافرق -
فصاحبُ النيافة
من سلالةِ الأبقارِ والأغنامْ
يَحمَدَ ماحلةَ اللّهَ للانعامْ
يريدونه..
ان عادَ بأذنهِ تعالى
فانما..
لوضعِ ختمهِ فوقَ ارادةٍ جديدةْ
تُثقل كاهلَ العبادِ بدُفعةٍ جديدةْ
أو ينتقي، أو يشتري عبيدهْ
ويشتري الغلمانَ والخلانَ والجواري
بوجبةٍ جديدةْ
يريدون حاكماً ملحداً وكافرا
يشتمُ الرّحمنَ في سرهِ
ويُكبّرُ بأسمهِ في العَلَنْ
يصادقُ الأبليسَ في سرهِ
ويعوذ من الشيطانِ في العلَنْ
يريدونه..
يعجز عن ترتيبِ جملةٍ عربيةْ
يعجز عن تلاوةِ خطبةٍ عربيةْ
يجهل النُطقَ والكلامْ
والنحوَ والصرفَ والاملاءَ والانشاءْ
يجهل كلَّ حرفٍ من حروفِ الأبجديةْ
يريدونه..
يَبرعُ في العَدِّ وفي الأرقامِ والحسابِ
في الجمعِ وفي الضربِ وفي القتلِ وفي السلبِ وفي النهبِ
وفي الفتكِ بأبناءِ الرعيةْ

★ ★ ★

وأنتَ ياسيدي
لن تدخلَ في خانةٍ من هذهِ الخاناتْ
وانت في حسابهم
لاتملكُ من هذهِ الصّفاتْ
وانتَ في رأيهم
مجّردٌ من صفةِ الزعامةْ
وانت حسبَ حَسّاباتهم
اكبرُ من معنى الزعامةْ
فكيف بفتىً من عبادِ اللّهِ ريفي الجذورِ والانحدارْ
ريفي الرؤيةِ والتفكيرِ واللهجةِ والهمسةِ والنظرةِ
واللفتهِ والجلسةِ
ريفي المشاعرْ
كيف به يكونُ فوقَ مستوى الأقدارْ ؟
يُستقبَلُ من لدنِ العواصمِ العظيمة
يَصحَبهُ الملوكُ والحكّامُ والأخيار؟
كيف لهذا القروي
أن يَرثَ النِفطَ والكبريتَ، أن يورَثَ
بلادَ الشمس والحقولَ والبيادرْ؟
انىَ له التدبير؟ انىَ له التمرير؟
كيف يكون رجلٌ مثلهُ
نِداً لمن ينامُ في الحريرْ؟
برأيهم..
أن تمحوَ ذاكرةَ الثوارْ
تصادرَ البارودةَ، تصادرَ البنادقْ
وتَهدمَ الخنادقْ
وتمسحَ خارطةَ الأرضِ السليبةْ
وتمسحَ الأفكارَ وتُخمدَ الحرائقْ
وحلمَ تحريرِ القدسِ الحبيبةْ
ترسلَ للأطفالِ في الاحتلالْ

سلالَ وردٍ ملونٍ جميلٍ
يرمونه على جنودِ الاحتلالْ
يريدونك..
أن تمسحَ خارطةَ الفقرِ الذي رسمتَه
في الوطنِ المليئِ بالخيرِ وبالمعادنِ العجيبةْ
جاء واهنا..
ليُصدروا قائمةً من الممنوعِ
مالها بدايةْ
قائمةً طويلةً عريضةً
ليست لها نهايةْ
ممنوعٌ أن تقابلَ الأطفالْ
ممنوعٌ أن تحبَّهَم، أو تربتَ على رؤوسهم
ممنوع تصافحَ النساءَ والرجالْ
محظورٌ عليك الوقوفُ لتسمعَ شكوىً أو مظلمةْ
أو تقرأَ الملحمةْ
أن تأكلَ الطعامَ في صحونِ الفقراءْ
أن تزورَ أضرحةَ الأكرمينَ من الشهداءْ
أو تقرأ عليهم سورةَ الرحمنِ
وتدعو لهُمُ من رحمةِ السماءْ
محظور عليك السفرُ
للمدنِ القصيةْ
أو تلبسَ الملابسَ الكرديةْ
أن تصدرَ لشعبك شهادةَ الميلادْ
أو تمنحَ الشهادةَ الصحيةْ
ممنوع، تقابل الشيوخَ والأراملْ
أو تتلقى منهمُ البرقيةْ
محظور عليك العدلُ والحكمةُ والرأفةُ
ممنوع عليك الصدقُ والاحسانُ والوفاءْ
ممنوعٌ.. ممنوعْ
فهذهِ قياساتُ الزعامةْ
وهذه أعلى مراحلِ الشّهامةْ
جاءوا هنا ليُحكموا الحصارْ
ويفرضوا الخنوعَ والأذلالَ والمهانةْ
ليفرضوا الخيانةْ
ويفعلوا الخرابَ والدمارْ
ويمنعوا الدّماغَ عن فكرهِ
ويمنعوا العظمَ عن جلدهِ
ويمنعوا الأشجارْ
أن تنبتَ الفروعَ والجذوعَ والأغصانْ
أو تثمرَ الأثمار
جاءوا لكي يفرغوا وجدانكَ
ويدجنوا أفكاركَ
ويقتلوا أسفاركَ
جاءوا لكي..
يجرّدوكَ من هوى العراقْ
وانت حاشاك أن تَغـَفَلَ العراقْ
أن تقرأ، أن تكتبَ، أن تسمعَ، أن تنظرَ
إلاّ الى العراقْ
فانتَ من مائهِ
وأنتَ من طينهِ
وأنتَ من العراقِ والى العراقْ
اتواهنا..
لامرحباً بمجيئهمْ
لامرحباً بكبيرهم.. لامرحباً بصغيرهمْ
فكلّ جرّاراتهم
هُراءٌ في هراءْ
وكلّ تهديداتهمْ
نِباحٌ وعُواءْ
فانت من بغيتهم، وانت من رميتهم
ابعدُ من..
مسافةِ الأرضِ عنِ السّماءْ

★ ★ ★

آب ١٩٩٠

شعر: مقداد الجبوري..

# الخائبون..

لِمَن الطبولُ تدق في الصحراء
والشجرُ الأليفُ يفزُّ
والآفاقُ سوُدُ؟:
لمن الخنازيُر التي اندَلَقَتْ زَناخَتُها،
على الرمل المقدَّسْ؟
ولأجلِ مَنْ لَبِسَتْ لنا الكاوبوي أمريكا،
وأشْهَرَتِ المُسَدَّسْ؟
لمن الزحام،
لمن تشابكت العساكر والحشود..؟
ولمن ، بأطراف الخليج،
تناثرت فئران «سوهو»،
واليهود
مسحت غبار البوق،
واجتمعت على أطلال خيبر،
كيف، مكة، سرة الدنيا،
تدنس؟
والفتح،
والفرقان،
والصبح العظيم اذا تنفس
ستحطكم أرض الجزيرة
بين برميلين من نفط،
وتشتعل الحدود..
ويصيح بين حشودكم سجّيلها:
من حيث جاء، يعود أبرهة الجديد..

● ●

يا أيها الآتون من خلف البحار..
سنقول : لا
وليعل بينكم الضجيج..
سنقول: لا
ولتجمتع كل الأساطيل اللعينة،
وليطبل من يطبل
من شيوخ النفط،
والخدم الصغار..
فلنا الجزيرة، والخليج..
لن تسلبوا نجداً شميم عرارها،
فمن الخليج،
الى شواطي الاطلسيّ..
له أريج
لن تلبسوا أرض الحجاز القبعة..
ولتشهدالصحراء،
كيف نردكم جثثاً على جثث،
وكيف نرد للفنجان،
هذي الزوبعه..

● ●

يا أيها الآتون من علب الليالي،
والصقيع..
بضفائر النخل الكريم نردكم،
وببسمة الطفل الرضيع..
وبكل ماقد أطلعته الأرض،
من قمح وفاكهة،
وما وعدت به هذي الربوع..
وبماء زمزم، بالصفا، والمحرمين،
نردكم،
ونردكم بالأبجدية،
بالزنود السمر،
بالدم والغضب..

عن كل شبر مغتصب..
في القدس، في الجولان، في يافا الحزينة،
في النقب..
بالرفض، بالشهداء، بالحجر الفلسطيني،
بالبيت العتيق، نردكم،
وبشمس صحراء العرب..
الرمل يرفض، فارحلوا
والماء يرفض، فارحلوا
عودوا الى الغرب،
الذي مالت حوائطه،
وخوض في الرذيلة،
للركب ..
لن تحسنوا معنا التراشق
بالحجارة والبنادق ،
لن تدقوا بيننا وتداً ،
فأنتم في المهب ،
عودوا الى حاناتكم ،
عودوا الى المورفين والويسكي ،
وعودوا للتراشق بالقناني ،
والعلب ..

★★★

لموا حقائبكم ،
وعودوا ..
لموا قنانيكم ،
وعودوا ..
لموا بقايا ما تناثر من بساطيل ،
ومن خرق طواها القيظ ،
حتى لم تعد فزاعة للطير،
لموها ، وعودوا..
لموا بقايا ما تساقط ،
من كؤوس مجندات الليل ،
باروكاتهن ،
عطورهن ،
وآخر الرقصات ،
لموها ، وعودوا ..
وخذوا شيوخ النفط ،
ان شئتم ،
خذوا معهم مواخير التهتك والدجل ..
وخذوا اليخوت ،
خذوا التخوت ،
موائد الكافيار ،

أجنحة القمار
خذوا براميل الترهل ،
والكسل ..
وخذوا رقيق بلادكم معهم ،
وعودوا ..
سيظل يرفض ظلكم ،
هذا التراب ،
وأهله ،
والبيت ،
والأرث المجيد..

★★★

عودوا ،
فقد عصفت بعاد ريح صرصر ..
والليل ، عن صبح على الفلوات،
أسفر ..
خسفت بأوكار الطغاة ،
الارض ـ ثانية ـ
هل آتعظت ثمود ؟
وثمود في فكي رحى ،
لو شبت النيران ،
فهي لها وقود ..
خسئت ثمود..
خسئت ثمود ..

●

بڕوانە ڕەمزی نافیع قوربانی بەزلەکەی
هەولێر مسعود محمد
کاروان ژمارە (٢٢)


ڕەمزی نافیع



# لە ڕۆژ هەڵاتی گڕگرتوودا

# نێردەیەکی سامناک بۆ ڕۆژ هەڵاتی ناوەڕاست ١٩٤٣

نووسینی : گ . ی میوولەر

گۆڕینی لە ئینگلیزییەوە : بەدران ئەحمەد حەبیب ● پێداچوونەوە و پێشەکی و تێبینی : دکتۆر مارف خەزنەدار

**ناوی کتێبەکە بە ئەڵمانی:**
Im Burnning Orient
**ساڵی ١٩٥٩ لە شتووتگارت بڵاو کراوەتەوە.**

**چاپی یەکەمی ئینگلیزی:**
**لە گۆڕینی** Peter McCarthy
**لە ساڵی ١٩٨٠ لە ئەڵمانیا بڵاوکراوەتەوە.**

● بەشی یەکەم ●

## مرۆڤی مەرد و نەبەرد

دوکتۆر مارف خەزنەدار
ماموٚستای بەشی زمانی کوردی
کۆلێجی ئەدەبیات ـ زانستگای سەلاحەدین

### سڤاستیکا و تاریکی و جەنگ

لە سەرەتای جەنگی دووەمی گێتی‌یەوە ئەڵمان سستی بە خۆیەوە نەدی و لە سەرکەوتن دا بوو، نازی لە لووتکەی بەرزی و لە خۆباییی دا بوو، مەستی ئەو دووا ڕۆژە بوو کە بە خەیاڵ هەموو نیشتمان و نەتەوەکانی سەر زەوی یەک خست بوو و کرد بووی بە یەک وولات ویەک نەتەوە و نەژادی جەرمەنی ئەو دەوڵەتە گێتی‌یەی بەڕێوە دەبرد. لە ساڵانی سەرەتای جەنگ دا سڤاستیکای ئەڵمانیای فاشیست تەنیا دروشمی دەوڵەتی نازی نەبوو، بەڵکو بووە نیشانەی زۆر داری لە لای هەموو مرۆڤایەتی‌ی ووشیارەوە، بوو بە بەڵگەی زوڵم و کارەسات و تاوان، بوو بە ڕەمزی بێ بەزەیی و نامەردی، بوو بە وێنەی هێزی تاریکی.

لە کۆتایی ساڵی ١٩٤٢ و سەرەتای ساڵی ١٩٤٣، لەو ماوەیەدا وێنەی مەترسی شکانی ئەڵمانیای نازی و پارچە بوونی لە پێش چاوی‌دا وەك ڕەنگدانەوەی ناڵەی سەرەمەرگی دێوی ڕەش لە گۆمی شڵەقاو دا وابوو، بەڵام ئەڵمان کۆڵی نەدەدا و سوور بوو لە سەر بەردەوامی جەنگ. کەم بوونی سووتەمەنی بە تایبەتی نەوت (پیترۆل) بووە هۆی ئەوەی لقێکی بچووکی خەفیەیی بیر لە دانانی کردەوەێیك بکاتەوە بە ناوی «کردەوەی مامۆنت»، بۆ ئەوەی ئەڵمانەکان بتوانن چاڵەکانی نەوتی کەرکووك و موصڵ بخەنە ژێر دەسەڵاتی خۆیانەوە. بێ گومان دەبوو ئەم کارە بە یارمەتی‌ی کورد بگاتە ئەنجام، کە کوردیش بیکا دەبوو پاداشی بدرێتێ لەو دەوڵەتە گێتی‌یەی کە لە کۆتایی جەنگ دا ئەڵمان دروستی دەکرد!

بەڵام لای ئێمە و لای ئەوان، لە وولات و هەندەران چی باس بوو؟

## لای ئیمە چی باس بوو

لە پاش جەنگی یەکەمی گێتییەوە. بە تایبەتی لە کوردستانی عیراق دا سێ ڕێزەو و بیروباوەڕی سیاسی و ئیدیۆلۆجی لە ناوەوە بوو، بە زۆریش ڕووکەش بوو و لە ناخی تێگەیشتنەوە هەڵنەقوڵا بوو:

١ ـ ئەوانەی سەر بە ئینگلیز بوون و زۆر بەشیان پێوەندی‌یان پێیانەوە هەبوو.

٢ ـ ئەوانەی خۆیان بە لایەنگری ئەڵمان دەزانی و شانازی‌یان بەوە دەکرد کە نازی‌یان پێ بڵێن، بەڵام هیچ پێوەندی‌یێکیشیان بە ئەڵمانەوە نەبوو.

٣ ـ ئەوانەی تورکچییەتی‌یان دەکرد، ئەمانە بوو بوون بە دوو بەشەوە، بەشێکیان بۆ دەسەڵاتی عوسمانی دەگریان و دەیان لاواندەوە، بەشەکەی تریان خۆیان سەر بە توورکیای مستەفا کەمال و لاتینی دەزانی؛ لە ڕووی بیر و باوەڕی ئیدیۆلۆجیشەوە ئەمانە مەیلیان زیاتر بۆ نازی هەبوو، چونکە عوسمانی و تورکی پاش عوسمانیش لەگەڵ ئینگلیزا ڕێك نەبوون[١].

هەموو ئەم خەڵکانەش تورکچییەکان نەبێ واتە سەر بە ئینگلیز و لایەنگری ئەڵمان بیروڕایان هەرچی بووبێ لە چووار چێوەی «کوردایەتی» نەچووبوونە دەرەوە، هەموو شتێك بە لای ئەوانەوە دەبوو لە پێناوی چاکەی کورد بێ. بێ گومان پارتی هیوا قاووغێکی پڕ بە پێستی بوو بۆ پاراستنی ئەم ڕێزەو و ئیدیۆلۆجی‌یەتانە لە ناو ڕیزەکانی‌دا[٢].

یەکێتی‌ی ئیدیۆلۆجی لە ناو ئەندامانی پارتی هیوا نەبوو، ڕەنگە ئەمەیان بە خەوش بۆ دانابێ، جگە لەمە خەوشێکی تریشیان بۆ دۆزیوەتەوە، بەوەی کە دەڵێن پارتی‌یێکی بۆرجوازی بوو.

نە یەکەم و نە دووەم هیچ یەکێکیان خەوش نین. یەکێتی‌ی ئیدیۆلۆجی‌ی نەتەوایەتی تێدا هەبوو، بەڵام هەستێ ئیدیۆلۆجی‌ی چینایەتی تێدا نەبوو. هەرچی بۆرجوازیشە هەمیشە خراپ نی‌یە، هەمیشە دوواکەوتوو نی‌یە، پارتی هیوا شانازی‌ی کوردە، لە سەردەمێکی پاش جەنگی یەکەمی گێتی پێویستی‌یێکی مێژوویی ئاڵای کوردایەتی دایە دەستی و لاوی خوێندەواری کوردی لە دەوری خۆی کۆکردەوە و فێری نیشتمانپەروەری کردن و ڕێگەی خۆش کرد بۆ پەیدا بوونی ڕێکخراو و پارتی تر لە کۆمەڵی کوردەواری‌دا لە دووا ساڵانی جەنگ و پاش جەنگ. ئەوانەی ڕۆژێ لە ڕۆژان لە پارتی هیوا بووبن جێگەی ڕێز گرتنن.

## لای ئەوان چی باس بوو

لە ئەوروپا سێ بیروڕا و ئیدیۆلۆجیەتی سەرەکی لە ناوەوە بوو، ئەمانە بوو بوون بە هێز و لە دەسەڵاتی دەوڵەت دا ڕەنگیان دابووەوە:

١ ـ دەوڵەتە بورجوازی‌یە دیموکراتی‌یە لیبرالی‌یە پێشکەوتووەکانی ئەوروپای ناوەڕاست و ڕۆژئاوا (بەریتانیا، فەرەنسا) لەگەڵ وولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا.

٢ ـ دەوڵەتە بۆرجوازی‌یە نازی ـ فاشستە میلیتاری‌یەکانی ئەوروپای ناوەڕاست و خووارووو (ئەڵمانیا، ئیتالیا..).

٣ ـ دەوڵەتی سۆسیالیستی سۆڤیەت کە لە سەر بنچینەی مارکسیزم دروست بوو بوو و باوەڕی بە کۆمۆنیزم هەبوو.

ئەم ئیدیۆلۆجی‌یەتانە بوو بوونە هۆی بگرەوبەردە و خەبات و زۆرانبازی و چوونە مەیدان بە شێوەیێکی گەلێك تیژ لە نێوان ڕێزەوەکانی «دیموکراتی ـ لیبرالی» و «نازی ـ فاشیزم» و «مارکسیزم ـ کۆمۆنیزم». ئەم دیاردەیە دەبوو بە جەنگ ئەنجام پێ بدرێ، بە تایبەتی بە بیرو باوەڕی ئەڵمانیای فاشستی، هەوری ڕەش لە و ڕۆژەوە باڵی بە سەر هەموو ئەڵمانیادا کێشا، کە هیتلەر دەسەڵاتی گرتە دەست و بوو بە کەنسلەر (موستەشار) (١٩٣٣)، ئینجا لە پاش مردنی هیندنبورگ بوو بە دیکتاتۆر (١٩٣٤).

هیتلەر ڕژێمێکی میلیتاری ـ فاشستی (عەسکەریتاری، تۆتالیتاری) بە ناوی سڤیلیزاسیۆنی نەژادی جەرمەنی دامەزراند بە هیوای ئەوەی هەموو گێتی داگیر بکا. بەرنامە و پیلانەکانی بۆ ئەم ئامانجە پتەو و ژیرانە بوو، ڕاوێژکەرەکانی شارەزا و بلیمەت بوون، لە سەرەتادا توانی هەندێ کەس بخەڵەتێنێ بە تایبەتی دوژمنی هەرە گەورەی ڕووسی سۆسیالیست، بۆ ئەم ئامانجە پەیمانی لەگەڵ دا بەست بۆ ئەوەی دوژمنە بچووکەکەی (دەوڵەتە پێشکەوتووە بۆرجوازی‌یەکانی ڕۆژئاوای ئەوروپا) لە پێشانا لە ناو ببا، ئینجا بگەڕێتەوە سەر دوژمنە گەورەکە: نوێنەری کۆمۆنیزم (یەکێتی‌ی سۆڤیەت).

نامەی گۆتفرید میولەر بۆ مارف خەزنەدار لە بابەت گۆڕینی ئەم کتێبەوە بۆ زمانی کوردی

Gottfried Müller

06. Mai 1988 M/h

Dear Prof. Dr. Marouf Khaznadar!

Thank you for your letter and your offer to translate my book "In the burning orient", so that it could and would become printed and published in the Irak.

Please, let me know, how much you would charge for the translation and how much the printing would cost!

The problem of the kurdish people is more and more in need to be solved and I would be glad, if I could act as a neutral man, friendly the the Arabs as well/ as/to the kurdish and iranian people.

The peace is from day to day more necessary, So I created 30 years ago the social organisation with the arabic name SALEM. If you are interested in literatures about this Salem-Organisation, please let me know.

Sincerely

Gottfried Müller

Gottfried Müller

## گوریس کێشانێ

جموجوڵی دیبلۆماسی، سیاسی و کردەوەکانی ئەڵمان بە تایبەتی لە ساڵی ١٩٣٩ بۆنی جەنگیان لێ دەهات، هەموو شتێك ئاواز و دەنگی جەنگ بوو، پێش ئەوەی بە رەسمی جاری جەنگ بدرێ (١ی ئەیلولی ١٩٣٩) لە لایەن ئەڵمانەوە، رووداوە هەرە گرنگەکانی پێش جەنگ گەلێ شتی نهێنیمان بۆ روون دەکەنەوە:

★ لە ١٥ی مارت هیتلەر چیکۆسلۆڤاکیای داگیر کرد.
★ لە ٧ی نیسان مۆسۆلینی ئەلبانیای داگیر کرد.
★ لە ١٢ی مایس پەیمانێك لە نێوان بەریتانیا و تورکیا بەسترا.
★ لە ٢٢ی مایس پەیمانێکی**عەسکەری** لە نێوان ئەڵمانیاو ئیتالیا بەسترا (هیتلەر - مۆسۆلینی).
★ لە ٢٣ی ئاغستۆس پەیمانێك لە نێوان ئەڵمانیا وسۆڤیەت بەسترا (هیتلەر - ستالین).

لە پاش مۆر کردنی پەیمانی ئەڵەمان و سۆڤیەت بە ١٠ رۆژ جەنگ دەستی پێ کرد بە هێرشی هیتلەر بۆ سەر پۆلۆنیا؛ لە پاش دوو رۆژ (٣ی ئەیلولی ١٩٣٩) بەریتانیا و فرەنسا جاری جەنگیان دا لە دژی ئەڵمانیا.

بەم جۆرە جەنگ کەوتە نێوان بەرەی دیکتاتۆری - فاشیزم و بەرەی لیبیرالی، دیموکراتی، بۆرجوزای، بێ گومان بەرەی سۆڤیەتی مارکسی، سۆسیالیست خۆشی خۆشی بوو، سەیری جەنگی نێوان هەردوو دوژمنی دەکرد! ئاگرە سوورە لە خۆم دوورە!

بەڵام ئاخۆ دەبێ لەو رۆژەدا ئەم بەرەیە بیریان نەکردبێتەوە کە ئەوان دوژمنی راستەقینەی هیتلەرن؟! چار نییە دەبێ ئەوانیش بەرکەون چونکە هەر لە بنچ دا جەنگەکە بۆ لە ناوبردنی ئەوان پێش خەڵکی تر دامەزرێنرا بوو. وا بوو هێشتا دوو ساڵ بە سەر جەنگ دا تێپەری نەکردبوو هیتلەر «کردەوەی باربارۆس»ی خستە کار و لە ٢٢ی حوزەیرانی ١٩٤١ هێرشی بردە سەر رووسیا و هەموو وولاتی سۆڤیەت.

## یەك دیاردە، ناوی زۆر

جەنگی دووەمی گێتی، جەنگی ئەمپریالیستی، جەنگی نیشتمانیی مەزن، جەنگی رزگار کردنی مرۆڤایەتی. ئەمانە هەموویان ناوی جەنگەکە بوون، هەر یەکەیان لە دەستە و دایەرەیێکەوە دەنگ و ئاوازیان بڵاو دەبووەوە.

سۆڤیەتەکان «جەنگی ئەمپریالیستی» یان بە «جەنگی دووەمی گێتی» دەووت، لە سەرەتای دەست پێکردنیەوە تا رۆژی هێرشی هیتلەر بۆ سەر خاك و نەتەوەکانیان، ناویشی هەر وا مایەوە لە ئەدەبیاتیان دا، بەڵام پاش «کردەوەی باربارۆس» ناوی نرا «جەنگی نیشتمانیی مەزن» (١٩٤١-١٩٤٥). هەرچی ئەڵمانیای هیتلەریش بوو جەنگەکەی بە جەنگی رزگار کردنی مرۆڤایەتی لە قەڵەم دەدا، بە مانای ئەوەی جوگرافیا دەبێ بە ئەڵمانیا، مرۆڤ دەبێ بە ئەڵمان، پایتەخت دەبێ بە بەرلین. بەڵام پاش بوو ئەڵمانیا خۆی لەت کرا.

ئەنجامی جەنگ ئەوەی ئاشکرا کرد کە مرۆڤی ژیر دەیتوانی بیر لەوە بکاتەوە کە رۆژێ لە رۆژان ئینگلیز و ئەمریکی و فرەنسی ورووس دەچنە ناو بەرلینەوە، چارەنووسیش هەر ئەمە بوو، بەڵام نەیدەتوانی بیر لەوە بکاتەوە کە رۆژێ لە رۆژان ئینگلیز و ئەمەریکی و فرەنسی و ئەڵمان دەچنە ناو مۆسکۆوە، چونکە سۆسیالیزم و کاپیتالیزمی لیبیرالی دەتوانن پێکەوە هەڵبکەن و دەبێ پێکەوەش بژین، بەڵام فاشیزم لەگەڵ هیچ یەکێکیان هەڵی نەدەکرد.

## گۆتفرید یۆهانیس میوللەر

گۆتفرید یۆهانیس میوللەر ئەفسەرێکی ئەڵمان بوو، هۆگری ئایین بوو، باوەری گاووری دڵ و دەروونی داگیر کردبوو، لە هەموو تەنگانەیێك دا دەستی پارانەوەی بەرز دەکردەوە و موناجاتی لەگەڵ خودادا دەکرد و یارمەتیی لێ دەخواست. میوللەر نازی نەبوو، بەڵام بۆ چاکەی ئەڵمانیا سڵی لە هیچ شتێك نە دەکردەوە و دەچووە ناو هەموو تەنگانەیێکەوە.

میوللەر لە پێش جەنگی دووەمەوە مەیلێکی زۆری بووە بۆ بینینی زەویە پیرۆزەکان (فەلەستین) و شارە ئەفسانەییەکە (بەغداد) و هەرێمە رەنگینەکان (کوردستان)، هەر بۆ ئەم ئامانجە کە هێشتا لاوێکی تازە پێ گەیشتوو بووە بە پایسکل گەشتی ئەو ناوچە دڵگیرانەی کردووە. لە پاش گەرانەوەی بۆ نیشتمانی خۆی لە ساڵی ١٩٣٧ **کتێبێکی بە ئەڵمانی** بە ناوی «**خۆ کوتانە ناو کوردستانی داخراو**»[٢] **وە بڵاو کردەوە.**

**میوللەر ناوچەکانی کوردستانی عێراق گەرا بوو، پێوەندیی لەگەڵ** گەورەی کورد شێخ مەحموود پەیدا کردبوو، **خۆشەویستیی بێ‌ئەندازەی** بەرامبەر بە کورد و لە نزیکەوە ناسینی **کورد و وولاتەکەیان، ئەمە هەمووی** بووە هۆی ئەوەی ببێتە **پسپۆری راوێژکەری مەسەلەی کورد لە لای** دەسەلاتی ئەڵمان. بۆیە لە ماوەی جەنگی دووەم دا کرابووە بەرێوەبەری یەکێ لە مەڵبەندی خەفیەیی ئەڵمان لە شاری ئەستەمووڵ.

لە ساڵی ١٩٤٢ کە ئەو مەڵبەندەی بەرێوە دەبرد لە **ئەستەمووڵ، لە** یەکێ لە گەرانەوە و سەردانەکانی ئەڵمانیای ئەوەی زانی بوو کە کەمی سووتەمەنی (پیترۆڵ) تەنگوچەڵەمە بۆ سوپای ئەڵمانیا دروست دەکا، لە بەر ئەوە پێشنیاری بۆ فیلد مارشال کایتل فەرمانبەری سوپای ئەو سەردەمە و سەرۆکی گشتیی هێزە چەکدارەکانی ئەڵمانیا کرد بوو کە هەوڵ بدرێ بیرەکانی نەوتی عێراق داگیر بکرێ و ئینگلیزی لێ دەر بکرێ. بۆ هێنانە دی ئەم ئامانجە پێویستیی بە کوردێك دەبێ وەشاوە بێ بۆ ئەوەی ئەم ئاواتە لەگەڵ ئەودا بگەیێنێتە ئەنجام.

## رەمزی نافیع رەشید

رەمزی نافیع رەشید لە ساڵی ١٩١٧ لە هەولێر لە دایك بووە. لە کۆشی دایك و باوکێکی دەوڵەمەند و دەست رۆیشتوو و تێر پەروەردە کراوە.

قوتابخانەی سەرەتایی‌و ناوەندی لە هەولێر تەواو کردووە، ئیتر لەبەر نەبوونی قوتابخانەی ئامادەیی لە هەولێر، رووی‌کردۆتە کەرکووك و ساڵێکی خوێندنی لەوێ بردۆتە سەر، لە بابەت هەڵس وکەوتی رەمزی لەو ماوەیەی کە لە کەرکووك بووە، هاوڕێی بەڕێزم دوکتۆر موکەررەم تاڵەبانی پێی ووتم :(( لە پێش حەرەکاتی رەشید عالی رەمزی لە کەوکووك بوو، لەو کاتەدا ئەندامی پارتی هیوا بوو ، لە قوتابخانە زوو زوو یەکتریمان دەدی. رەمزی کوڕێکی باش بوو، کوردایەتی دەکرد، زۆر لە کەرکووك نەمایەوە و دەرچوو. لە پاشانا کە لەگەڵ ئەڵمانەکانا رێك کەوت ، پارتی هیوا ئاگاداری ئەو پێوەندی‌یە نەبوو ، چونکە ئەڵمانەکان بۆ مەبەستی دەست تێوەردان لە مەسەلەی کورد پێوەندی‌یان لەگەڵ پارتی هیوا نەبەستووە))[4].

لە کەرکووکەوە هەر بۆ ئامانجی تەواوکردنی خوێندن دەچێتە بەغداو ساڵی خوێندنی ١٩٣٧ـ١٩٣٨ لە پۆلی پێنجەمی زانستی (عیلمی) بووە لە قوتابخانەی ئامادەیی ناوندی (الاعدادية المركزية) ی بەغدا.

لە ساڵی ١٩٣٩ روو دەکاتە بێرووت لە زانستگای ئەمەریکی دادەمەزرێ، دوو ساڵی خوێندن لەوێ تەواو دەکا و پلەی «فرێشمان» وەردەگرێ. لە پاشانا هەر بۆ تەواو کردنی خوێندن دەچێتە ئەستەموول و دەبێ بەقوتابی‌ی کۆلیجی رۆبەرت (رۆبەرت کۆلێج). لە ساڵی ١٩٤٢ کە رەمزی لە ئەستەمبووڵ دەبێ بە تایبەتی لەنیوەی دووەمی ئەو ساڵە ئیتر گۆتفرید میوللەر خەریکی دەبێ بۆ خۆ ئامادە کردن لە پێناوی هێنانە دی «کردەوەی مامۆنت». بەم جۆرە رەمزی لەگەڵ میوڵلەرو تاقمەکەی کە دوو کەسی تریش بوون روو دەکەنە ئەڵمانیا و لە بەرلین خەریکی مەشق کردن دەبن.

پێوەندی‌ی میوللەر و رەمزی لە چوار چێوەی یەکتری ناسین دەچێتە دەرەوە و دەبێ بە دۆستایەتی، ئنجا هاوڕێیەتی و برادەری، لەوەش رەت دەکا بۆ برایەتی و تا دەگاتە رادەی خۆشەویستی، هەر لە بەر ئەوەشە تا ئێستا یادی رۆژانی میوللەر لەگەڵ رەمزی یادگارێکی بەنرخ و بێ وێنەیە لە لای، وەکو لە سەرانسەری گێرانەوەکانی‌دا دەردەکەوێ.

لە هاوینی سالی ١٩٤٣ تیپە چووارکەسی‌یەکەی «کردەوەی مامۆنت» بە شەو خۆیان لە پەراشووت دەهاوێنە خوارێ، لە ناوچەیێکی سێ گۆشەی سنووری عیراق ـ تورکی ـ سووری لای رۆژهەڵاتی رووباری دیجلە دەکەونە سەر زەوی. لە ویوە بە قاچاغی و بە سوواری پاسە تەختەکانی ئەو سەردەمە و وولاغ و کاروان دەگەنە مووسل بەرێی نینەوا (یوونس پێغەمبەر)، ئینجا قایەغی گوێر و لە پاشانا هەولێر، لەوێوە بەرەو ژوور لە گوندی بیۆکە دەنیشنەوە. ئەڵمانەکان دەگیرێن و رەمزیش لە هەولێر خۆی دەدا بە دەستەوە.

لە گرتووخانەی هەولێرەوە دەبرێ بۆ مووسڵ، لەوێوە بۆ بەغدا، ئینجا بۆ قاهیرە و دووبارە دەیهێننەوە بەغدا. لە ساڵی ١٩٤٥ لەگەڵ کۆتایی جەنگ دەدرێ بە دادگای عورف و بریاری لە سێدارەدانی بۆ دەردەچێ، لە پاشانا بریارەکە دەکرێ بە هەتا هەتایە (٢٠ ساڵ)، لە بەندیخانەی ناوەندی بەغدا و لە قەلعەی دووەم بەند دەکرێ.

زۆری پێ ناچی بریاری ئازاد کردنی دەردەچێ بە هۆی راپۆرتێکی پزیشکی «لە بەر تووش بوونی بە نەخۆشی‌یێکی کوشندە». بە راستیش رەمزی لە ژێر زەبری کارەسات و ئەشکەنجە و دەردی دەروونی مێشکی سووك بوو بوو و تێك چوو بوو، هەر لەبەر ئەوەش بوو لە پاش دەرچوونی لە بەندیخانە لە ساڵی ١٩٤٧ لە هەولێر سەری نایەوە هەتا هەتایە پاش ئەوەی ئەفسانەیێکی لە دووای خۆی بەجێ هێشت بۆ نەتەوەکەی.

## کردەوەی مامۆنت

تیپی بە ئەنجام گەیاندنی «کردەوەی مامۆنت» لە چووار کەس پێك هات بوو. سەرۆك و بەرێوە بەریان میوللەر بوو، دوو کەسی تریشی لەگەڵا بوو، یەکەمیان هۆفمان ناوێك بوو، ئەمەیان نازی بوو، ئاگاداری رۆژهەلاتناسی بوو، چونکە بۆ ماوەیێك مامۆستا بووە لە زانستگای تاران. دووەمیان کۆنێچین یا (کانێچین) لەبنجدا بە نەژاد پۆلۆنی بووە. چووارەمی تیپەکە رەمزی بوو، ئەمە دەمراست و رێبەریان بووە چونکە کوڕی هەرێمەکە بووە و بەبێ ئەو کار و کردەوەیان نەدەچووە سەر.

لە پاش مەشقی پراکتیکی لە خۆ فرەدان بە پەراشووت و سیلاح شۆری و فێر بوونی دەستوور رە بنچینەیەکانی خەفیەیی لە شاری بەرلین و هەرێمەکانی سینگەربێرگ و بۆدینتەل و وینەرینوشتادت ئامادەی بەجێ هێنانی «کردەوەی» مامۆنت» دەبن، پێویستە ئەوەش بۆ راستی بووترێ کە پیلانەکەیان لە بنجدا بە جۆرێك رێك دەخەن کە لە بەهارا دەست پێ بکەن، بەلام دووا دەکەوون و بە سەر ترسی گەرما زال نابن و کردەوەکەیان دەکەوێتە هاوین، دیارە ئەمەش گەلێ تەنگو چەڵەمەی لاوەکی‌یان بۆ دروست دەکا.

ساعەتی سفریان لەو کاتەدا دەست پێ دەکا کە یەکێ لە فرۆکەکانی «کۆندۆر» دەکەوێتە ئاسمانەوە. بە سەر قرم و زەریای رەش خۆی دەکوتێتە ناوچەکانی سەرووی کوردستانەوە، لەنجەیێکیش بە سەر شاری مووسڵ دا دەکا، گلۆپە زۆرەکانی شار کە بەڵگەی گەورەیی شارەکە بوو سەریان لێ دەشێوێنێ و میوللەر هەست دەکا کە ئاسمانەکە ئاسمانی ئەو جێ‌یە نی‌یە کە پێویستە خۆیان بە پەراشووت فرێ بدەنە **خوارەوە** ، بۆیە دەکەوێتە گومانەوە. مەنزڵی خۆ فرێدان بە پەراشووت دەشتی بیتوێن دەبێ، چونکە نزیکترە و بە ئاسانیش دەتووانن بگەنە هەولێر، بەلام فرۆکەوان جێ‌یێکی تریان بۆ دەست نیشان دەکا و بە بیتوێنی دەزانن، هەر چووار ئەندامانی تیپەکە و کەلوپەلیان کە لە ناو باووڵ بووە بە پەراشووت دێنە خووارەوە بۆ سەر زەوی. هێشتا بە ئاسمانەوە هەڵواسرا بوون و نەگەیشتبوونە سەر ئەرز لەو کاتەی کە میوللەر لە ژێرەوە چاوی بە رووبارێکی گەورە (دیجلە) دەکەوێ گومانەکەی لێ دەبێ بە راست و دەگاتە ئەوەی کە هەڵەیێك رووی داوە، ئەمە و کە چاویشی بە رووباری خووارەوە دەکەوێ مەترسی‌یێکی تریشی بۆ پەیدا دەبێ خوانە خواستە لە باتی سەر زەوی بکەونە ناو ئاوەوە، رەنگە خۆیان بە مەلە رزگاری‌یان ببێ

بەڵام ئەگەر کەلوپەلەکانیان لە ناو ئاو نیشتبەوە!

ئەو ناوچەیەی کە لێی کەوتنە سەر زەوی «فلفیل»ی پێ دەڵێن، کەوتۆتە ناو سێگۆشــەی سنــووری عیراقی، تورکی، سووری لای ڕۆژ هەڵاتی رووباری دیجلە. بە پێی جلوبەرگی دەشتەکییانی ئەوێ کە زۆربەیان تەیاری بوون ناوچەکە دەناسنەوە، ئیتر بە پاسە تەختەکانی دەوروبەری جەنگ خۆیان دەگەیێننە نزیک مووسڵ، دیوی نینەوا (یوونس پێغەمبەر) رەمزی دەبوو لە رووبار بپەڕێتەوە بۆ ناو شار و هانا بەرێتە بەر یەکێ لە خزمەکانی باوکی لە مووسڵ، لە بەر ئەوەی پشکنینەوەیێکی زۆر لە سەر پردی مووسڵ هەبوو تاقمەکە لە چایخانەیێک بەجێ دێڵێ و خۆی دەچێتە ماڵی جەلال یاوەر (لە حەفتــاکــانـا مردووە) کە کوری خەزووری باوکی رەمزی بووە[5]. بەڵام رەمزی بە نا ئومێدی دەگەڕێتەوە لای هاوڕێکانی و دەڵێ خزمــەکــانی هیچیــان بۆ ناکرێ، هەر لەوانیشەوە ئەوە دەزانێ کە مەسەلەکەیان لە ناو خەڵکی ئاشکرا بووە و میری و ئینگلیز بە دوویانا دەگەرێن[6].

زوو بە زوو ئەو ێ بەجێ دێڵن بەرەو رۆژهەڵاتی مووسڵ، واتە رووە و هەولێر بە رێگەی «وادی شۆر» کە ناوچەیێکی قامیشەلآن و پر لە دار و دەوەن بووە دەچنــە گونــدی «بازیوە»، ئەمە گوندی شەبەکەکانە. لەوێ پیرەمێردێك رەمزی دەناسێتەوە بە هۆی ناوبانگی باوکیەوە، بۆیە رێزیان لێ دەنێ و میوانداریان دەکا. بەم جۆرە بۆ مەبەسی رزگار کردنیان لە سەر داوای نیپەکە و بە کیسەی ئەوان چەند ئێسترێك بەکرێ دەگرێ ماوەیێك لەگــەڵیــان دەروا، لەبــەر مانــدوویی کە دەگەنە لای کەندەلانێك لەوێ دەحــەسێنەوە و خەویان لێ دەکەوێ، ئیتر کابرای شەبەك ئەمە بە هەل دەزانێ، گەشتــەکەیان پێ تەواو ناکا و بە جێیان دەهێڵێ، بەڵام لەگەڵ ئەوەیش دا ئەندامانی تاقمەکە ئەم کردەوەیە بە کارێکی خراپ حسێب ناکــەن چونکــە هیچ زیانێکی پێ نەگەیاندن لەو کاتەی کە دەیتوانی بە گرتنیان بدا.

تاقمەکە بە تەنیا دەکەونە رێ و لە نزیك کەلەکی یاسین ئاغا لە رێ لا دەدەن بەرەوخوار بۆ لای قایەغەکەی گوێر. بە قایەغ لە زێی بادینان (زێی گەورە= زێی کەلەکی یاسین ئاغا) دەپەرنەوە دیوی هەولێر، ئێوارە وەختێك دەگەنە گوندی تەرجان، ئەمە گوندی ماڵی رەمزی بوو! ئەگەر چی تا دەهات مەترسییان زیاتر دەبوو، بە تایبەتی کە لە شار و ئاوەدانی نزیك دەبوونەوە، بەڵام بە هۆی خەڵکی ئەو ناوچانە کە ناسیاو بوون بزووتنەوە و کاری خۆ رزگار کردنیان ئاسانتر دەبوو. بە هۆی ئەو ناسیاوانەوە تیپەکە بە سوواری وولاغ دەگــەنە هەولێر و روو دەکەنە ماڵی عەتائوڵلا ئاغا[7]. لەوێ میــوللەر و تیپــەکــەی چاویان بە نافیع ئاغا ناکەوێ، لە باتی ئەو قەرەنی نافیع (١٩١٢ ـ ١٩٦٩)ی براگەورەی رەمزی، هەموو شتێك لە میوللەر دەگەیێنێ: ئەندامانی تیپەکە لە تەك یەکەوە وەستا بوون، رەمزی دەستی رێــزی: خستبــووە سەر سنگی، سوعاد نافیع «١٩٢٩» ی برا بچــووکی و حاجی عەلی قاوەچی[8] بزێو بوون هەڵس وکەوتیان ئەوەی دەردەخست کە لایەنگری ئەڵمانن، ئیتر قەرەنی بە ناوی باوکییەوە دەڵێ: ئێمە هیچمان پێ ناکرێ بۆ ئێوە، باب و باپیرانمان بە ناحەزی ئینگلیز لە قەڵەم دراوون، گەلێ زیــانمــان لێ کەوتووە لەم رووەوە، ئیتر ئێوە خۆتان چارەسەری خۆتان بکەن، چونکە ئێمە هیچمان بۆ ناکرێ.

بەڵام رەمزیی مەردانە پشتیان تێ ناکا چونکە بە راستی چارەنووسی خۆی بە چارەنــووسی ئەوانــەوە بەستبــووەوە، ئیتــر لە بەر ئەوەی ئەو ئامــانجەی بۆی هات بوون لەم هەڵویستەدا زیندەبە چاڵ کرا، پیلانی میــوللەر ئەوە بوو یەکێ لە ئەنــدامــانی تیپەکە بگەیێننە سەر سنووری تورکیا، لەوێ خۆی بدا بە دەستەوە و بگیرێ و بخرێتە گرتووخانەوە، بەم رنگە دەتووانن بە هۆی دەسەڵاتی تورکەوە قونسوڵی ئەڵمان لەوێ ئاگادار بکەن، بەمە پێوەندی لەگەڵ دەوڵەتەکەیان پەیدا دەکەنەوە. بۆ هێنانە دی ئەم ئامانجە و بەهۆی رەمزییەوە لە هەولێر دەردەچن بۆ گوندی **بێوکە**ی نوورەدین ئاغای مامی رەمزی. لێرە خورشید نوورەدین (١٩١٧ ـ ١٩٨٧) ئامــۆزا و هاوڕێی رەمزی یارمەتیان دەدا. ئیتر بۆ مەبەستی گەیشتنە سەر سنووری تورکیا لەگەڵ قاچاغچیان رێك دەکەون کە بیانگەیێننە سەر سنوور. بەم جۆرە لە پاش سەفەری هەولێریان قاچاغچییەکان دەگەرێنەوە گوندی بێوکە و رەهێبەرییان دەکەن تا سنووری تورکیا. رەنگە هەڵەی هەرە گەورەی میــوللەر ئەوە بووبێ کە لە پێشــەوە هەمــوو کرێکــەی دابــووە قاچــاغچییەکان، ئیتر ئەوان کرێکەی میوللەریان خستە گیرفانیانەوە و لە هەولێر جێگەی خۆشاردنەوەی ئەڵمانەکانیان بۆ پۆلیسخانە ئاشکرا کرد، بە ئومێــدی ئەوەی هەزار دینار (بۆ هەر سەری ٢٥٠ دینار)ەکەی پاداشی میری بۆ گرتنی تاقمی «کردەوەی مامۆنت» مسۆگەر بکەن.

ئەفســەری پۆلیس بە دیــع مــحــەمەد نەزهەت (١٩١٠ ـ ١٩٦٠) و پیاوەکانی دێنە گوندی بێوکە و گەمارووی ئەو جێیە پر لە دار و دەوەنە دەدەن، هەر سێ ئەڵمانەکە دەگرن، لەو کاتەدا رەمزی لەوێ نابێ. هەر بۆ ئامــانجی لێکۆڵینەوە و ترساندن و ئاسان کردنی گرتنی رەمزی هەموو کەس و کار و مامەکانی دەگیرێن، تەنیا نوورەدین ئاغا ئازاد کرا بوو بۆ ئەوەی رەمزی بگرێ و بیدا بە میری. ئیتر لەو کاتەی کە رەمزی دەچێتە لای نوورەدین ئاغا بۆ ئەوەی رزگاری بکا بۆی ئاشکرا دەبێ کە ئەڵمانەکان گیراوون هەمــوو کەس و کاری خۆشی یا دەســت بەســەر کراوون، یا خراونــەتە گرتووخانە و بە قسەی نوورەدین ئاغا پێویستە خۆی بدا بە دەستەوە و هەموو هەوڵێکیشی بۆ دەدەن کە ئازاری پێ نەکا. بەم جۆرە خۆی دەدا بە دەستەوە و لە گرتووخانەی هەولێر دەگاتەوە هاورێ ئەڵمانەکانی.

وەکــو لەم گێرانــەوەیــە بۆمــان دەر دەکەوێ «کردەوەی مامۆنت» بە مردوویی لە دایك بوو، چونکە میوللەر و رەمزی هەردووکیان تێروانینیان بۆ ناوەرۆك و حەقیقــەتی وەزعی کوردستــان و رۆژهــەڵاتی ناوەراست و جموجۆڵی سوپای سوێند خۆرەکان بە تایبەتی سوپای سوور (سوپاهی سۆڤیەت) راست نەبوو. خۆ تاقی کردنەوەکەی رەشید عالی لە مێژ نەبوو

رووی دابوو.

میوللەر تەنیا لەبەر ئەوەی کورد بە گشتی ئینگلیزی خۆش نەدەویست، وای دەزانی قوربـانی دەدا بۆسەرکەوتنی ئەڵمان، بێ گومان پێوەندیی کۆنیشی بە شێخ مەحموودەوە و ناحەزیی شێخ لەگەڵ ئینگلیز وای لێ کرد بوو کە ئومێدێکی زۆری بەو هەبێ، زیاد لە سەر ئەم هەموانە رەمزی لە رووی دڵسـۆزی و گیانی راستەقینەی کوردایەتی‌یەوە دەسەڵاتی ماڵی باوکی و دایکی وا دەرخست بوو کە دەتوانن سوپایێك دروست بکەن بۆ پاڵپشتی ئەڵمان بۆ مەبەسی‌دەرکردنی ئینگلیز لە وڵات. ئەمە دیارە بینین و دیـاردەیێکی راست نەبـوو، چونکـە نەك بنەماڵەی رەمزی بەڵکو هەموو ئاغاکانی ناو شاری هەولێر عەشرەتیان نی‌یە، لەگەڵ کرمانجەتی نازین، خەڵکی گونـدەکانیان لە هەموو شتێك دا بە قسەیان ناکەن، ئەمە و بێ گومان هەموو ئەو خزم و کەس و کارانەش وەنەبێ لایەنگری ئەڵمان بووبن و رقیـان لە ئینگلیز بوو بێ، جگە لەوەی زۆر جار تەنگوچەڵەمەی نێوان بنەماڵە دەوڵەمەندەکان بوونەتە هۆی ئەوەی هەر یەکێك بە لایێك دا رای بکێشێ، لایەنی ئینگلیز زۆر بوون، لایەنی تورکیش هەبوون، پێوەندیی هەندێ بنەماڵەی کورد بە ئینگلیزەوە بە میرات لە باوکەوە بۆکور دەمایەوە.

ئەوەی بەڵگەی ناراستی‌ی بۆ چوونەکانی میوللەر و رەمزی‌یە قسەکانی قەرەنی نافیعە بە زمانی باوکیەوە کە بە دوو ووشە کۆتایی بە مەسەلەکە هێنـا و «کردەوەی مامۆنت» لە ماڵی عەتائوڵڵا ئاغا لە هەولێر دووایی پێ هات. ئەمـە بووە هۆی ئەوەی ئیتر میوللەر بیر لە رزگار کردنی خۆی و ئەندامانی هەموو تیپەکە بکاتەوە.

رەنگـە هی وا هەبێ بڵێ ئەگەر لە بیتوێن بهاتنایە خوارەوە، مەسەلە رەنگێکی تری دەگرت، ئەمەش وا نی‌یە، چونکە لەو سەردەمەدا نە خاڵوانی رەمـزی، نە ماڵی باوکی، نە هیـچ لایێکی تری کوردیش بۆیـان دەکـرا یارمەتی‌ی ئەڵمان بدەن، چونکە ئەڵمان کەوتبووە لێژی‌یەوە، هەروەها لە ووزە و چالاکـەی چینایەتی سەرەك عەشرەت و دەوڵەمەندەکانی شارا نەبوو لە کوردستـانـا بە گژ ئینگلیزدا بچن، لە خووارو و ناوەراستی عیراق دا ئینگلیز بە هێز بوو، لە هەرێمە دراوسێکانی رۆژهەلات و رۆژئاوای عیراق دا (ئێران و سووریـا و لبنان و ئوردون) سوێندخۆرەکان دەسەڵاتیان هەبوو، تورکیا لە دژی هەموو مافێکی کورد بوو، ئیتر ئەمە هەمووی تەگەرە بوو لە رێی داگیر کردنی چاڵەکانی نەوتی عیراق.

تیپەکەی «کردەوەی مامۆنت» لە رۆژهەڵاتەوە (مووسڵ) روویان کردە هەولێر، مەسەلەکەیان ئاشکرا بوو بۆیە ناخۆشیان دی، ئەگەر لە بیتوێن بنیشتنایەوە و بەبێ ناخۆشی و مەسەلەکەشیان ئاشکرا نەبووایە یا دەبوو لە رێـوە هانـا بەرن بۆ خاڵوانی رەمـزی پیم وایـە ئەمـانە هیچیان بۆ نەدەکردن، بەلام لەبەر ئەوەی لەگەڵ رەمزی بوون رەنگ هەبوو یاریدەیان بدەن و بیانگەیێننە سەر سنووری تورکیا، یا دەبوو بگەیشتنایە هەولێر قەرەنی نافیع هەر ئەو قسەیەی دەکرد ئەوەی کردی، بەلام ئەویش ئامادە بوو بیانگەیێنێتە هەر جێیێکی میوللەر بیویستایە.

لەبەر ئەوەی «کردەوەی مامۆنت» لە پلەی ئەو ئامانجە نەبوو کە بۆی دانـرابـوو (داگیـر کردنی چاڵەکـانی نەوت و گەیـاندنی کورد بە مافە نەتـەوایـەتی‌یـەکـانی) سەر نەکـەوت. رەنگە هەر لەبەر ئەوەش بووبێ فەرماندەی سوپای ئەڵمان لە سەرەتاوە بایەخێکی ئەوتۆی نەدا یە تیپەکەی «کردەوەی مامۆنت». بەلام لەگەڵ ئەوەش دا «کردەوەی مامۆنت» جارێکی تریش ئەوە دەخاتە رووکە کوردستان بۆ سیاسەتی ئەڵمانیا گرنگ بوو، هەر لەبـەر ئەوەش نەوەکـو تەنـیـا لە جەنگی دووەمی گێتی‌دا دەستی لە مەسەلەی کورد وەرداوە، بەڵکو لە پێش جەنگی یەکەمەوە، یا راستتر لە دووا ساڵانی سەدەی نۆزدەمـەوە ئەڵمان خەریکی ناوچە کوردی‌یەکانی دەوڵەتی قاجـاری و عوسمـانی بووە، دیـارە کۆششـە خوێنـدەواری و رۆشنبیری‌یەکانی ئۆسکارمانی زانا بەشێك بووە لەم ئامانجەی ئەڵمان.

## رەمزی و من

کە باس لە خۆم دەکەم مەبەسم شەخسی خۆم نی‌یە، بەڵکو هەموو ئەو ئەوەیـەی لە تەمـەنی من بوون و قوتابی‌ی قوتابخانە بوون و لە رووی نیشتمانپەروەری و کوردایەتی‌یەوە بیر و باوەریان لە یەکتری‌یەوە نزیك بوو، من لێرەدا رەنگدانەوەی دڵ و دەروونی هەموو ئەو کەسانە دەخەمە روو.

کە هەواڵی رەمزی و پەراشووت و سوپای ئەڵمان بڵاو بووەوە، تازە تاقی کردنـەوەی بەکـالۆریـای پۆلی شەشـەمی سەرەتاییمان دابوو یا دەدا، هەندێکمان دڵیان زۆر بەوە خۆش بوو کە پاداش و دیاری و سەوقاتی سەرکەوتن و دەرچوونمان لە قوتابخانەی سەرەتایی‌یەوە بۆ قوتابخانەی ناوەنـدی چوونـە ریـزی بەچکەشێرانی هیوایە. ئەحمە و خالیس و من بووین، ئەنوەر بە قوربان و خەنجەر و شتی تر سوێندی داین، ئینجا عەلی بوو بە رێبەر و فێرکەرمان. ئێمە کە ناوی رەمزیمان بیست نەماندەزانی بە راستی ئەندامی هیوایە، بەلام لەوە دڵنیا بووین کە قارەمانێکی وەکو ئەو دەبێ ئەندامی هیوا بێ.

مووچرکی خۆشی بە لەشمانا دەهات، هەندێکمان حەزی دەکرد لە باتی رەمزی بووایە، هەندێکی تر ئارەزووی دەکرد لەگەڵی بووایە. ئاخۆ ئێمەش کە گەورە ببین بۆمان رێکدەکەوێ لە سەر شانۆی ژیان دا دەورێکی وەکو رەمزی بنوێنین! رەمزی بۆ ئێمە کاکە بوو ئەگەر چی زۆریشمان چاوی پێ نەکەوت بوو. بەلام من بەش بە حاڵی خۆم لە هاوینی ساڵی ١٩٤٣ وە تا ئێستا ئەدگاری دیاری رەمزی لە سوعادی برای و ئاموزاکانی دەبینم، ئەوانـەی لەگـەڵ ئێمـە هاو تەمـەن بوون لە قوتـابخـانەی سەرەتایی، هەموومان هاوڕێی خوێندن و قوتابخانە بووین، بەلام ئەدگاری ناوەوە و شاراوەی رەمزی هەموو نیشتمانپەروەرو کورد پەروەرێك لەناخی دڵ و دەروونی خۆی‌دا دەبینێ مەسـەلـ[illegible] ئازایی‌و قارەمـانیـەتی‌و نیشتمان پەروەری رەمـزی شتێـك [illegible]و لەبـیر [illegible] چووەوە. زانیـاری لە بارەی «کردەوەی مامۆنت»ەوە هەر ئەو زانیاری [illegible] وون کە بنەماڵەی رەمزی دەیانزانی یا خەڵکی گوندی بیوڕکە دە[illegible]ری ئاگاداری بوون باوەریش ناکەین خەڵکی تا دەگاتە خزمەکانی رەمزیش هەموویان لەگەڵ کردەوەی رەمزی بوو بن و مەسەلەکەیان بەهی خۆیان زانیبێ، بەڵکو لەوە دڵنیابن کە بەشێکی زۆر لەوانەی کە بە سۆی رەمزی‌یەوە زیانیان پێ گەیشت بوو، نەوەکـو تەنیا خۆیان دوورە پەرێز دەگرت بەڵکو خۆیان لە خزمایەتی و

هاوڕێیەتی ڕەمزیش دوور دەخستەوە.
بۆیە مەسەلەکە لای خۆمان کپ بوو، پەردەی خرابووە سەر تا چەند ساڵێك لەمەوبەر.

لە ساڵی ١٩٥٩ کە کتێبەکەی میوللەر بە ئەڵمانی بڵاو کرایەوە، یەکسەر هەواڵی بەر گوێم کەوت. لە سەرەتای شەستەکان دا بۆ خوێندن ڕووم کردە یەکێتیی سۆڤیەت (مۆسکۆ و لینینگراد) لە یەکەم گەشتی شاری بەرلینی ڕۆژئاوام (هاوینی ١٩٦٠) دەنگوباسی ئەم کتێبەم لە خوێند کارە کوردەکانمانم پرسی گەلێك لە ناوەڕۆکی هەر لەو کاتەدا بۆم ڕوون بووەوە.

لە پاشانا کە دوکتۆر عەبدالقادر غەریب بوو بە قوتابی لە بەرلینی ڕۆژئاوا بە ناوی ئەوەی کە هەولێری‌یە هەر لە سەرەتاوە بایەخێکی زۆری بەم مەسەلەیە دا بوو، کتێبەکەی دەست خست و ئاشنایەتی و دۆستایەتیشی لەگەڵ میوللەر دا پەیدا کرد، هەر لەو سەردەمەوە چەند جارێك قسەمان لەم بابەتەوە کرد کە ئەو کتێبکە بگۆڕێتە سەر زمانی کوردی یا عەرەبی، دیار بوو لە نووسینی کوردی و عەرەبی‌یەکەی ڕازی نەبوو، نەشی دەویست لە پێداچوونەوەی دا من ماندوو بکا، بێ گومان زۆریش حەزی دەکرد کە کتێبەکە بکرێ بە کوردی.

ئیتر مەسەلەکە مایەوە تا ساڵی ١٩٨٠ کە چاپی ئینگلیزی کتێبەکە دەرچوو، دوکتۆر عبدالقادر غەریب زوو بە زوو دانەیێکی پێشکەش کردم، ئەمە لە پاڵەوە ئەوەی دەگەیاند کە چاپە ئینگلیزی‌یەکە زیاتر ڕێگە خۆش دەکا بۆ گۆڕینی بۆ زمانی کوردی. بەڵام دوور خستنەوە لە زانستگای بەغدا (١٩٨١) و لە دووا جاردا دوور کەوتنەوە لە وڵاتیش (١٩٨٢ - ١٩٨٨) ڕێگەی هێنانە دی ئەم پرۆژەیەی لێ گرتم. وا بوو لەو ماوەیەی کە لە دەرەوەی وڵات بووم (زانستگای عەننابە لە جەزائیر) میوللەر خۆی دانەیێکی لە چاپە ئینگلیزی‌یەکە بۆ ناردم، ئەوەشی دەربڕی کە زۆر بەختیار دەبێ ئەگەر کتێبەکەی بە زمانی زگماکی ڕەمزی ببینێ و ئامادەیە بۆ هەموو یارمەتی‌یێك لە پێناوی گۆڕینی کتێبەکە بۆ زمانی کوردی.

هەر لەو سەردەمەدا بوو بۆ یەکەمین جار کۆمەڵێك لە نووسەرانی کورد هەندێ وتار و تێبینی‌یان لە ڕۆژنامە و گۆڤارە کوردی‌یەکان دا بڵاو کردەوە. بە گشتی نووسینەکان دوو بابەت بوون، بەشێکیان زانیاری‌یان لە نزیکەوە تێدا بوو، واتە هاوڕێ و ناسیاوی ڕەمزی بوون، بەشەکەی تریان لە دوورەوە و لە ڕووی تیۆری‌یەوە لە ژێر ڕۆشنایی ئیدیۆلۆجیەتێکی دیاری دراو تەماشای ڕەمزی و کردارەکەیان دەکرد، لەبەر ئەمە ئەو بەسە بوو بە دوو بیروڕای جیاو پێچەوانەی یەکتری، وای لێ هات بە یەکەمیان بڵێ: «نە وا سوێرە» و بە دووەمیان بڵێ: «نە وا بێ خوێ». ئیتر ئەم نووسینانە زیاتر هانیان دام کە بکەومە خۆ بۆ ئامادە کردنی کتێبەکەی میوللەر بە کوردی کە بێ گومان وەرامی گەلێ پرسیار دەداتەوە، دەمێنێتەوە سەر بیر و ڕای خەڵکی لە بابەت هەڵوێستی ڕەمزی‌یەوە، ئەمەش دەبێ بە گیانێکی دیموکراتیانە وەربگیرێ و هەموو کەسیش سەربەستە لە بیروڕای خۆی ئێمەش بیروڕای خۆمانمان هەیە.

لە پاش گەڕانەوەم بۆ مەڵبەندی ڕووناکی لە هەولێر لە هەموو شتێك زیاتر دەستوو بردم کرد بۆ ئامادە کردنی کتێبەکەی میوللەر بە کوردی بەخت یار بوو و لاوێکی ژیر و تێگەیشتووی کوردی و ئینگلیزی زانی وەکو بە دران ئەحمەد حەبیب[٩] هەڵکەوت کە بتوانێ ئەم ئەرکە بە چاکی بگەیێنێتە ئەنجام.

بە دران کتێبەکەی گۆڕی‌یە سەر زمانی کوردی[١٠] پێدا چوونەوە و بژار کردنی کەوتە ئەستۆی من، جگە لەوە دەبوو پەراوێز و شیرازەشی بۆ بکەم، بێ گومان پێشەکیش شتێکی پێویست بوو، چونکە گەلێ لایەنی تری مەسەلەکە ڕوون دەکاتەوە.

سەرچاوە و کەرەستەی پەراوێز و شیرازە و نووسینی پێشەکی زیندوو بوو، واتە قسەی سەر زمان و ئەزبەر بوو، لە پێشانا لە برا و کەس وکار و نزیکەکانی ڕەمزی وەرگیرا، ئینجا دۆست و برادەران و ئەو کەسانەی ئاگاداری ڕووداوەکان بوون، لە بەر ئەوە سەرچاوە نووسراوەکان (ئەو وتارانەی لە سەر مەسەلەکە بڵاو کرابوونەوە) پشت گوێ خران، چونکە زۆریان بیر و ڕای ئیدیۆلۆجی بوون، وەکو ئاشکراشە مەبەسی ئێمە ئەوە بوو کتێبەکەی میوللەر لە نهێنی دەربێنین، بۆ ئەمە تەنیا ئەو زانیاری‌یانە بخەینە ڕوو کە پێوەندی‌یان بە ڕوون کردنەوە وڕاست کردنەوەی زانیاری‌یەکانی ناو کتێبەکەوە هەیە. ئێمە لەم پێشەکی‌یەدا کارمان بە سەر ئەوەدا نی‌یە تێبینی بەرامبەر ئەو بیروڕایانە دەربڕین کە بۆ مەسەلەی ڕەمزی هاتوونەتە ناوەوە، واتە ئەوەی بەلای ئێمەوە ڕاستە پەنجەی بۆ درێژ بکەین و ئەوەی هەڵەیە بە بەڵگەوە ڕەتی بکەینەوە، ئێمە ئەمە ناکەین. بەڵام مافی ئەوەمان هەیە بیروڕای تایبەتی‌ی خۆمان دەربڕین بە هەموو سەربەستی‌یێکەوە، هەر کەسێکی هی تری هەیە، یا پێچەوانە، با بفەرموێ.. هیچ شتێکیش لە دیموکراتی‌و سەربەستی خۆشتر نی‌یە.

## ڕەمزی‌ی نیشتمانپەروەر

نزیکەی نیو سەدە بە سەر ئەو ڕووداوانەدا تێپەڕی کە میوللەر و ڕەمزی قارەمانی بوون، کەچی میوللەری ئەڵمان وا لە شاری شتووتگارت دەژی و هێشتا ماوە، بەڵام ڕەمزی‌ی کورد زیاتر لە چل ساڵ لەمەوبەر دوو هاووڵاتی شاری خامۆشانە لە هەولێر. ئەم ماوە زۆرە هەموو کردەوە و ڕووداوێك لە نهێنی دەردێنێ، بۆیە نابێ هیچ شتێك پەردەی بە سەردا بگیرێ‌و پێویستە هەموو شتێك بە ئاشکرا بوترێ.ناوەڕۆکی نیشتمانپەروەری شتێکی موتلەق و هەمیشەیی نی‌یە، بە پێی سەردەم و ڕۆژگار دەگۆڕێ، هەروەها بە پێی هەڵوێست بەرامبەر بەکرددەبێ .خوێندەواری دەور و بەری جەنگی -ووەم لە کۆمەڵی هەولێر ئەوانەی بیریان لە دووا ڕۆژی میللەت دەکردەوە دەبوو یا لایەنگری ئینگلیزبن، یا خۆیان سەر بە ئەڵمان بزانن، یا تورکچی بن، ئەوەی تورکچیەتی دەکرد پێوەندی بەم باسەی ئێمەوە نی‌یە. هەرچی ئینگلیز بوو لەو سەردەمەدا ئێسکی قورس بوو، خراپەی لەگەڵ هەموو عیراق کرد بوو نەوەکو تەنیا کورد، کاربەدەست و مووچەخۆری گەورە و بەشێك لە بۆرجوازی و دەرەبەگ و دەست ڕۆیشتووەکان کە سەر بە ئینگلیز بوون وەنەبێ لە کۆمەڵ دا ڕێزیان گیرا بێ، بێ گومان خۆشیان هەستیان بەمە دەکرد، بەرامبەر بەمە تەنیا نازی بوو کە هێز و ناوێکی هەبوو لە ناوچەکەدا و دژی ئینگلیزیش بوو، خەڵکەکە خراپەیان لێ نەدی، بوون بەقوولیش لە فەلسەفەی




نەخشەی ڕێڕەوەتیپی «کردەوەی مامووت» لە هاتنە خوارەوەیان بە پەرەشووت لە نزیک سێ چوارچکەی (عیراقی ـ تورکی ـ سووری) تا گوندی «بیۆکە» لە نزیك هەولێر.

نازی نەگەیشت بوون، ئاگاداری کار و کردەوە ناهەموارەکانیان نەبوون کە هەمـوو مرۆڤـایەتی تووشی بوو بوو، لەبەر ئەوە لایەنگری ئەڵمان بوو بوون، بە بەڵگە و نیشانەی نیشتمانپەروەری. ئێمە هەموومان لە بیرمانە ئەو منداڵانەی خۆیان بە نازی دادەنا گەڵی سەر بڵندتر بوون لە وانەی کەوا هەست دەکرا کە سەر بە ئینگلیـزن، دەبێ ئەوەش بزانین کە لەو سەردەمەدا لە هەموو عیراق نازی قەدەغە بوو و دەستووری ئینگلیز لە ناوەوە بوو، خۆ هەمـووـمان هەراکەی هەولێرمان لە بیرە کە سالح زەکی موتـەسـەریف بوو (١٩٤١)، هەروەها لە بیرمانە هەر منداڵێکی باوکی پیاوی ئینگلیز بوو بێ چەند چاوشۆر بووە لە ناو خەڵکی. ئەمە هەمووی بەڵگەیێکی ئاشکرا و گرنگ بوو کە ئەم خەڵکە ساکارە لە دژی ئینگلیز بوون.

کەچی ڕاستیـیـەکـەی پێچەوانە بوو، نەك لەو ڕۆژەوە کە ئەڵمان جەنگی دووەمی داگیرساند بەڵکو لەو ڕۆژەوە کە هیتلەر دەسەڵاتی گرتە دەستی خۆی نازی دەردێکی کوشندە بوو تووشی هەمـوو مرۆڤایەتی بوو بوو، جەنگەکەش هەر لە سەرەتاوە جەنگێك بوو لە نێوان چاکە و خراپە، هەر لە سەرەتاوە جەنگێکی نیشتمانی بوو بۆ هەموو مرۆڤێکی دژ بە نازی نەك لەو ڕۆژەوە کە هیتلەر هێرشی نامەردانەی بردە سەر وڵاتی ڕووس و سۆڤیەت. لەبەر ئەوەیە ڕەمزی نەوەکو لە ساڵانی ١٩٤٢ ـ ١٩٤٣، بەڵکو لە ساڵی ١٩٤٠ یا لە ساڵی ١٩٤٥ یش هەروەزی لەگـەڵ ئەڵـمـان بکردایـە بۆ ناوەرۆکی سیاسی ئەو ڕۆژە ڕاست بوو.

ڕەمزی یا دەبوو لایەنگری ئینگلیز بێ یا ئەڵمان، نە دەبوو بە لایەنگری تورك چونکە بە کوردی بەرۆمردە کرا بوو، لە ماڵیان دا هەوایێکی دژ بە ئینگلیز هەبوو، ئەمە بوو بوو بە هۆی ئەوەی مەیلی بۆ ئەڵمان هەبێ، لەو کاتـەدا ئەو مەیلە دروشمی نیشتمانپەروەری بوو، خۆ ئەگەر ببوایە بە ئینگلیز خوا ئێستا و ئەوساش بە چاوێکی تر تەماشا دەکرا، ئەمە لە لایێك لە لایێکی ترەوە ڕەمزی بە دووای هیوا و ئامانجێك وێڵ بوو کە چەند جاران ئینگلیز بوو بوو بە تەگەرە بۆ هێنانە دی ئەو هیوا و ئامانجانە، بەڵام وا ڕێك نەکـەوت بوو تاقی کردنەوەی لەم لایەنەوە لەگەڵ ئەڵمان هەبێ، ئەمەش هاندەرێکی تر بوو بۆ ئەوەی لەگەڵ ئەڵمان ڕێك بکەوێ. مەسەلەکە هیچ نەبێ لە ڕووی تیۆریەوە ڕاست و ڕێك بوو بۆیە بەڵگەی لەخۆ بووردن و قارەمانیەتی زیاتر لە ڕەمزی‌دا دەر دەکەوێ.

بێ گومـان پارتی هیوا دەورێکی باڵای بووە لە بە هێز کردنی گیانی نەتـەوایـەتی لە ڕەمزی و لاوی کوردی ئەو سەردەمە، ئەگەر چی هیوا تیـۆریێکی تایبـەتی نەکرد بوو بە ئیـدیۆلۆجیەتی خۆی، لە بەر ئەوە تەکتیکی لیـل و شیـواو و پڕ لە تەنگو چەڵەمە بوو، بەڵام لە بەر ئەوەی ستـراتیجی هێنـانەدی ئامانجی نەتەوایەتی بوو بۆیە وەك پارتی یەکی نیشتمانپەروەر چووە ناو مێژووی سیاسی میللەتەوە. جا هەر ئەنداميٚك بەڵگەیێکی هەبوو بۆ هەڵبژاردنی ئەو بیروباوەڕەی بە ڕاستی دەزانی بۆ دیار کردنی دووا ڕۆژی نەتەوە، لەبەر ئەوە ئەگەر ڕێگەیێکی ناڕاستیشی گرتبێ (گـرتنی لایـەنی نازی) هەر دەبێ بە نیشتمـانپەروەر چونکە بە دڵسۆزیەوە وای زانیوە ئەم ڕێگەیە دەیگەیێنێتە ئامانج.

ڕەمزی بۆ هەولێر شۆڕشێك بوو، شۆڕشەکەی لە پێناسی خۆیەوە دەست پێ دەکـا، شانازیی بە وشەی «ئاغا»وە نەکردووە، بە «ڕەمزی نافیع ڕەشید» خۆی بە خەڵکی ناساندووە، ئەگەر چی لە شار گەورە، بووە بەڵام خوو و ڕەوشتی دەشتیشی پاراستووە. شارێکی دێرینی وەکو هەولێر کە، بە تەمـەن سێ چووار هەزار ساڵ، چەنـد جار تەخـت کراوە و هەڵای ڕووخێنـراوە، بە سەرهـاتی مێـژوو پەروەردەیێکی تایبـەتیی هەڵکی شارەکـەی کردووە، بەڵام ڕەمـزی ئەم بوونـەی ڕووخـانـە، چونکـە نیشتمانپەروەریەکەی تەنیا بە قسە و لە ڕووی تیۆریەوە نەبوو، بەڵکو بە کردەوە و پراکتیکەوە جووە مەیدانی بەرلین و مەشقی پەراشووت و سیلاحی شۆڕی، بە بێ ڤیزە بە پەراشووت دابەزییە وڵاتی خۆت!

## سلاو و سوپاس

سڵاو و سوپاسی گەرم و بێ پایانم:

بۆ گۆتفرید میوللەر، چونکە کتێبەکەی پێشکەش کردم، دڵخۆشی نواند بۆ گۆڕینی کتێبـەکە بۆ زمانی کوردی، نەوەکو هەر ئەوەندە بەڵکو ئامادەی یارمەتیی تریش بوو.

بۆ دوکتـۆر عەبدولقـادر غەریب، چونکە هەر لەو ڕۆژەوە لە ئەڵمانیا نیشتەوە عەوداڵی سەر و سۆراغی ڕەمزی بوو، ڕەمزیی خۆش دەویست،

وەکو هاونیشتمان و هاو شاری، لە هەموو یەکتر بینینێك هەر باسی رەمزی بوو، میوللەری پێ ناساندم و کتێبەکەی بو ناردم

بۆ کاك سوعاد نافیعی برای رەمزی و هاورێی قوتابخانەی سەرەتاییم.

بۆ مامۆستا سەردار میرانی خزمی رەمزی.

بۆ مامۆستا عەلی مەحموود جوکلی خەڵکی گوندی ماڵی نوورەدین ئاغا مامی رەمزی.

چونکە گەلێ شتیان لە ژیانی رەمزی بۆم روون کردەوە، هەموو تەنگو چەڵەمەیێکی لە بابەت مێژوو جوگرافیا و بیوگرافیا هەبوو بۆیان ئاسان کردم.

قەرزاری کاك سوعاد نافیعم بۆ هەموو وێنەکان.

سڵاو بۆ گیانی پاکی رەمزی

**مارف خەزنەدار**

**هەولێر - رووناکی**
**١ی تشرینی دووەمی ١٩٨٩**

**پەراوێزەکان**

١- بەڵام لە خوارووو و ناوەراستی عیراق بیروباوەری مارکسیزم پەیدا بوو بوو وباوەر پێ کراویشی هەبوو، کەچی لە کوردستانی عیراق تەنیا ناوبانگی هەبوو و لایەنگری بە نەبوو حیسێب دەکرا.

٢ - زۆربەی بەچکەشێرانی هیوا لە ماوەی جەنگی دووەمی گێتی‌دا خۆیان بە نازی دەزانی.

3 – Muller G.J. Einbruch ins Veschloss Kurdistan.(PhiladelPhia) Buch handlung August Fuhr, Reutlingen, 1937, 743 S, 12 Tal. (... ناو کوردستانی داخراو)

ناوی کوردی کتێبەکە لە ئەڵمانی‌یەوە لە کردەوەی د. جەمال نەبەزە، بروانە «کورتە مێژوویەکی کورد ناسی لە ئەڵمانیادا» گۆڤاری کۆری زانیاری کورد، بەرگی دووەم، بەشی یەکەم، بەغدا، ١٩٧٤، ل ٤٥٢.

٤ ـ ئەم زانیاری‌یانەم لە د. موکەرەم تاڵەبانی وەرگرتووە لە رۆژی هەینی ٣٠ی حوزەیرانی ١٩٨٩ لە بەغدا.

٥ ـ ئەم جەلال یاوەرە خاڵی هەندێ لە کورەکانی نافیع ئاغایە، هەرچی دایکی رەمزیشە لە میرانەکانی شەقلاوەیە.

٦ ـ کاك سوعاد نافیع کە جەلال یاوەر خاڵیەتی مەسەلەکە بە جۆرێکی تر دەگێرێتەوە، دەڵێ: لەو کاتەی کە رەمزی چووە و سۆراغی ماڵی جەلال یاوەری کردووە، لەو دەمەدا هەر لە مووسڵ نەبووە. پێش ئەوە بە ماڵەوە لە مووسڵ گوازراوەتەوە.

٧ ـ ئەو ماڵەی هەموو کورەکانی رەشید ئاغا تێیدا دەژیان لەوانە نافیع ئاغای باوکی رەمزیش بە ناوی ماڵی عەتائوڵلا ئاغای مامی رەمزی‌یەوە ناوبانگی دەرکرد بوو

٨ ـ میوللەر ناوی قاوەچی‌یەکە بە ئەحمەد دەبا. راستی‌یەکەی ئەوە کە ناوی عەلی بووە و ناوی کوری ئەحمەد بووە. لەو سەردەمەدا تەمەنی نزیکەی شەست ساڵ بووە

٩ ـ سوپاس بۆ کاك عەزیز حەریری کە بووە هۆی ئەوەی بیم بە ئەسیو و هەوێنی کاك بەدارن ئەحمەد حەبیب.

١٠ ـ ئەوەی پێویستە لێرەدا بووترێ ئەوەیە کە مامۆستا سەردار میران بە زمانی عەرەبی چەند لاپەرێکی لە کتێبەکە (چاپی ئەڵمانی) بلاو کردۆتەوە لەگەل پێشەکی پێشەکی‌یەکە. بروانە: سەردار میران. کردستان في نظر سائح المانی. مجلة کاروان. العدد ٥٧، تموز ١٩٨٧، ص ١٣٠ ـ ١٣٤.

بەرگی دەرەوەی کتێبەکەی گوتفرید میولەر

**In The Burning ORIENT**

**DANGEROUS MISSION MIDDLE EAST 1943**

بەرگی ناوەوەی کتێبەکەی گۆتفرید میولەر

The German original title is „Im brennenden Orient"
© 1980 by Gottfried Johannes Muller
Translated from German by Peter McCarthy

Published for the friends of Salem.

First edition 1980
Joint production
Mohndruck Graphische Betriebe GmbH, Gütersloh
Printed in Germany

**پێشەکی**

لە ژێرخانەی مردندا چاوەنۆری فەرمانی لە سێدارەدان بووم کاتێ بڕیاری خۆمم دا.

بە خۆمم گوت، دەشێ بە گیان بمێنم و، بتوانم داهاتووی ژیانم بۆ تاکە شتێك ـ تەنیا تاکە شتێك تەرخان بکەم ئەویش خزمەتی ژیان خۆیەتی، هەمان ئەو ژیانەی کە ئێستاکە بە هۆی ئەوەوە بیرم ئاوەها ئاڵۆز و پەرێشان بووە.

ئیدی لەم بڕیارەوە سالم Salem کۆمەڵەی لە دنیادا ناسراوی بایەخ پێدانی گیانلەبەران بە ئینسان و ئاژەڵەوە، سەری هەڵدا.

لە پێناوی ئەمەدا پەرجووەکە رووی دا.

چۆن رووی دا ئەوا لەم کتێبەدا ووتراوە.

بەوپەڕی دڵسۆزییەوە ئەم کتێبەم ئەم پێشکێشی دۆستانی سالم دەکەم لە هەر کوێیەك بن.

**گۆتفرید میوولەر**

# بە یادی ڕەمزی

**« میوولەر »**

کردموەی مامۆنت

# هەراسانی

بەهاری ١٩٤٢ لە ئەستەموولەوە گەڕامەوە بۆ ئەڵمانیا. لە ئەستەموول لە کارێکی خەفیەیی‌دا بەشدار بوو بووم و نێردرابوومە یەکەیەکی سپێری سوپایی لە دارستانی بۆهیمیا. ئەرکی من ئەوە بوو ئەندامە نوێهاتووەکان بۆ پێشەبەرەی رووسیا مەشق پێ بدەم کە چاوەنۆڕ بووم خۆیشم دوا جار رەوانەی ئەوێ بکرێم.

دڵخوش بووم بەوەی دەستم لە نێردەی تایبەتی بەردەبێ و جارێکی تر دەگەڕێمەوە نیشتمان. بەڵام هەر لە هەوەل کۆوە دڵە راوکەیەك دایگرتم. لە دڵی خۆمدا گوتم هەبێ و نەبێ ئەمە شوێنەواری کارە خەفیەیی‌یەکانە کە باجی خۆیان لە دەمارگیریم nerves وەرگرتبوو و، هەموو جارێ لە بنەتای هەفتەدا بۆ ئەوەی هۆی ئەم هەراسانییەم لە مێشك وەدەرنێم سەردانی قیەنام دەکرد کە چەندین ساڵ لەوێ ژیابووم و بە سواریی شەمەندەفەر دووریی چەند سەعاتە رێیەکی کەم دەبوو.

هەر زوو دۆستایەتیم لەگەڵ کابرایەکی ئەفسەر ـ هانز کریستۆف، دا بەست کە چەند جارێك لە شەڕدا بریندار بوو بوو و ئێستا لەبەر چاوەدێریی یەکەیەکی چاکبوونەوەدا بوو. زۆرمان حەز دەکرد پێکەوە سەرو پەرداخێك شەرابی نوێ بخۆینەوە.

هەموو جارێ کە ووتوویژمان بە ناچاری دەسوورایەوە سەر باسی شەڕ، دەمپرسی:

«بە بیری تۆ سەرەنجام بەچی دەگات؟»

لە بیرمە جارێکیان وەڵامیم دایەوە گوتم:

«گوتە پێشینەکەی چینیت لە بیرە؟ سێ شت هەن هیچ کەسیان لێ دڵنیا نابێ: ژن بیر لە چی دەکاتەوە، باسترمە لە چی دروستکراوە و شەڕ هۆ بە کۆتا دێت.»

لە راستیدا وا پێ دەچوو هیوای سەرکەوتنی ئێمە باش بێت. سوپای ئەڵمانیا لە هەموو بەرەکاندا دەچووە پێش و بە تەواوی گەیشتبووە میسر و قەفقاسیا. گەلێك لەو نوختەیە دوور نەبوون کە بتوانن ئەو جوونە ماشەیی‌یە گەورە دروست بکەن کە بیرە نەتەکانی رۆژهەڵاتی ناوەراستمان بۆ دەستەبەر بکات.

بەڵام لە نیشتماندا نیشانەی مەترسی گەلێك بووە: شالاوی گەورە گەورەی فرۆکە، چرا هەڵنەکردن، تێوە چڕژانی کارکەری بیانی، کۆششی بە فیڕۆ لە پێناو رەها کردنی تواناداران بۆ کاری چالاك.

بێ گومان، گەلی ئەڵمانیا بە کاری هاتە هاتی بانگەوازێکی گەشبین و مژدەدەری میری، چاك ملی لە ئەرکی خۆی گوشیبوو. پێویستە دانیشی پێدا بنێین کە سەرکەوتنی سەرنج راکێشی ئەوتۆش هەبوون شایەنی نووسین بن: بردنەوەی یەك لەسەر یەك لە بەرەکانی شەڕدا. بەڵام بەگشتی وا پێ دەچوون بارەکە روو لە ناهەمواری بێت. ئەو بیرەی بەردەوام تەنگاوی دەکردم ئەوە بوو: ئایا توانای شەڕگێڕیمان گەییوەتە لووتکە؟

## کەمبوونی سووتەنی

هەفتەو مانگ یەك لەسەر یەك رابووردن و هەر چەند جارێکی لە قیەنناوە دەهاتمەوە، دڵەراوکەکەی جاران دایدەگرتمەوە، پتر حەزم دەکرد بە خۆم و ئەوانەی مەشقم دابوون بەرەو ستالینگراد بەرێ بکەوم. واتەوات و دەمگۆ دەربارەی ئاڵۆزی و تێشکانی گەورە گەورەی خۆمانمان پێدا پێدا بو دەهات.

لە یەکێك لە پیاسەکانماندا بە راشکاوی دەربارەی ئەو بابەتە بە (هانز کریستۆف)م گوت:

ـسووتەنیمان کەمە»

ـدزانم. وەڵامی دامەوە. هەموو رۆژی لەو بریندارانەی دەبیستم کە دێنە ـای ئێمـە. پێشکـەوتنمان وەستاندووە جگە لەمەش هەر چەند جارێکی ـجار دەبێ بەرپەرچی پەلامارێکی زۆر بچووکی رووسیا بدەینەوە، ناچار ـدەبێ تانك و چەکەکانمان بتەقێنینەوە. ناتوانین پاشەکشەیان پێ بکەین. ـت بووین. بە چاوی خەیاڵم نەخشـەی رووسیـام دەبینی، بیرێك لە ـیتسکمدا کەوتە نێلە نێڵ.

گوتم: «ئـەم وورە بەزینـە چییـە. ئێمە ئاوەها لێرەدا بێ ئاگردوو بین و ـسوپاشمان لە بناری باکۆ یەك بست لە کەلووی بەرزی چاڵە نەوتە گەورە گەورەکانەوە دوور بێت.»

دەق ئاوەهایە هانز کریستۆف وەڵامی دامەوە «هەر سووکە تەکانێکی تر بدەین، هەرچی نەوتی بمانەوێ دێتە بەر دەستمان و هەموو گرفتێکیش چارەسەر دەبێت»

ـەو ساتەوە خولیای نەوت لە کەللەی دام. نەمدەتوانی بیر لە هیچ شتێکی تر بکـەمـەوە. هەر چەند جارێك لە بارەی شەڕەوە گفتوگۆمان بکردایە، دەسـوورایـنـەوە سەر هەمـان بابـەت. سوپامان لە قەفقاس لە بەر بێ ئاگردوویی پەکی کەوتووە.

دواجار بریارم دا کە تاکە شتێك هەیە بیکەم: یادداشتێکی بە پەلە بۆ سەرکردایەتیی باڵای سوپا بنێرم و بڵێم من زانیارییەکی گرنگم دەربارەی چاڵە نەوتەکانی هەرێمی کەرکووك و مووسڵ هەیە.

چەنـد رۆژێـك دواتر، بۆ چاوپێکەوتنێك لە بەرلین بانگهێشتن کرام. لەوێدا پێشنیارەکەم بە چاکی وەرگیرا و بەرەو سەرکردایەتیی باڵای سوپا رەوانە کرام.

فیلد مارشـاڵ کەیتل سەرۆك ئەرکان، کە بڕیاری جێ بەجێ کردنی پێشنیازەکەی منی بە دەست بوو، ئەمەم بۆی نووسی: «لە سەردانەکانی پێشوومەوە، هەرێمی کەرکوك و مووسڵ چاك شارەزام و دۆستایەتیم لەگەڵ سەرۆك خێلە کوردەکـانی ئەوێدا هەیە. بە یاریدەی ئەوانەوە دەتوانرێ دەست بەسەر چاڵە نەوتەکاندا بگیرێو یا خیبوونێك دژی بەریتانیا ئاگر بدرێ. پێم وایە دەتوانم هەفتەیەك یان دووان ناوچەکە رابگرم تا ئەو کاتەی سەربازی بە فرۆکە دابەزیووی ئەڵەمانیا دەگاتە جێ».

فیلد مارشاڵ کەیتل لە ماوەی هەفتەیەکدا بە نووسین وەڵامی دامەوە و فەرمـانی دا دەست بە کارەکـە بکـەم. هەر لەو کاتەدا فەرمانی پێم دا راپۆرتێك بدەمە دەستەی هەرە بەرزی سوپا لە سەرکردایەتیی فوهرەر. ئەفسەرێکی گەورە پێی گوتم: «ئەمە کارێکی یەکجار زۆر پێویستە، تیپێك زۆر بە پەلە ئامـادە بکـە و بەرەو کوردستـان بەرێ بکـەوە. دەتوانیت دەزگایەکی بێتەل بە کار بێنیت؟»

«بەڵێ،» گوتم. «من لە هێزی ئاسمانی و دژەخەفیەیی‌دا مەشقی بەکار هێنانی دەزگای بێتەلم کردووە کەواتە لە دژە خەفیەیی دابوویت»

«بەڵێ، لە تورکیا»

«لە دەزگای بێتەلدا کارت دەکرد؟». «بەڵێ».

«زۆر باشـە، وا ئێمـە نەخشـەکەی تۆمان بە دڵە و دڵنیاشین تۆ چاك لە مەبـەست دەگـەیت. تەنیـا تاکـە داخـوازێکمان لێت هەیە، دەمانەوێ دەسبـەجێ راپـۆرتی‌برواپێکـراومـان دەربـارەی باکـووری عێراق و کوردستانەوە بۆ بنێریت.»

بە سەر سورماوی سەرنجم بۆی هەڵبری.

گوتی: «هەبێ و نەبێ شتێکی نارێك لەوێدا هەیە. هەمیشە زانیاریی ناکۆك و دژ بە یەکترمان بۆ دێت».

رایکێشامە لای مێز نەخشـەیەك.

«بۆ نموونە لێرە، راپۆرتم بۆ هاتووە کە بەریتانیا خەریکە هێلێکی ئاسن لە بەغداوە بۆ باکوور دەکێشێ. جوانە زۆر جوانە بزانین برادەرانی ئینگلیز لەوێ خەریکی چین. بەڵام راپـۆرتێکی تر دەڵێ هێلەکـە هێشتا لە پلەی نەخش کێشانە راپۆرتی سێیەمیش دەڵێ هێلەکە تەواو بوودو هێندەی نەماوە بەکار بێت».

«تـۆ بابایەکی ئەفسەریت، دەزانم بۆم دەکرێ پشت بەو زانیارییانە ببەستم کە تۆ بۆمانی دەنێریت. زۆر گرنگە بزانین ئێستا چی لەوێدا روو دەدات.»

**کە گەرامـەوە بەرلین، دژەخەفیەییم پشکنی تا بزانم چ کەرەستەیەکمان دەربارەی هەرێمی چاڵەنەوتەکانی باکووری عێراق هەیە و کاتێ بینیم هیچ شتێکی بەکـەڵکمـان نیـە، لە شوێنی خۆم ووشـك بوومـەوە. هەر تێ نەدەگەیشتم چۆن ئەو زانیارییە کەمەمان لە فایلی تایبەت بە ناوچەیەکی ئەو تۆوە هەیە کە بۆ توانای شەرگێریمان هێندە گرنگە.**

بە خۆمم گوت: «دەبێ ئەو شتە راست بکەمەوە. دەبێ زانیاریی ئەوتۆ بدەمـە سەرکـردایەتیی باڵا کە بەکەڵکی ئەو جووڵە ماشەیی‌یە گەورەیە بێت. پیـاوانی خۆمانم لە قەفقاس هاتەوە بیر. ئەو نەوتەتان بۆ دەسگیر دەکەم. چی لەمە چاکتر هەیە، بەم زووانە بۆتانی دەسگیر دەکەم».

خۆ هەڵدانێکی بە پەراشووت لە کوردستان، ناگردانی راپەرینێك لە ناو خێلە چیاییەکاندا، نەوت بۆ سوپامان دەسگیر بکرێ.

هاتبوومە جۆش. هەڵی خۆمم بۆ هەڵکەوتبوو. ئەم کارە لەو جۆرە گردوانە بوو کە هەمیشە چێژم لێ وەردەگرتن.



# کورتە مێژوویا رێبازو قوتابخانێت زمانەوانی

عبدالوهاب خالد*

**پێشکوتن:ـ**

ئەڤ ڤەکولینە لە دویف هژمارتنەکا مێژوویی بڤی ئاوایێ ژێری هاتیە دابەشکرن:ـ

ئێك ـ سەرهتایەك بۆ مێژوویا ڤەکولینێت زمانەوانی.

دوو ـ زانستێ زمانەوانیێ نوێ ل سەدا بیستێ؛ ئەڤ خالە ژی دابەش دبیتە سەرڤان بابەتا:ـ

أـ زانستێ زمانەوانی و زانستێ کومەلایەتی.

ب ـ فردیناند دی سوسور (١٨٥٧ ـ ١٩١٣).

ج ـ پشتی (دی سوسور) ی.

سێ قوتابخانا بۆ نیاتگەری:ـ

أ ـ دامەزراندنا قوتابخانا بۆنیاتگەری‌یا ئەمێرکی.

ب ـ نوام چومسکی.

چار ـ پەراوێزو ژێدەر.

**ئێك ـ سەرهتایەك بۆ مێژوویا ڤەکولینێت زمانەوانی:ـ**

دەمێ دهێینە سەر بابەتێ (مێژوویا ڤەکولینێت زمانەوانی) پێدڤی‌یە ل بەراهیێ بهێینە سەر بەحسێ ولاتێ هندێ، کو ئێکەمین هەولدان بۆ ڤەکولینا زمانی ل وێرێ هاتیەکرن، ئەو ژی ل سەدا شەشێ (پ.ز) دابوو، ل سەر دەستێ زانایێ هندی (پانینی ـ Panini)، کو ئەڤ زانایە دمێژوویا نڤیسی‌دا دهێتە هژمارتن ئێکەمین زمانەوان و ژەهژی گوتنە بێژین ئەڤ زانایە ل دائیرا مەعارفێت بەریطانی‌دا یێ هاتیە وەسفکرن کەڤنترین رێزمانڤانێ دیار ل جیهانێ[1].

(پانینی) ئێکەمین ڤەکولینا زمانەوانییا گەهەشتی ل سەر زمانێ سانسکریتی پێشکەش جیهانێ کر، ڤەکولینا ڤی زانای ژی یا پێکهاتی بوو ژهژمارەکا پێناسێت تایبەتی‌و شرۆڤەکرنا چار هزار یاسایێت رێزمانییێت کورت ل سەر زمانێ سانسکریتی ـ کو کتێبا ئایینیا وانا پیروز (ڤیدا) پێ هاتبوو نڤیسینێ ـ، هەر دوێ ڤەکولینێ دا (پانینی) گرفتارێت جوراو جورێت دەنگی‌و سینتاکس (صرف)ێ چارە سەرکرن و هەولدا پەیکەرەکێ ـ هیکل ـ جێگیر بۆ رێزمانا زمانێ سانسکریتی ئاڤاکەت، ئەوژی دا خەلك بشێن سرودێن ئایینی بشاوایەکێ رەوان دەربیبرن. ژبەر ڤێ چەندێ (پانینی) یێ هاتیە هژمارتن ئێکەمین کەس هەولدای ل رێزمانا زمانەکی بڤەکولیت[2].

ژەهژی گوتنە، پشتی (پانینی) چ دەنگێت دی دمەیدانا زمانی دا بلند نەبوون هەتا ل یونانێ زانستەك پەروەردە بووی بۆ ڤەکولینا راستێیت زمانی‌و ئەو زانست ژی دڤان هەرسێ قوناغادا بوری[3]:ـ

**قوناغا ئێکێ:ـ**

ل دەسپێکرنا ڤەکولینێت زمانەوانی ل ولاتێ یونانی ڤەکولەرا پیتە بلڤەکی ژ لڤێت زانیاریا زمانی کر ئو دگوتە وی لڤی (رێزمان ـ Grammar)، ئەڤ رەنگێ ڤەکولینا ژی بۆ جارا ئێکێ ل دەڤ یونانیا پەیدابوون و پشتی وان فەرەنسیا ژی ئەڤ رەنگێ ڤەکولینا بۆ خۆ ژوان گرتن، ئەڤ زانستێ پەیدابووی بهلاڤێکێ پشت ب زانستێ لۆجیکی‌ڤە (علم المنطق)د بەست، ژەهژی گوتنە ئەو ڤەکولین دزانستی نەبوون و د تایبەتی نەبوون

ـو فەكولينـا زمـانى، بەلكى ئارمانجا وان (ڤەكولينا) دياركرنا لايەنێت ـ ستىو چەوتى بوو دزمانىدا هەروەها ئەو ڤەكولين دبەرتەنگ و سنور ـ رو بيڤانـ ـ معـارى ـ بوون، ئانكو ل دوى سەليقێ بوون و گەلەك د ـوير بز. يێت راست و دروست ژ بۆ خۆياكرنا راستيێ[4].

**قوناغا دووێ (قوناغا فيلولوژى):ـ**

فردينان دى سوسور (١٨٥٧ـ١٩١٣) د وانێت خۆدا دبێژيت:ـ قوتـبخانەكا (فيلولوژى ـ زانيارێيت زمانى ـ فقه اللغه)[5] هەر ژكەڤندا ل ئەسكەندەريێ هەبوو، بەلێ ناڤ لێنانا (فيلولوژى) باهرا پتر جارا د دانته سەر وێ بزاڤا زانستيا ل سالا (١٧٧٧ز) ل سەر دەستێ زانا (فردريك ئوگست ولف ـ Wolf Friedrich August)ى دەستپێكرىو ئارمانجا ڤێ نە تەنهـ زمان بوو، بەلكى ل گەل ڤێ بزاڤێ زانايێت فيلولوژى گرنگيەكا زۆر ـ تێكستێت نڤێسيێت كەڤن، و هەروەها ئەو تێكست شروڤەو ئادەكرن. هەر ئەڤ تشتە بۆ پالدەرەك بۆ خۆدانێت وێ بزاڤێ، كو پيتەى بمێژوويا ئەـمێو داب و نەريت و ياسـايێت كومـەلايەتىو ئايينىو...هتد بدەن، ئەوان زانا شێوازێت رەخنەى دڤەكولينێت خۆدا بكارئينان و ئارمانجا وانا سەرەكى ژ ڤەكولينا هەمى ئارێشێت زمانەوانى بەراوردكرنا تێكستان بوو، ئەو تێكستێت ددەمێت جياوازدا هاتينە نڤێسين، ئەڤ بەراوردكرنە ژى زبـەر هنـدێ بوون دا زمـانێ تايبـەتێ هەر دانەرەكى ژدانەرێت وان تێكستان بزانن، هەروەها بۆ شيكاركردن و شروڤەكرنا چەڤەنگێت هندەك زمانێت كەڤنێت شێواو ئالووز (غامض) بوون، ئەجهێ گومانێيە ئەگەر بيـژين، ڤان ڤەكـولينا رێك بۆ (زانستێ زمانەوانێ مێژوويى) خۆشكر، وەكى ئەو ڤەكولينا (رتشل ـ Ritchl)ى ل سەر (پلوتس ـ Plautus)ى كرى، كو ئەوژى پشكەك بوو ژڤەكولينێت زمانەوانى. بەلێ رەخنا فيلولوژى، ئانكو بكارئينانا شێوازێ رەخنەيى دڤەكولينێت فيلولوژىدا لەنگيەكا مەزن يا هەى، ئەوژى ئەوە، كو ئەوان رەخنەگرا تەنها پشت بزمانێ نڤێسى دبەست وگرنگيا خۆ هەمى د دانا سەر زمانێ يونانى ـ گريكى ـ ولاتينيێ كەڤن[6].

**قوناغا سێ:ـ**

دەمێ زانـايـا دياركرى كو جێدبيت زمان ل گەل ئێك دوو بهێنە بەراوردكـرن وى دەمى قونـاغـا سێ دەستپێكر، و ئەڤ دياركرنا هەنێ سەرەتابوو بۆ گەشەسەندنا (فيلولوژيا بەراورد ـ فقه اللغه المقارن ـ Comparative Phiology)و ل سالا (١٨١٦) زانا (فرانزبون ـ Franz Bopp)ى كتـێبـەك بنـاڤێ (ژ پێرەوێت سينتـاكسى د سانسكـريتێ دا ل گەل هەڤبـەريـەكێ بۆ هندەك پێرەوێت سينتاكسى دزمانێت ئەلمانىو گريكىو لاتينىو فارسىدا ـ في نظام تصرف اللغة السنسكريتية ومقارنته بالانظمة الصرفية المعروفة في اللغات اليونانية واللاتينية والفارسية و الجرمانية ـ

über das kom ugationsystem der sanvkritorpache in Vergleichung raitenera der griechischen, lateinischer, persischer ( und hermanicher sprache

بەلاڤكـر و (بـوب) نە ئێكەمين زانابوو لايەنێت وەك هەڤى دناڤبەرا ڤان زمـانـادا دەستينشان كرين و رێژيا وان هەميا بريە سەر سەرچاوەكى (نژادەكى ـ رێژگەهەكى)، بەلكى بۆ ڤێ چەندێ روژهەلاتناسێ ئنگليزى (وليـەم جونـز ـ W.Jones) ئەوێ ل سالا (١٨٩٤)ێ مرى، ل پێشيـا (بوب)ى بوڤێ چەندێ چوو بوو، كول سالا (١٧٨٦)ێ تێبينى ل سەر ڤى بابەتى بەلاڤ كربوون، بەلێ تێبينيێت (جونز)ى دبەرتەنگ بوون و هندێ ناگەهينن كو زانايا هەست بگرنگيا بەراوردكرنا زمانا كربوو ل بەرى سالا (١٨١٦)ێ، و دسەر هندێ را كو شانازى بۆ (فرانزبوب)ى نازڤريت د ديـاركرنا پەيوەنديێ دناڤبەرا زمانێ سانسكريتىو هندەك زمانێت دێيت ئوروپىو ئاسياوىدا، بەلێ ئەوا ژهەژى گوتنە زانا (بوب)ى هەست كر كو بەراوردكرنا ئەوان زمانێت دچنە سەر سەرچاوەكى دشـێت ببيتە بابەتەك ژ زانستـەكێ سەربەخۆرا، چونكى چ زانا بەرى (بوب)ى د شروڤەكرنا زمانەكىدا پەنا خۆ نەبربوو بەر زمانەكێ دى دا شێوێ وى زمانێ ل بن ڤەكولينێ بهاريكاريا وى زمانێ دىتر ئاشكەرا بكەت.

ل ڤێرێ تشتەكێ دى يێ هەى دڤێت بێژين: هەمى گومان بۆ هندێ دزڤرن كو پەيداكرنا وى زانستێ نوێ دوى دەمێ كێم دا كارەكێ ژشيانا (بوب)ى مەستـر بوو ئەگـەر بەرى هينگێ زمـانێ سانسكـريتى نەهـاتبـايە شروڤەكرن و لێكدان. سانسكريتى پشتەڤانا سێيێ بوو ل گەل لاتينىو گريكيێ كو (بـوب)ى دڤـەكـولينـا خۆدا پشت پێ بەستى. د سەرڤێ چەندێرا هنديكە زمانێ سانسكريتىيە هندەك سەخلەتێت (سيفەتێت) ديار يێت هەين كو چاكترين رێنە بۆ بەراوردكرنێ ل گەل زمانێت دىتر، بۆ نمونە ئەگەر شێوێت پەيڤا لاتينى (generis, genus, generum genera, genere..) ..هتد بەراوردكەين ل گەل شێوێت گريكى (genei, geneos, genos, geneon, genea..) ..هتد دڤێ بەراوردكرنێدا ئەم ناگەهين چو ئەنجاما. بەلێ ئەگەر شێوەكێ سانسكريتى ل گەل ڤان شێوا زێدەبكەين دێ ئەنجامەك بومەهێتە گورێ بۆ نموونە (ganasan, ganasu, ganasi, ganasas, ganas..) ..هتد دبەرێخۆدانەكا سەرپێدا بوڤان شێوێت بوورى دێ لايەنێت وەك هەڤى دشێوێت گريكىو لاتينىدا دياربن، ئەگەر بۆ نموونە پەيڤا (ganas) دگـريمـانا خۆدا دانين كو ئەڤە قوناغا ئێكێيەو شێوێ ئێكێيە ئەڤ پێنگـاڤـە دێ شروڤـەكـرنێ ئاسان كەت و ئەم دێ شێين ئەنجامێ ڤێ بەراوردكـرنێ زانـين كودشێـوێت زمـانێ گريكى دا دەنگێ (s) چەند كەفتبيتە ناڤبەرا دوو دەنگێت بزوێن (العلة و الحركات ـ Vowels) يێ كەفتى.

پشتى هينگێ هەر دوان كاودانـادا ئەوێت مە باسكرين ئەم دێ شێين

گەهینە ئەنجامەکی کو دەنگێ (s) ژی دلاتینیێدا یێ بوویە (r) کەواتــە ژلایێ سینتــاکس ڤە شێـوێت سانسکـریتی رەگن و یەکەیەکا جێگیرو سنووردارن و دزمانێ گریکیو لاتینێ ژیدا دقۆناغێت سەرەتایی دا ئەڤ شێوە هەر هەبوون. هۆسا بهایێ سانسکریتێ دڤەکولینێت بەراورد دا دیار دبیت، هەروەها وەکی مە دنمونا پێشین دا خۆیا کری کو هەمی دەنگێت (s) دزمانێت هندو- ئوروپیدا یێت پاراستین. ل ڤێرێ خالەکا دی ژی هەیە دڤێت روون بکەین کو جهێ گومانێ نینە زمانێ سانسکریتی دپاراستنا هەمی سەخلەتێت دێیت زمانێ دایکێ دا سەرکەفتی نەبــوویــە. بۆ نمــونــە: پێرەوا بزوێنــا تێــدا هاتیــە گوهۆرین گوهۆرینەکا تەواو، و لگەل هندێ ئەو تۆخمێت رەسـەنێت زمانێ سانسکریتی پاراستین ژ بۆ ڤەکولەرا بهایەکێ تایبەتی هەبوو[٧].

هەر ل دەمەکێ نێزیك بۆ وێ مێژوویێ هژمارەکا زانایێت دیار دەرکەفتن و هەر ل وێ رێ چوون ئەوا (بوپ) لێ چووی و ئێك ژوان زانــا (جــاکــوب گریم ـ Jacob Grimm) بوو: دانــەرێ ڤەکولینێت جێرمــانی، کو کتێبــەك بنــاڤێ (رێـزمانا ئەلمانی) دنــاڤبــەرا سالێت (١٨٢٢و ١٨٣٦)ێ دا بەلاڤکر، هەروەها زانــایەکێ دی ژوان زانا (پوت ـ Pott) بوو، ئەڤ زانایە ژی ،ڤەکولینا (نژادێ پەیڤا ـ ئیتمولۆژیا) یێ رابوویەیدا بوون و ئاشکەرا بوونا زانستێ ئیتمولۆژیا (پوت)ێ کەرەستەکا زۆر ژ زانیاریا دەربارەی پەیڤا پێشکەش زمانەوانا کر، هەروەها زانا (کـوهن ـ Kuhn)ی ژی ل (زانستێ زمـانەوانی) و (زانستێ ئەفسانێ ـ یێ بەراورد ـ)
ـ میتولۆجیا ـ ڤەکولا، هەروەها هەردوو زانا (بنفی ـ Benfy) و (ئوفرخت)ی پسپۆری د ڤەکولینا زمانێ هندیدا پەیدا کر.

ل دومــاهیێ، ئەڤــان زانــایێت دێ باسکەین: ئەڤ قوتابخانە بدومــاهی ئینا. وەکی، (ماکس مولر ـ Max Muller)ی و (دی کیرتیوس ـ G.curtius)ی و (ئوگست شلایشر ـ ١٨٢١ـ ٨٦٨ ـ August Sheicher)ی، کو هەر ئێك ژڤان هەرسێ زانا بڕیکێ تایبــەتی تێکۆشا بۆ پێشکەفتنا ڤەکولینێت بەراورد، بۆ نمونە: (مــاکس مولر)ی هاریکاریا ڤەکولینێت بەراوردکر دگەنکەشەو ڤەکـولینێت خۆییێت ل سالا (١٨٦٩) دا بەلاڤکــرین (وانــە ژ زانستێ زمانەوانی ـ Lessons in the science of Language) لڤـێرێ ژ هەژی گۆتنــە بێژین، کو زانایێ بناڤ و دەنگ (دی سوســور ـ ١٨٥٧ـ١٩١٣) دەربارەی (ماکس مولر)ی گۆتیە: ئەنگیا (ماکس مولر)ی دهندێدا کۆم دبێت کو دڤەکولینێت خۆدا هەست ببەرپسیاریێ ناکەت ژوی تشتێ دنڤیسیت[٨]، هەروەها (کـیرتیـوس) ژی زانــایەکێ بەرز بوو دزانستێ (فقه اللغة ـ فیـلولۆژی) دا و ناڤ و دەنـگـیــان خۆ ل سالا (١٨٧٩)ێ دەرئێخست بکتێباخۆ (Grandzuge der griechischen Etumologie ـ زاسنتێ فیلولۆژیێ بەراورد ـ علم فقــه اللغــة المقــارن)، (کـیرتیـوس) زانــایێ ئێکیـە ژ زانایێت قوتابخانا فیلولۆژیا بەراورد کو دووزانست: (زانستێ فیلولۆژیێ بەراورد ـ علم فقه اللغة المقارن) و (زانستێ فیلولۆژیێ کلاسیکی ـ علم فقه اللغة الکلاسیکی) پێکڤە کومکرین، و (زانستێ فیلولۆژیێ کلاسیکی) بتــەماشە کرنەکا بێ گومان هاریکاریا پێشکەفتنا زانستێ نوێ تر (زانستێ فیلولۆژیێ بەراورد) کر، ڤێرێ ژهەژی گۆتنــە بێـژین هەر قوتــابخــانــەك ژڤــان هەردوو قوتابخانێت مەباسکرین ئانکو (یاکلاسیکیو یا بەراوردا نوێ) ژ پاشگەز بوونا خۆ بەرامبەر یا دی دترسا. ل دوماهیا قوتابخانا فیلولۆژیا بەراورد دێ باسێ زانــا (ئـوگست شلایشر)ێ کەین، کو ئەڤ زانــایــە ئێکـەمــین کەس بوو هەولدای ئەنجــامێ وان هەمی ڤەکـولینێت بەلاڤ دچارچویڤەکیدا ـ قالبەکی ـ کۆم بکەت و

کتێبا وی:ـ

(Compendium der Vergleichenden Grammaticle der in-)
dogermanischen

(١٨٦١ـ١٨٦٢) رێـك و پێـك کرنــەکە بۆ وی زانستێ (بوپ)ی ئینایە مەیـدانێ، وئەڤ کتێبا (شلایشر)ی دەمەکێ درێژ خزمەتا ڤەکولەرا کر، هەروەهــا ئەڤ کتێبــە باشتــرین نمــونــەیە بۆ هێلێت یانایێت قوتابخانا (زانستێ فیلولۆژیێ بەراورد ـ علم فقه اللغة المقارن)و ئێکەمین بەشە ژ مێـژوویــا (زانستێ زمــانێت هنــدو- ئوروپی). هەرچەندە بێی گومان شانازی بۆ قوتابخانا (زانستێ فیلولۆژیێ بەراورد) دژڤریت دخویاکرنا لقەکێ نوێو بەرهەمدار ژ لقێت زانیاریێ، بەلێ ئەڤ قوتابخانە دناڤا کرنا زانستــەکێ زمــانــەوانیێ راست و دروست (علم اللغة) دا سەرنەکەفت چونکی زانــا ڤەکولین ل سەر وی بابەتێ لێ ڤەدکولا (ئانکو زمانی بخۆ)

بپشت گوهێ خوڤە هاڤێتبوون و ئەڤەژی پێنگاڤەکا بنەرەتی‌یە دەەر زانستەکێ‌دا و بێ‌ی ڤێ پێنگاڤێ چو زانست نەشێن شێوازێ خو دڤەکولینێ دا دیار بکەن[٩].

زانایێ بناڤ و دەنگ (فردیناند دی سوسور) دوانێت خودا (المحاضرات) رەخنێ ل زانایێت (زانستێ فیلولوژیا بەراورد) دگریت و دبێژیت :- چەوتیا ئێکێ یا زانایێت (زانستێ فیلولوژیا بەراورد) کەفتینێ، بو ئەگەرا هندێ کو ڤەکولەر بکەڤنە ناڤ چەوتیێت مەستر، و دڤەکولینێت خودا (ئەوێت ل سەر زمانێت هندو- ئورووپی بتنێ کرین) قەت پسیارا خو نەکر کا ژ بو چ (بوان بەراوردیا رابوینەو گرنگیا وان پەیوەندیێت گەهەشتینێ دناڤبەرا وان زماناندا ژ بو چی‌یە)، ئانکو بکورتی شێوازێ ڤەکولینێ ل دەڤ وان زانا تەنها بەراوردکرن بوو، و لایەنێ مێژوویی نەدگرتە خو، وەکی ئاشکەرایە بەراوردی یا پێدڤی‌یە بو هەر رەنگەکی ژ رەنگێت دووبارە ئاڤا کرنا مێژوویا زمانەکی، بەلێ بەراوردی بتنێ ژی نابیتە پالڤەدەرەکێ چالاك بو گەهەشتنا ئەنجاماو ئەو تشتێ گەهەشتنا ڤان ئەنجاما بزەحمەت تر لێ ئێخستی دیتنا زانایێت (زانستێ فیلولوژیێ بەراورد) بوو بو گەشەکرنا دوو زمانا، چونکی ئەڤ دیتنە ل دەڤ وان زانا وەکی بەرێخودانا زانایێت سروشتێ بوو بو گەشەکرنا دوو رووەکا، بو نمونە - شلایشر- ی دگوت :- دڤێت هەمی دەما دەستپێکرن ژ زمانێ هندو - ئورووپی یێ ئێکی دەست پێ بکەت، ولڤێرێ (شلایشر) وەکی زانایەکێ مێژوویی بو دچیت و بێ‌وپاش نابیت دەمێ دبێژیت؛ دەنگێ (e)و (O) د گریکیێ‌دا دوو پلەنە (درجتان - Stufen ) دپێرەوا بزوێنادا (قانون الحرکات)، ئانکو ل ڤێرێ بەرێخودانا (شلایشر)ی وەکی بەرێخودانا زانایەکێ، رووەکێ‌یە دەمێ پلە پلە ل دوی گەشەکرنا دوو رەووەکا دچیت،

هوسا (شلایشر)ی ژی گەشەکرنا زمانا پلەدار دانا (واتە پلە ل دوی پلێ زمان گەشەدکەن). ئاخافتن هێشتا یا (دی‌سوسور)ی‌یەو دبێژیت :- دەمێ بەرێ خو ددەینە چەوتیێت زانایێت (زانستێ فیلولوژیێ بەراورد) ژ لایەنێ شێوازی‌ڤە، بو مە دیاردبیت ئەڤ چەوتیە دبێ مفا (قازانج) نینن، چونکی چەوتیێت هەرزانستەکی هێشتا دقوناغا بچویکینیێ‌دا وێنەکێ مەزنن بو وان چەوتیێت ڤەکولەر دقوناغێت سەرەتایی‌دا دڤەکولینا خویا زانستێ‌دا دکەڤیتێ. هەروەسا هەتا سالا (١٨٧٠)ێ زانایێت زانستێ فیلولوژیێ بەراورد دەست بڤەکولینا ئەوان بیروباوەرێت ڤەژینا زمانا پێڤە دهێتە گرێدان نەکر، وپشتی ڤێ مێژوویێ ژی دەست هاڤێتە تەماشەکرنا رووێت وەك هەڤ دناڤبەرا زماناندا، کو ئەڤ تشتەژی لایەنەکێ بتنێ‌یە ژدیاردا زمانەوانی، و بەراوردکرن ژی تەنها شێوازەکە یان رێیەکە بو دووبارە ئاڤاکرنا راستیێت زمانەوانی، واتە هەتا وی دەمی زانیێت (زانستێ فیلولوژیێ بەراورد) (دیاردا زمانەوانی- الظاهرة اللغوية) بتەڤایی کو هەمی رووێت زمانی بگریت نەڤەکولا[١٠].

ئەو زانستێ ڤەکولینێت زمانەوانیێت دروست و ڤەکولینیێت زمانەوانیێت بەراورد دانایین جهێ وانێ ژهەژی، رەنێت وی بو ڤەکولینا زمانەنێت رومانسی (فەرەنسی - ئیطالی - ئیسپانی - پرتگالی - رومانی)و زمانێت جێرمانی دزڤریت، و مێژوویا ڤەکولینێ ل زمانێت رومانسی ژی ل سالێت (١٨٢٦-١٨٣٨)ێ ل سەر دەستێ زانا (دیاز - Dies ) ی دەستپێکر دکتێبا وی دا (گراماتیکا زمانێت رومانسی - قواعد اللغات الرومانسية)، کو دوێ کتێبێ‌دا زانا (دیاز)ی ل زمانێ لاتینی ڤەکولا بوو ل دویڤ ئاخافتنا گوڤەرێت هێشتا خەلك پێ دئاخڤن ،و ئەو هەولا (دیاز)ی دای ئێکەمین هەولێ بوو کو زانایەك بو ڤەکولینا خو ژ زمانێ نڤیسینێ دەرکەڤیت بو سەر (زمانێ ئاخافتنێ - اللغة المحكية). ڤان ڤەکولینا (زانستێ زمانەوانی) نێزیکی ئارمانجا وییا دروست کر، ژهەژی گوتنە بێژین کاودانێت زانایێت زمانێت رومانسی دباشتر بوون ژکاودانێت زانایێت زمانێت هندو - ئورووپی ئەو ژی ژبەر ڤان هەردوو ئەگەرا ئێکێ :- چونکی زانایێت زمانێت رومانسی دزمانێ لاتینیێ‌دا دشەهرەزابوون و هەروەسا زمانێ لاتینی زمانێ دایکێ‌یە بو زمانێت رومانسی. ئەگەرا دووێ :- هژمارەکا زور ژ تێکستا بدەست زانایێت زمانێت رومانسی کەفت. بهاریکاریا ڤان هەردوو پالڤەدەرا (عاملا) زانایێت زمانێت رومانسی شیان بشێوەکی ئاشکەرا گەشەکرنا زاراڤێت (دیالێکتێت) رومانسیێت جوراو جور ئاشکەرا بکەن، هەروەسا ڤان هەردوو پالڤەدەرا هاریکاریا هندێ کر کو زانا کێم پشت بتشتێ گوترەو گومانێ ببەستن و چارچویڤەکێ جێگیرو بهێز بو ڤەکولینا زانستی دانن. هەروەسا ئەڤ تشتێ مەدیارکری ژبو زانایێت زمانێت جێرمانی ژی راستە؛ هەرچەندە ئەڤ زانایە وەکی زانایێت زمانێت رومانسی نەشیان بشێوەکێ راستەخو ڤەکولینێ ل ئێکەمین زمان بکەن، ژبەر ڤێ چەندێ ڤان زانا پەنا خو برە بەر وان تێکستێت زورێت ل سەر زمانێت جێرمانی هەین؛ ئەڤان تێکستا هاریکاریا زاناکر دا کارلێکرنا مێژوویا وان زمانا بزانن ئەوێت دچنە سەر زمانێ جێرمانیێ ئێکێ دناڤبەرا چەند چەرخادا، هەروەسا زانایێت زمانێت جێرمانی ژ زانایێت هندو - ئورووپی بێت سەرەتای (الاوائل) چێتر شیان نێزیکی راستیێ ببن و گەلەك ئەنجام ژی بدەست خوڤە ئینان.

ل سالا (١٨٧٥)ێ زانایێ ئەمریکی (وتنی - Whitney ) ئەوێ دهێتە هژمارتن کو ئەو ژی ئێکە ژ پێشەوایێت (الرواد) زانستێ زمانەوانی کتێبەك دانا بناڤێ (ژیان و گەشەکرنا زمانی - حياة اللغة و نموها- Life and grouth of Langugge )، ژهەژی گوتنە بێژین د سەردەمێ ڤێ زانای‌دا بیروباوەرێت (دیاز)ی پتر گەشەسەند و پشتی ڤێ مێژوویێ بدەمەکێ کێم (رێزمانڤانێت لاو- النحويون الجدد - Jun ggrammatiker ) بدامەزراندنا قوتابخانەکێ رابوون، و پێشەوایێت وێ قوتابخانێ هەمی ژ ئەلمانا بوون و ژوان زانا بو نمونە، (کەی بروکمان - K. Bragmann ) و (ئێچ. ئوستوڤ - H.osth off ) زانایێت زمانێت جێرمانی (دبلیو. براون - W.Braune ) (ئی.

سیڤرز ـ E.SieVers ) (ئێچ. پوول ـ ool ) و زانایێ زمانێت سلاڤی (لیسکین ـ Leskien ) و هندەکێت دی بوون، خالا ژ هەمیاگرنگتر یا ڤان زانا دیارکری ئەو بو، کو ئەنجامێت ڤەکولینێت بەراورد دچار چویڤەکێ مێژوویێ ل باردا (مناسب) دانان، هوسا ئەڤ زانا راستێت زمانەوانی پێکڤە گرێدان گرێدانەکا سروشتیو شانازی، بو وان دزڤریت کو ئێدی ڤەکولەر تەماشەی زمانی نەکەن کو زمان (کائن)ـ مکێ ئەندامی‌یەو ب وێنەکێ سەربەخو گەشە دکەت مینا گەشەکرنا رووەکا، بەلکی زمان ئەنجامێ (مێشکێ کومەلەکی)یە (عقل جماعي). هەروەها(رێزمانڤانێت لاو) هەلەو لەنگێت ڤەکولینێت فیلولوژییێت بەراورد دیارکرن. ل دوماهیێ دسەرڤێ چەندێ هەمیێ را کو (رێزمانڤانێت لاو) گەلەک خزمەت دبوارێ زمانەوانیدا پێشکەشکرن، بەلێ هەتا هینگێ ژی ب دروستاهی روناهی نەکەفتە سەرهەمی ئاریشێت زمانەوانی هەتا سەرەتا سەدێ بیستێ، ئانکو ل ڤێ مێژوویێ بیرێت گەهەشتییێت زانایێ سویسریێ بناڤ و دەنگ (فردیناند دی سوسور ـ ١٨٥٧ ـ ١٩١٣) بەلاڤەبوون و شنویکا (زانستێ زمانەوانی) یێ راست و دروست شەنگستێت خوێیت سەرەکی چکلاندن و ژڤەژی گوتنە ئەگەر بێژین، باهرا پتر ژوان رێبازێت (دی سوسور)ی دانایین هەتا نهو ژی دڤەکولینێت زمانەوانییێت نویدا ل کارن.

دوو:ـ

**(زانستێ زمانەوانییێ نوی ل سەدێ بیستێ):ـ**

١ـ زانستێ زمانەوانیو زانستێ کومەلایەتی:ـ

٢ـ فردیناند دی سوسور (١٨٥٧ ـ ١٩١٣):ـ

٣ـ پشتی (دی سوسور)ی :ـ

**١ـ زانستێ زمانەوانیو زانستێ کومەلایەتی:ـ**

هەروەکی د (خالا ئێکێ)دا ژڤێ ڤەکولینێ هاتیە دیارکرن، کوزمانەوانا هەر ل سەرەتا سەدێ نوزدێ بزاڤەکا مەزن کرو هەتا دوماهییا وی سەدەی دبەردەوام بوون کو ڤەکولینێ ل زمانی بکەنە کارەکێ هویرو (عەمەلی)، ئەو هەمی بزاڤێت وان زانا هەر ل دویڤ وان رێو رێبازا بوون ئەوێت دزانستێت وی دەمیدا دهاتنە بکارهاتن. بو نموونە زانا (ئوگست شلایشر)ی تیوریێ خو دگەشەکرنا زمانیدا ـ التطور اللغوي ـ ل دویڤ وان بیرو رێبازێت (دارون)ی دکتێبا خودا (اصل الانواع)دا بکارئینایین وی ژی هەر ئەو رێباز دڤەکولینێت خودا بکارئینان ـ ئانکو وەسانێ تەماشەکرە گەشەکرنا زمانی مینا گەشەکرنا گیانەوەرا ـ .

هەروەها بو نموونە (رێزمانڤانێت لاو ـ Jun ggrammatikr ) دڤیا بنگەهێ گەشەکرنا زمانی مینا بنگەهێ گشتیێ گەشەکرنا زانستێت سروشتی لێ بکەن کو ئەڤ بنگەهە هەمی تاکا ڤەگریت و چ ژێدەرکەتن ژوی بنگەهێ گشتی نەبەشن. هوسا بومە دیار دبیت کو ڤەکولینێت زمانی ژی ژ ئەنجامێ دەنگڤەدانا بیرێت بەلاڤێت وی دەمی بوون و ئەوان بیرا هەتا رادەکێ کار ل زمانەوانا کرو زمانەوانا ژی بدەورێ خو سود ژوێ دەنگڤەدانێ وەرگرت.

هەر ب وێ رێکا مە بەحسکری زانایێ بناڤ و دەنگ (فردیناند دی سوسور)ی سود ژکارێت زانایێ کومەلایەتیێ فەرەنسی (دورکایم ١٨٥٨ ـ ١٩١٧)ی وەرگرت و باوەری بریبازێ وی ئیناو ل دویڤ وێ رێبازێ (دورکایم)ی دزانستێ کومەلایەتیدا دانای (دی سوسور)ی ژی هەر ب وێ رێکێ بنگەهێ ڤەکولینا زانستیا زمانی ل سەرەتا سەدێ بیستێدا دانا. ژڤەژی گوتنە زانستێ کومەلایەتی ژی هەر ل سەرەتا ڤی سەدەی ـ ئانکو سەدێ بیستێ ـ رێکا سەربەخویا خو ژ زانستێت دیێت مروڤایەتی وەرگرت و زانایێ کومەلایەتی (دورکایم)ی دەورەکێ مەزن دڤی چەندێدا هەبوو، ئو ڤی زانای ئاشکەراکر کو زانستێ کومەلایەتی بەشەکێ جودایە ژ (زانستێ دەروونی ـ علم النفس) بەلکی زانستەکێ سەربەخویە چونکی ئەڤ زانستە ژی مینا هەر زانستەکێ دی ل کومەلەکا دیاردێت تایبەتی ـ الظواهر ـ دڤەکولیت و چ زانستێت دیتر پەیوەندیو بەشداری دوان دیاردا دا نینە، هەروەسا (دورکایم)ی دیارکر کو زانستێ کومەلایەتی زانستەکێ جودایەژ زانستێن دیتر و بێ دویرە ژوان رێبازێت ڤەکولەر ل سەر ڤێربوین کو ئەڤ زانستە ل دویڤ رێبازێت زانستێت دیتر دهاتە تویژاندن و گەلەک جارا ئارمانج ژوێ ڤەکولین و تویژاندنێ چارەسەرکرنا گرفتێت کومەلایەتی نەبوو بەلکی ژبو ئارمانجەکا دی دبوو.

(دورکایم)ی بنگەهێت تیوریێت زانستێ کومەلایەتی دانان، هەروەها سنور ژی بو ئەوان یاسا دانان؛ ئەو یاسایێت پێدڤیە پسپور دڤە کولینێت کومەلایەتیدا پەیرەوا وان بکەن و ژێ دەرنەکەڤن. (دورکایم)ی ئەڤ مەسەلە دکتێبا خودا (بنگەهێت رێباز دزانستێ کومەلایەتیدا ـ قواعد المنهج في علم الاجتماع) ئاشکەرا کرن، هەر ل گەل وێ چەندێ دیار کر، کو دڤێت دیاردێت کومەلایەتی بهێنە ڤەکولین ڤەکولینەکا زانستیانە، ئو دا ئەڤ ڤەکولینە دزانستیانە بن دڤێت سنوورێت هەر ڤەکولینەکێ بهێنە دیارکرن و رێکا سەرەکیا گەهەشتنا تەڤ ئارمانجێت وی زانستێ نوێ ل دەڤ (دورکایم)ی زانینا دیاردێت کومەلایەتی بوو، ئانکو دیاردێت کومەلایەتی ـ الظواهر الاجتماعية ـ بابەتێ سەرەکیێ وی زانستێ نوی بوون ـ زانستێ کومەلایەتی ـ. دیار دێت کومەلایەتی ژی مینا کارێت کومەلایەتی نە، مینا (خەرج کرن ل زاروان و پەروەردەکرنا زاروان و چاڤدێریا دەیبابان و ...هتد)، ئەڤە هەمی کارن و دیاردێت کومەلایەتی‌نە و یان ئول ـ ئایین ـ یان داب و نەریت یان (عورفەک) یان یاسایەک سنورەکی بو داتنیت . چونکی رویدانێت بابەتی هەبوونەکا ژدەرڤەی هەستێت تاکە کەسا یا هەی ـ ژبەر هندێ ئەڤ دیاردە نە ژچێکرنا تاکە کەسەکی‌نە، بەلکی تاکە کەسان ژ وێ کومەلێ دناڤدا رابوین وەرگرتینەو

نابێت چەوت بهێنە گۆتن یان بکارهاتن، هەروەها ئەڤ دیاردە نەژ ئەنجامێ بیرەکا نوێ - تاکی - هاتینە چونکی کومەڵەکی ئەڤ دیاردە بسەر تاکە کەسادا چەسپاندینە، هەرچەندە زۆربەی جارا تاکە کەس هەست بوێ د ێدانێ ناکەن، چونکی بحوکمێ راهاتنێ هەر تاکە کەسەك ئێکسەر ل ن وێ دیاردێ بەرسڤداره و ئەگەر ئەڤ دیاردە دبابەتی بن و هەبوونا وان ژی دسەر هەستێت تاکە کەسان دابیت -؟ کەواتە ڤەکولینا وان دیاردا ژی دێ بیتە ڤەکولینەکا زانستیانەو ل دوی چوونا وان ژی دێ بیتە ل دوی چوونەکا تەواو، هەروەکی ل دوی چوونا زانایەکێ سروشتی بۆ ڤەکولینا دیاردێت سروشتی، کانێ چەوا ل دیاردێت سروشتی دڤەکولیت ڤەکولینەکا زانستیانە[11].

**٢- فردیناند دی سوسور- (١٨٥٧-١٩١٣):-**

**أ- کورتیەك ژ ژینا (دی سوسور)ی:-**

فردینان دی سوسور، ئێکە ژبناڤ و دەنگترین زانایێت زمانەوانی ل سەرەتا سەدێ بیستێ. (دی سوسور) ل سالا (١٨٥٧)ێ ل باژێرێ جنێڤ هاتیە دونیایێ ژبنەماڵەکا ناڤدار بئەدەب و زانیاریێ.

خاندنا خۆ تمام کریەو باوەرناما دکتورا ل سالا (١٨٨٠)ێ ژ زانکوا لایبزك وەرگرتیە، پشتی وەرگرتنا باوەرناما دکتورا ئانکو ژسالا (١٨٨١)ێ هەتا (١٨٩١)ێ ل زانستگەها خاندنێت بلند ل پاریس بکارێ دەرس گۆتنێ رابوو. وپشتی وێ مێژوویێ ئانکو ژسالا (١٨٩١)ێ هەتا (١٩١٣)ێ بۆ مامـوستـایێ زمـانێت هنـدو - ئوروپی و سانسکریتی هەروەها ژسالا (١٩٠٧)ێ هەتا (١٩١٣)ێ ماموستایێ زانستێ زمانەوانی بوو.

(دیسوسور) هەتا سالا (١٩١٣)ێ - وێ سالا تێدا چوویە بەر دلوڤانیا خودێ - ل سەر کارێ خۆ دەرس گۆتنێ ل زانکوا جنێڤ یێ بەردەوام بوو. ئەڤی زانای دجهێ خۆ یێ بەرزدا بەرێ خۆ نەدابوو بەلاڤکرنا بەرهەمێ خۆ، بەلکی ئارمانجا وی یا سەرەکی دامەزراندنا قوتابخانەکا زمانەوانی بوو، (دی سوسـور)ی بسـاخیا خۆ تەنها کتێبەك بەلاڤکر دژیێ (٢١) سالیێدا، بناڤێ: (Memoire Surle System Primitif des Voyelles – dans Les Langue – europeannes) (ملاحظات حول النظام البدائي للعلل في اللغات الهندو - اوروبية) ل سالا (١٨٧٨)ێ ل پاریس بەلاڤەکر. بەلێ بناڤ و دەنگترین کتێب ئەوا ناڤێ وێ هەلگرتی پشتی مرنا وی کتێبا وی (محـاضرات في علم اللغة العام - Coursde Linguistic general - واتە ژ زانستێ زمانەوانیێ گشتی) بوو. ئەڤ کتێبە ژی یا پێکهاتییە ژکومەڵەکا وانـا (موحازرا) ل سەر بابەتێ زانستێ زمانەوانیێ گشتی، کو هەردوو قوتـابیێت وی (چـارلس بالیو ئەلبـرت سیکـاهی) پشتی مرنا وی یێت کۆمکرین و کرینە کتێبەك و چاپا ئێکێ ژوێ کتێبێ ل سالا (١٩١٦)ێ دابوو ئوچاپا دووێ ل سالا (١٩٢٢)ێ بوو[13].

**ب - بیرێت (دی سوسور)ی دەربارەی ڤەکولینێت زمانەوانی:-**

وەکی هاتیـە ئاشکـەراکـرن، کانێ چەوا زانـایێ کومـەڵایـەتی (دورکـایم)ی دیـاردێت کومەڵایەتی کرنە بنگەهـ و بنیات بۆ ڤەکولینێت زانستی دزانستێ کومـەڵایـەتیدا، (دی سوسور)ی ژی ڤیا ڤەکولینێت زمانەوانی بکەتە کارەکێ زانستیانە. بۆ ڤێ چەندێ (دی سوسور)ی سود ژ بیرێت (دورکایم)ی وەرگرت کانێ چەوا (دورکایم)ی سنوور بۆ بابەتێت ڤەکولین و رێکێت ڤەکولینێت کومەڵایەتی دانابوون، (دی سوسور)ی سود ژوان بیرا هەمیـا وەرگـرت؛ کەواتـە زمان ل دەڤ (دی سوسور)ی مینا دیاردەکا کومەڵایەتی لێهات و ئەگەر زمان دیاردەکا کومەڵایەتی بیت دڤێت ڤەکـولینا وی ژی مینا ڤەکولینا دیاردێت کومەڵایەتی بیت، ل دویڤ ڤێ دیتنێ مروڤ دشێت بەرێ خۆ بدەتە زمانی کو زمان تشتەکێ جودایە ژ رەنگێت بکـارئینـانا وی ل دەڤ تێکرا تاکە کەسان و ژبۆ روونکرنا ڤێ چەندێ؛ ئەم زمانی ژتاکە کەسێت وێ کومەلا ل دەوروبەرێ خۆ وەردگرین و ئەوژی ژمە وەردگرن و ئەم ژهەڤ دوو فێردبین، - بڤێ دەربرینێ - زمان نەبەرهەمێ ئێکی ژمەیە، بەلکو زمان دیاردەکا گشتییە ل هەر کومەلاکا دیارکریدا و ئەو کومەلا دیارکری ژی زمانەکێ تایبەتی بسەر ئەنداميت خودا د سەپینیت (فـەرزدکەت)و وەرگرتنا ئەنداميت وێ کومەلێ بۆ وی (زمانێ تایبەتی)یێ ئەو یێ دئاخڤن نەکارەکێ (ئختیارییە)، بەلکی وان ئەنداما چ پێکۆهۆر ل شوینا هندێ - ئانکو وێ زمانی - نین و کومەل وی زمانی دبوارێت جۆراو جۆردا بسەر وان ئەندامادا دسەپینیت.

بۆ نمـونـە:- دەمێ زارو دمـاڵێدا ژنـوی هی زمانی دبیت یان دەمێ ل قوتـابخانێ فێردبیت وی دەمی ئەوزارو ب وێ هیبوون و فێربوونێ یێ ئاگەهدار نینە، بەلێ فێربوونا زمانێ وێ کومەلا دناڤ دا دژیت ل سەر وی وەکی تشتەکێ (فەرز) لێ دهێت[12].

هۆسـا (دی سوسور)ی دیارکر کو زمان دیاردەکا کومەڵایەتییەو مروڤ دشێت لێ بڤەکولیت ڤەکولینەکا زانستیانە، ئو ئەڤ ئارمانجە ژی دێ هێتە دیتن دەمێ مروڤ بسـەربەخۆی ل زمانەکی دڤەکولیت دویر ژ روویێت وییێت کت کتەو ل دویڤ چوونێت وییێت تاکە کەس.

هەر ئەڤ خالە (دی سوسور)ی ئاشکەرا تر لێ کر دەمێ (ئاخافتن و زمان) ژێك جودا کرین و سەخلەتێت هەر ئێکی ژوان دیارکرین.

**١- ئەزمان و زمان و ئاخافتن - اللسان و اللغة والكلام:-**

دەمێ ئەم دیـاردێت زمانەوانی د دەینە ناسکرن، کو ئەو دیاردە بابەتێ زانستێ زمانەوانییە دڤێت ل سنوورێ ڤان هەرسێ زاراوا راوەستین:-

**أ - ئاخاڤتن - Laparol :-**

ئاخـافتن ژ گشت و شەو پێکهـاتنێت (تـەرکیبێت) ژ ئەنجـامێ لڤلڤین و پێ رابوونا ئەنداميت دركاندنێ - اعضاء النـطق - پەیـدا دبیت و پێك دهێت، یان بدەربرینەکا دیتر،

ئاخـافتن ژ گشت دەربـڕینێت هەلبـژار تەبێت تاکـە کەسێت کومەڵەکێ دیارکری پێك دهێت. ل دویف ڤێ پێناسێ ئاخافتن ناهێتـە هژمـارتن ژدیـاردێت کومەلایەتی؛ چونکی ئاخافتن ب تەواوی بەرهـەمـەکێ تاکـە کەس و هەستیێ یە ئو وەکی دڤێ ڤەکولینێ دا هاتیە دیارکرن کو (دیاردا کومەلایەتی نەکارەکێ تاکە ـ کەس و هەستیێو سەربەستە بەلکی کارەکێ گشتیێ یەو تاکە کەسێت کومەڵەکێ دیارکری پێڤە دبەند کرینە بەندکرنەکا تەواو (پێڤە دگرێدانیە)[١٤].

ب ـ زمان ـ La Langue :ـ

زمان پێڕەوەکە ـ سیستەمەکە ـ ژنەوەکی ـ جیلەکی ـ بۆ نەوەکێ دی دهێتـە ڤەگـوهـاستن، ئەڤ پێڕەوە یا پێکهـاتیـە ژکومەڵەکا نیشان و یوولە گراماتیکا ـ سیگنالێ و سیغێن ڕێزمانی ـ، کو ئەوانا ژی خۆ جهبوونەکا جێگیرو چەسپاو نینە.

ج ـ ئەزمان ـ Language :ـ

ئەزمـان دیـاردەکـا گشتیێـە و ژوان هەردوو توخمێت (عـونصرێت) پێشـین (ئاخافتن و زمان ـ الکلام واللغة) پێك دهێت، ژ بەر ڤێ چەنـدێ (دی سوسـور) ئەزمانی بدیاردەکا کومەلایەتیا خوری ـ خالص ـ ناهژمێرێت، چونکی وەکی هاتیە ئاشکـەراکرن ئەزمان دوو لایەنا ڤە دگریت؛ ئێك لایەنێ تاکە کەس (ئـاخـافتن ـ الکلام) دوو لایەنێ کومەلایەتی (زمان ـ اللغة) ئو ئەگەر توخمێت تاکە کەس (ئاخافتنێ) ژ ئەزمانی دویر بێخین وێ دەمی بەس دێ توخمێت کومەلایەتی مینن واتە تەنها (زمان) دێ مینیت، کەواتە ل دویف پێناسێت (دی سوسور)ێ (زمان ـ اللغة) ئەزمانە پشتی ئاخافتن ژێ دهێتە دویر کرن.

تشتـەکێ ئاشکـەرایـە دەمێ کومـەڵ مە دئێخیتە ژێر یاسـایێت زمـانێ وێ دەمی توخمێ تێك گەهەشتنێ ـ عنصر التفاهم ـ یێ هاوبەش ل ناڤبەرا مەهەمیادا ئەڤی کاری ژبۆمە بسـاناهی دئێخیت، هەر ژبەر ڤێ چەندێیە هەر رستەکا یان دەربرینەکا تاکە کەسێت کومەڵێ مە بێژن ئەم تێ دگەهین ئو هەروەها هەر تشتەکێ ئەم ژی بێژین ئەو تێ دگەهن.

ئەڤ لایـەنێ مە دیارکری لایەنێ کومەلایەتیێ یە دزمانێ دا ئو ئەڤ ل هەڤ دووگـەهـەشتنـە ژی دهێتـە بجهئینـان دەمێ پێکڤـەگـرێـدانەکا (عورفیا) زمانی دناڤ کوسەڵەکێ دا دهێتە بجهئینان یان بدەربرینەکا دی دەمێ ئەم هەمی خۆ ب ئەوان یاسایاڤە گرێد دەین ئەوێت (عورفەکی) ل سەر مە سەپاندین ـ فەرزکرین ـ و دبیت گەلەك جارا مە هایژ گرێدانا خۆ ب وان یاسایاڤە نەبیت بەلێ دهندەك دەلیڤادا مروڤی ئێکسەر هایژ ڤێ گرێدانێ دبیت وەکی دەمێ کەسەك دەربرینەکێ یان رستەکێ ل دویف وێ یاسـایێ دمیشکێ مە هەمیادا هەی نەبێژیت و گوهۆرینەکێ یان چەوتیەکێ بێخیتێ. بۆ نمونە:ـ ئەڤ گرێدانە ل دەڤ زارویا ئاشکەرایە دەمێ ژنۆی هی زمانی دبن یان دەمێ دەربرینەکێ یان رستەکێ بکاردئینن و روییێ وێ یێ دروست نەزانن.زمان ل دەڤ (دی سوسور)ێ مینا مێشکێ کومەکیێ یە ـ العقل الجمعي ـ هەروەکی ل دەڤ (دورکایم)ێ، کو بئاوایەکێ سەربەخۆو تەواو ل دەڤ چ تاکە کەسا نینە، ئانکو هەر تاکە کەسەکێ بسەر کومەڵەکا تایبەتی زمان یێ هەی و هەمی دەما ئەو تاکە کەس بزاڤێ دکەت کو ئاخفتنا وی ل دویف ئاخفتنا کومـەلا وی بیـت، بەلێ چ جار ئەڤ کریـارە سەدا سەد ناهێتەبنەجهکرن بنەجهکرنەکا تەواو ئو ل دوماهیێ ئەڤ تاکە کەسـە نەشـێن دبنـە جهکـرن و چەسپاندنا ئەوان یاسایادا دجێگرین و ئەو یاسا ژی ل دویف وێ چەندێ بپێی مێژوویێ دهێنە گوهارتن.

هەروەها (ئاخافتنێ) گەلەك رویێت بکارهاتنێ هەنەو هەتا نهو چ زانستێت وەسا نەهاتنە مەیدانێ کو بشێن ل هەمی رەنگێت ئاخافتنێ بڤەکولن، چونکی رەنگێت ئاخافتنێو پەیڤ و دەربرین و رستا (د هەر زمانەکێدا) هژمارتنا وان نینەو چ رێك ژی بۆ ڤی رەنگێ ڤەکولینا نینن، بەلێ ئەو رێکێت (ئەو یاسایێت) پەیڤ و دەربرین و رستە ل سەر دهێنە دانان مروڤی شیان هەیە لێ بڤـەکـولیت؛ ژبـەر ڤێ چەنـدێ ڤەکـولینێت زانستی دهـەر زمـانـەکیدا دکەڤنە سەر ئەوان نمونێت ئاخافتن ل پەی وان دهـێن یان بدەربرینەکا دی، ئاخافتن ل سەر ئەوان یاسایێت دمێشکێ مە هەمیادا هەین دهێنە دروست کرن و ژوان نمونا ـ یاسایا ـ :ـ

بکەر + فرمان + تەواوکەر

ئەڤ وێنێ پێشین نمونەیە ـ یاسایە ـ و وێنێ ئاخافتنێ ژی ئەڤەیە:ـ فەرهاد + چوو + ئامێدیێ

ئەڤ رستا مەبۆ نمونە ئینای ژوی یاسایێ پێشین را نمونەکە ژ ژمارەکا بێ دووماهیا رستا ژوی یاسایی‌را و هۆسا ئەم دشێین ژمارەکا زۆر رستا ل سەر وی یاسای بینین بێی گرفتاریەك یان ... بکەڤیتە رێکا مە و هەر هۆسانێ بۆمە دیاردبیت کو یاسا یەکـەو رستـە ـ نمـونە ـ دبێ هژمارن، ژبەر هندێ پێدڤی‌یە دڤەکولینێت زمانەوانی‌دا ـ یاسا ـ بهێنە ڤەکولان نەکو رستە، هەروەها ل ڤێرێ تشتەکێ دی ژی یێ هەی بۆ نمونە ئەو رستا مەئینای دەمێ دهێتە دەربرین ل دەڤ ژمارەکا تاکە کەسا، وی دەمێ ژمـارەکا دەربرینێت جوراو جۆر دیاردبن کو ژمارا وان هنـدی ژمـارا وان تاکە کەسایە ئەوێت ئەو رستە دەربری. ل دومـاهیێ بومـە دیـاردبیت کو چ رێ بۆ ڤەکولینا وان وێنێت بجهئینان و دەربرینێت تاکە کەس نینن، کەواتە دڤێت ڤەکولین ل سەر زمانی بهێنە کرن نەکو ل سەر ئاخافتنێ ئو زانا (دینین) دکتێبا خۆدا :ـ

( An Introdution to general Linguistics ـ دەرگـەهـەك بۆ زانستێ زمـانـەوانێی گشتی) گرنگتـرین جودابیێت ئاخافتنێ ژزمانی جودا دکەن دڤان خالادا دیار کرینە :ـ

١ـ ئاخافتن چالاکیەکا تاکە کەسی‌یە (رویدانێت تاکە کەسی‌نە)، هەروەهـا ئاخـافتن یا جوراو جورەو تێکەلەو نۆی‌یەو چ جارا (یەکەیەکا) ـ الوحدة ـ ئاخافتنێ ناهێتە دیتنێ یان بدەربرینەکا دی ناهێتە پەیداکرن، ژبەر ڤێ چەندێ ئاخافتن بۆ ڤەکولینێت زانستی دەست نادەت.

٢ـ ئەگـەر ل تشتـەکی بڤەکولین ڤەکولینەکا زانستیانە دڤێت بابەتەکێ دیارکری (سنوردار) هەبێت دابشێین سەر ژمێرەکێ ـ احصاء ـ بۆ گشت پارچێت وی بکەین و ئێك ئێکە شرۆڤەبکەین ئو هەروەکی دیاربووی کو ئاخافتن چالاکیەکە تاکە کەس پێ رادبن، ئەڤە ژی هندێ دگەهینیت کو ئاخافتن چالاکیەکا بێ سنـورە ـ و ئەگـەر چالاکیەکا بێ سنوربیت ـ مروڤ نەشێت سەخلەتێت وێ چالاکیێ دیاربکەت ژبلی ئەگەر ئەو سەخلتدان سەخلەتدانەکا بێ سنور بیت، هەلبەت ئەڤ کارە ژی دشیانا مروڤی‌دا نینە.

٣ـ ئاخافتن رێکەکا کۆمکری نینەو هەمی وێنەو دیاربو نێت وێ دتاکە کەسی نەو وەکی ئێك نینن و دومختی نە (سەرب وێ کاڤا ئاخـافتنێ نە) ئو ل دەمێ کۆمکرنا رویدانێت تاکە کەس ئەم دشێــین ئاخـافتنێ ل دەڤ هەمی تاکـە کەسـا دڤی نەخشێ بەیانی‌دا دیار بکەین :ـ

(١ + ١' + ١'' + ١''' + ....)

٤ـ .. بەلێ زمـان بپێچـەوانەی ئاخافتنێ نمونەکا کۆمکری‌یەو ئامیرەکێ هاوبەشە ل ناڤبەرا گشت ئاخفتنکەرادا و ل دویف ڤێ چەندێ ئەم دشێین زمانی دڤی نەخشێ بەیانی‌دا دیاربکەین :ـ

(١ + ١ + ١ + ١ + ...) = ١

٥ـ زمان بشێوێ کۆمەکا وێنێت دەربرینێت خرڤەکری (مختزن) دمێشکێ هەمی کەسادا هەیە، وەکی کۆمەکا فەرهەنگێت وەك هەڤە ل دەڤ هەرکەسەکی ئو دسەر هندێ‌را کو ل دەڤ هەر کەسەکی هەیە هەروەها ئەڤ فەرهەنگە یا هاوبەشە ل ناڤبەرا هەمی کەســادا. بەلێ ئارەزوێت تاکـە کەســا چ کار ل سەر گوهۆرینا وێنێت وێ فەرهەنگێ ناکەن.

٦ـ زمان بەرهەمێ کۆمکریێ (خۆیەتیا فێربوونا زمانی‌یە ـ الملكه اللغوية ـ یە)، هەروەها زمان کۆمەکا ئێکگرتی‌یە ژ (عورف) و نەریتاکو دەستەکەکا کۆمەلایەتیا دیارکری وان (عورف)و نەریتا پەروەردە دکـەت و رێکێ ژی ددەتـە بکارهاتنا وێ (خۆیاتیا فێربوونا زمانی) کو بهێتە مەیدانێ.

٧ـ زمان نیشانەکا ـ سیگنالەکا ـ خرڤەکریە ـ علامة مختزنة ـ و هەر کەسەك ژکەسێت کو ئەوی زمانی بکار دئینن دکومەلەکێ دیارکری‌دا وان نیشانا ژێك دوو فێردبن ئو ل دویف ڤێ چەندێ (زمان) بتەواومتی‌و هەردەم هەیەو هێزا خۆ ژی هەردەم هەیە، بەلێ ئاخافتن ل دویف کریارێ‌یە ئەگەر کریار هەبیت ئەوژی هەیە، یان بدەربرینەکادی ئەگەر رویدان هەبیت ئاخافتن ژی دێ هەبیت.

٨ـ زمان کۆمەکا داب و نەریتایە مروڤ بشێوەکێ دروستکری ـ جاهـز ـ ژ دەستێ (جیلێ) پێش خۆ وەردگریت، ئو هەروەکی دیارە زمان ژی تۆشی هژمارەکا گوهۆرینێت گەلەك بچویك دبیت کو وان گوهۆرینا دەورەکێ گرنگ دڤەکولینێ‌دا نینەو ڤەکولەر وان گوهۆرینا دڤەکولینا خۆدا بپشت گوهێ خۆڤە دهاڤێژیت و وەسا بەرێ خۆ ددەتێ هەروەکی هەبوونا خۆ نەی، بەلێ ئاخافتن تۆشی گوهۆرینێت مەزن و بێ دوماهی دبیت کوڤەکولەر نەشێت

بپشت گوهێ خوّڤه باڤێژیت یان ژبیربکەت ـ یتجاهلها ـ"[15].

ل ڤێرە دێ هێینە سەر بەحسێ (دی سوسور)ی کو دڤیا زمـان بهێتـە ڤەکولین ڤەکولینکا زانستیانە، ئو ژێك جود اکرنا ئاخافتنێ ژزمانێ ئێك بوّ ژکارێن وی ئینایە مەید انێ د ا ڤەکوّلەر بشێن سنورەکی ژبوّ ڤەکولینێت خوّ د انن، هەلبەت ئەڤی تشتی هاریکـاریـا (دی سوسـور)ی بخـوّ ژی کر کو بزانیت کانێ پێـدڤیـیـە ڤەکـولینێ لسەر کیژ لایەنێ بکەت وگیژلایەنێ دی نەکـەت. کەواتـە وەکی هاتیە دیارکرن پێدڤییە زمان ـ نەکو ئاخافتن ـ بهێتە ڤەکولین، چونکی زمان بریتیە ژکوّمەکا نیشانێت ـ سیگنـالێت ـ زمـانییێت کومەڵ لسەر رێك کەفتی ئو کوّمەکا یاسایا ـ یولە گراماتیکا ـ ئەوان نیشانا رێك و پێك دکەت، ژبەر ڤێ چەندێ دەمێ ڤەکولەر ڤەکولینەکێ ل سەر زمانەکی دکەت پێدڤییە وێ ڤەکولینێ ل سەر نمونەو یاساییێت وی زمانی بکەت نەکو ل سەر دەربرینێت تاکە کەس بکەت ـ ل سەر ئاخافتنێ ـ نمـونێت زمـانی ژی ل دویڤ بورینـا وەختی دجێگـیرن و دهـەستێت هەمی تاکـە کەسێت کومـەڵەکێ دیارکریدا یێت هەین، ئەگەر ئەو نمونە بهێنە گوهوّرین گوهوّرینا وان گەلەك یا ل سەر خوّو هێـواشەو ئەم دشێین بێژین یا جێگیرەو ڤەکولەر دشێت ڤەکـولینـەکـازانستیـانە ل سەر بکەت. هەروەها (دی سوسور)ی نمونێت زمانێت ئاشکەرا ژوێ ڤەکولینا زانستییانە ئەوا نەلسەر بنگەهێ وێنێت دەربری ـ صور منطوقة ـ دهێتە کرن پێشکەش کرن. ئەڤە ژی ئەو کارێت مەزن بوون ئەوێت (دی سوسور)ی دڤەکولانا زمانێت مریدا کرین.

**٢ـ ڤەکولینێت زمانێت هەڤچەرخ و ڤەکولینێت مێژوویی ـ**
الدراسات المتعاصرة والدراسات المتعاقبة للغة:ـ

(رێزمانڤانێت لاو ـ النحویون الشباب) ل وێ باوەرێ بوون کو ڤەکولینا زانستی بوّ زمانی، دڤێت تەنها ڤەکولینا وییا مێژوویی بیت. (دی سوسور) ل گەل ڤێ باوەرێ نەبوو ئو ئەوی وەسا بەرێ خوّدا کومەلا (رێزمانڤانێت لاو) کو ئەوانا زێدە خوّ بڤـەکـولینـا زمـاناڤە دچاخێت بوریدا ـ زەمانێت بوریدا ـ گرێدایە، هەتا وێ رادێ کو ئەوانا خوّ ژڤەکولینا پێرەوێت زمانێت هەڤچەرخ بتەواوی دویر ئێخستیە.

بوّ ڤێ چەنـدێ (د. عبـد الرحمن ایـوب) گوّتنـا (دی سوسور)ی دڤان هەرسێ خالادا دیاردکەت:ـ

١ـ دویر ئێخستنا ڤەکولینێت زمانەوانی ژ دور هێلی چالاکییێت ئاخفتنکەرێت هەڤچەرخ.

٢ـ گرێدانا پالڤەدەرێت مێژوویی ـ العوامل التاریخیة ـ بسەر هنـدەك (حـوکمێت) پەیـوەندی بزمانێت هەڤچەرخ ڤە هەی. ژهـەژی گوّتنـە هژمـارتنا مێژوویی بوّ راستییێت زمانەوانی ل دویڤ دیتنـا ئاخفتنکـەرەکێ دنـاڤ بارەکێ زمانیێ جێگیردا دئاخڤیت هەبوونا خوّ نینەو ڤەکولەر دشێت ڤەکولینا خوّ ل سەر زمـانێ ئاخفتنکـەرەکی بکەت بێی تشتەکی ژ رابردوییێ ویێ زمانی بتەواوی بزانیت.

٣ـ ڤەکـولینێت بەراورد چ پێشکـەشی زمـانەوانا نەکر زێدەی کومـەڵەکـا گریمانا ل سەر وان زمانێت ڤەکولین ل سەرهاتینە کرن، ئو ئەو ڤەکولینێت هوّسا ژبەر وێ ئەگەرا مە دیار کری هەمی دەما دبەرێنگاری چەوتییێو (تەشویشێ) بوون[16].

دڤی چارچویڤەیدا (دی سوسور)ی پەسنا وشەتاشێت ـ النحاة ـ لاساگەر کر ئەوێت زمان سەخلەتدا ی سەخلەتدانەکا خوّری، هەروەهـا پەسنـا وان وشەتاشا کر ئەوێت راستییێت دیترێت ژئەنجامێ بورینا زەمانی پەیدابوین تێکەل نەکرین. ل ڤێرێ (دی سوسور) چ ژبهایێ ڤەکولینێت مێژوویێت زمانەوانی کێم ناکەت بەلێ وی دڤێت سنورێت هەر رێبازەکی جودا بهێنە دیارکرن دا ڤەکولینێت هەر رێبازەکی رێکا خوّیا دروست بگرن و دهویرو ئاشکەرابن.

ڤەکـولینێت مێـژوویی (المتعاقبة ـ Diachronic) بوّ زمانەکێ دیـارکـری واتا سەخلەتدانا گەشەکرنا مێژوویییا وی زمانی ددەن ل دویـراتیا زەمانی ـ عبر الزمن ـ. هەروەها ڤەکولینا مێـژوویـیـا هەر زمـانـەکی دڤێت ل گرفت و چارەسـەرێت گەشـەکـرنـا وی زمـانی بهێتە کرن هەر ژکەڤنترین قوناغێت ناسیارێت توّمارکریێت وی زمانی هەتا ڤی دەمێ نهو، یان ئەو زمـان بهێتـە ڤەکولان دقوّناغەکا هەلبژارتییا سنوردارا، بڤی شێـوێ خارێ... بوّ نمـونە ڤەکولینا زمانێ عەرەبی ژ سەرەتا نەخشێت عەرەبی بوّ عەرەبیـا چاخێ (جـاهـلی) بوّ عەرەبیـا دەرکـەفتنـا ئیسـلامێ ـ صدر الاسـلام ـ هەتـا دەمێ نهـو ڤەکولینەکا مێژوویییە ـ Diachronic ـ هەروەها ڤەکولینا زمانێ

عەرەبی ل ناڤبەرا دوو قوناغا ژقوناغێت ناڤبری‌دا ڤەکولینەکا گران و زورە ـ بزەحمەتە ـ .

ڤەکولینا هەڤچەرخ یان وەسفی ـ Synchronic ـ واتە (وەسفکرنا) دوخەکێ تایبەتی‌یە بو زمانەکێ تایبەتی‌و دەمەکێ ـ فترة ـ دیارکری ژچاخەکی ـ زەمانەکی ـ. بو نمونە ڤەکولینا زمانێ کوردی دچاخێ نهودا ڤەکولینەکا هەڤچەرخە (وەسفی‌یە ـ متعاصرة ـ Synchrnic ـ، ل ڤێرێ یاڤەرە بزانین کو ڤەکولینێت هەڤچەرخ نە تەنها ژبو ڤەکولینا زمانێت زندی نەبەلکی ڤەکولینێت هەڤچەرخ ژبو ڤەکولینا زمانێت مری ژی دهێنەکرن. بو نمونە، ڤەکولینا زمانێ ئاشووری دناڤ وان تێکستێت تومارکری‌دا ل دەمەکێ دیارکری‌دا ئەوژی دچیتە ناڤ مەیدانا ڤەکولینێت هەڤچەرخ، هەرچەندە ڤەکولینا زمانێت مری بو ڤەکولەری بزەحمەت ترە ژڤەکولینا زمانێت زیندی‌و زمانێت دهێنە بکارهاتن دئاخافتنێ‌دا، ژ هەژی گوتنە ڤەکولینێت هەڤچەرخ بو ڤەکولەرا بساناهی ترن، چونکی ل دەمێ پێدڤیاتیێ ڤەکولەر پەنا خو دبەنە بەر وان کەسێت بئەوی زمانی دئاخڤن و یاسایێت وی زمانی ژدەڤێ وان کەسا دگرن و تومار دکەن. زانایێت زمانەوانی وەها دبینن کو رویدانێت مێژوویی چ پەیوەندی ب ڤەکولینا زمانی برمنگەکێ تایبەتی‌و دقوناغەکا تایبەتی‌یا زمانی‌داو دچاخەکێ دیارکی‌دا نینن. بو نمونە، پەیڤا (سیارة) دزمانێ عەرەبی‌دا بەرێ دگوتە هژمارەکا مروڤا، بەلێ نهو عەرەب دبێژنە ئامێرەکێ بو هاتن و چوون و ڤەگوهاستنێ بکاردهێت (سیارة)، ل ڤێرێ نەپێدڤی‌یە دڤەکولینێت زمانەوانی‌دا دەمێ ئەم بەحسێ پەیڤا (سیارة) دکەین بێژین ل بەرێ ئەڤ پەیڤە دگوتە فلان تشتی و نهو دبێژنە فلان تشتی، هەڵبەت ئەڤ تشتێ هاتیە دیارکرن ژبو ڤەکولینێت زمانەوانیێت زانستی‌یە[١٧].

**٣ـ ڤەکولینێت هەڤچەرخ و پیڤانی ـ**
**الدراسات الوصفیة والمعیاریة:ـ**

گرنگترین جودایا دناڤبەرا ڤەکولینێت زمانەوانیێت هەڤچەرخ و پیڤانی‌دا هەی ئەو بوو کو دەمێ ڤەکولەرەکی دڤیا ڤەکولینەکا زمانەوانیا هەڤچەرخ ل سەر (زمانەکێ تایبەتی یان ژکومەڵەکا تێکستێت زمانەکێ تایبەتی) بکەت، دا ل دویڤ بەرێخودانا خویا راستەوخو بو وی زمانی هەمی ـ سەخلەتێت وی دیارکەت و ڤەکولینا خو ل سەر وان تێبینیێت خرڤەکرین ئاڤا کەت دویر ژهندێ کو ڤەکولەری (حوکمێ) خو یێ تایبەتی دانابایە سەرلایەکی ژلایێت وی زمانی‌و گوتبا؛ ئەڤ لایەنە یێ راستە یان یێ چەوتە یان یێ جوانە یان یێ کرێتەو.... هتد. ئارمانجا ڤەکولینێت پیڤانی ـ معیاری ـ ژی دانانا ژمارەکا یاسایا بوو بو زمانەکی کو کارێ وان یاسا دوی زمانی‌دا ئەو بوو راستیەکێ دیاربکەن، ئەو ئەو راستیا کوپێدڤی‌یە ل ئەنجامێ دوماهیێ گەهشتینێ بکار بینن هەروەها چەوتیێ ژی دیار بکەئەو چەوتیا پێدڤی‌یە بهێتە دیارکرن و وازلێنان. بەلێ ئەڤ تشتێ هاتیە دیارکری چ جارا ژبو هویەکا زمانەوانی‌یا خوری روینەددا و باهرا پتر جارا ئەڤان جورە رویدانا دزمانەکێ وەسادا رویددا کو وی زمانی پایەیەکێ ـ جهەکێ ـ ئایینی یان (سیاسی) یان کومەلایەتی ل دەڤ ڤەکولەرا هەبا. بو ڤێ چەندێ (دی سوسور) خویا دکەت؛ کو ژلایێ پێکهاتنا دەنگاڤە دەنگێت هەر زمانەکێ تایبەتی بو وی زمانی دراستن ئو هەمی زمان ژلایێ پێکهاتنا دەنگاڤە دتێرن و پێویستیا خو پردکەن. هەروەها (دی سوسور)ی تەئکید ل سەرهندێ کریە کو ڤەکولەر ڤەکولینێت هەڤچەرخ و پیڤانی دانانا پیڤانێت پێدڤی‌یە دائاخافتن یا دروست بێت و دروست بهێتە بکارئینان.

ڤەکولینێت هەڤچەرخ ل سەر (یەکە ـ وحدە ـ)و پەیوەندیێت دناڤبەرا زمانی‌و دورهێلی‌دا هەین دهێنە کرن ئو چ ئەو پەیوەندی دمێژوویی بن یان دهەڤچەرخ بن ـ متعاصرة ـ.

ڤەکولینێت پیڤانی ژی ئارمانجەکا (عەمەلی) هەیە، ئەوژی فێرکرن وگرێدانا خەلکی‌یە ب وان رێک و دەربریناڤە ئەوێت دهێنە هژمارتن کو دراستن و قەدەغەکرنا وان رێکایە ئەوێت دهێنە هژمارتن کو دچەوتن[١٨].

**٣ـ پشتی (دی سوسور)ی:ـ**

ل سالا (١٩١٦)ێ، ئانکو سێ سالا پشتی مرنا زانا (دی سوسور)ی دوو قوتابیێت وی (چالیس بالی‌و ئەلبرت سیکاهی ئەوێت ل دوماهیێ بوینە تاگرێت وی وانێت وی (بیرێت وی) دکتێبەکێ‌دا، بناڤێ (وانە ژزانستێ زمانەوانیێ گشتی ـ Cours

de Linguistic generar )بەلاڤەكرن و ژئەنجامێ بەلاڤبوونا وان بیرا بزاڤا (بزوتنەوا) زمانەوانیا نوێ ل جیهانێ دەستپێكر، بەلێ دڤێت دەستێ بۆ هندێ رابكێشین كو بیرێت (دی سوسور)ی ل جیهانێ دەنگڤەدانا خۆیا دروست نەدیت هەتا پشتی دەمەكێ درێژ دوو زانایێت مەزن ل ئێكەتیا سوڤێت بسەر كویراتیا بیرێت (دی سوسور)ی هەلبوون، ئەڤ دوو زانایە ژی (ئەمیر نیكولای ترۆبتسكۆی ١٨٩٠ـ١٩٣٨) دانەرێ زانستێ فونولوژیا نوێ و هەڤالێ وی (رومان جاكۆبسن ١٨٩٦ ـ ١٩٨٣) بوون، پشتی ڤان هەردوو زانا بیرێت (دی سوسور)ی رونكرین بهایێ راست و دروستێ وان هزرو بیرا هاتە زانین و بەرێ زانا كەفتە كتێبا وی یا ناڤبری و وەرگێرانێت وێ ژ مانێ (فەرەنسی) بۆ سەر گەلەك زمانێت دی هاتنەكرن و ئێكەمین وەرگێرانا كتێبێ بۆ سەر زمانێ (یابانی) بوو هەرچەندە لوی دەمی وەرگێران بۆ سەر زمانەكێ ئاسیایی و چ پەیوەندی بزمانێت هندو ـ ئوروپی و جێرمانی و رومانسی ڤە نەی تشتەكێ كێم بوو.

پشتی بەلاڤەبوونا كتێبا (دی سوسور) ل گەلەك و لاتان، گەلەك گەنگەشەو رونكرن ل دوور مەرەم و واتایێت وێ كتێبێ هاتنەكرن و ژوان هزروبیرا گەلەك قوتابخانێت زمانەوانی سەرێ خۆ هلدا، وەكی (قوتابخانا جنێڤ) ل سالا (١٩٤٠)ێ، كونهو دبێژنێ (خەلەكا سوسیر) و ژسالا (١٩٤١)ێ وەرە گوڤارا وەرزیا گرنگ (كراسات سوسیر) دهێتە بەلاڤكرن. هەروەها ژ ئەنجامێ بیرێت وی (خەلەكا پراگ) و (خەلەكا كوپنهاگن) هاتنە دانان، هەروەها وان بیرا كارەكێ مەزن و كویر ل سەر دامەزراندنا (رێبازێ بونیا تگەری ـ المنهج البنيوي ـ Struc-turalism ) هەبوو، ئەڤەو ڤێ رێبازێ هاتیە مەیدانێ كارێ خۆ نە تەنها دبوارێ زمانەوانیدا هەبوو، بەلكی دگەلەك بوارێت زانستێت مروڤایەتییێت دی تردا هەبوو وەكی زانستێ ئەنترو پولوژیایێ و هەروەها ئەدەبی ژی.

سێ:ـ

**قوتابخانا بونیاتگەری:ـ**

ا ـ دامەزراندنا قوتابخانا بونیاتگەرییا ئەمێركی:ـ

ب ـ نوام چومسكی:ـ

**ا ـ دامەزراندنا قوتابخانا بونیاتگەرییا ئەمێركی:ـ**

پێدڤیاتییێت ژیانا خەلكی ل ئەمێركا بگشتی و پێدڤیاتیا وان بتایبەتی ڤەكولەر پالدان بۆ دانانا رێبازێت ل بار ـ مناسب ـ بۆ ڤەكولینا كومەلەكا مەزن ژ زمانێت نێزیكی وان ـ ئانكو زمانێت هندوێت سور ـ، چونكی ئەمێركی دپێدڤی ڤێ چەندێ بوون و ژیارا وان ل گەل وان میللەتا دخاستە هندێ، ژبەر ڤان ئەگەرا زمانەوانێت ئەمێركی تێكستێت جوراو جور ژ زمانێت وان میللەتا رێزكرن و تومارکرن، پشتی ڤێ كومكرنێ هەولدا رێك و یاساییێت پێكهاتن و دەربرینی دوان زمانادا بزانن ئو هەر ئەڤ تشتە بۆ پالڤەدەرەكێ بهێز كو رێبازێت (وەسفی) بئاوایەكێ رێك و پێك جهێ خۆ ل دەڤ ڤەكولەرا بگرن و پێش بكەڤن[19].

هەروەها دابرینا ئەمێركی ژ رەوشەنبیریا ئوروپی بشێوەكێ راستەوخۆ و بەردەوام ژبەر ئەگەرا رویدانا جەنگێت جیهانی، ئەڤە ژی ل گەل ئەوێت پێشبیێ بوونە پالپشتەك بۆ زمانەوانێت ئەمێركی كو هەتا رادەكێ رێبازێت خوییێت تایبەتی دبوارێ زمانەوانیدا هەبن، ئو ل دوماهیێ ئەو رێباز پێشبكەڤن، هەروەها ئێك ژهوییێت پێشكەفتنا ڤەكولینێت زمانەوانی ل ئەمێركا ئەوبوو كو كومەلەكا زمانەوانێت زیرەك پەیدابوون و هەتا رادەكێ ئەڤ زانایە ل ژێر كارلێكرنا بیرێت (دی سوسور)ی رابوون و سود ژبیرێت وی وەرگرت بۆ ڤەكولینێت خۆ. بڤی ئاوایێ هاتیە بەحسكرن ناڤێ هژمارەكا زانا ل ئەمێركا دیاربوو وەكی (ئەدوار سابیر ١٨٤٨ـ١٩٣٩)ی و (لیونێرد بلومفیلد ١٨٨٧ـ١٩٤٩)ی ئو شانازی بۆ (بلومفیلد)ی دژڤریت بۆ سەر ئێخستنا زانستێ زمانەوانیێ ئەمێركی ژناڤ ڤەكولینێت زمانەوانییێت ئوروپی، كو ئەڤی زانای سروشتەكێ تایبەتیدا زمانەوانییا ئەمێركی پشتی دانانا وی بۆ تیورێ (زمانەوانیێ تایبەتی)و (قوتابخانا زمانەوانییا ئەمێركی) ئەو قوتابخانا هاتیە نیاسین ب (قوتابخانا بونیاتگەرییا ئەمێركی)و كومەلەكا زمانەوانێت زیرەك سەرێ خۆ تێدا هلدای مینا زانا (بایك)ی و (زلیگ هاریز ١٩٠٩ ـ ....)ی ئو زمانەوانێ ژهەمیا ناڤدارتر سەرێ خۆ ل ڤێ قوتابخانێ هلدای و ژوان جودا بووی ـ انشق ـ لاوەكێ ئەمێركی بوو بناڤێ (نوام چومسكی) كو ئەڤی زانای سەركێشیا (رێبازێ گورینكاری) كر.

**ب ـ نوام چومسكی ـ Chomsky ـ ١٩٢٨ ـ...:ـ**

(چۆمسکی) ل سالا (١٩٢٨)ێ ل باژێرێ (فیلادلفیا) هاتیە دنیایێ و نهو ل ئەمێرکا دژیت ، ل سالا (١٩٥٧)ێ (چۆمسکی) ناما خۆیا بناف و دەنگ (پێکهاتنێت گراماتیکی - البنیٰ النحویة - Syntactic Structures ) بەلاڤکر ئو هەر دوێ نامێدا هژمارەکا بیرێت زمانەوانیێت نوێ پێشکەش کرن، ژهەژی گۆتنە ئەڤ کارێت (چۆمسکی) دهێنە هژمارتن مەسترین گۆهۆرین دمێژوویا زانستێ زمانەوانیێدا.

(چۆمسکی) پێنگاڤەکا مەزن ل سەر وان ڤەکولینێت زمانەوانییێت زانا ل بەری وی کرین هاڤێت ئەو ڤەکولینێت زمان بدیاردەکا گشتی دانایو ژمروڤی جودا کری، (چۆمسکی) بێچەوانەی وان زانا دیاردا زمانی ژمروڤی جودانەکرو ئاشکەراکر کو ئەڤ دیاردە بمروڤی ڤە یا گرێدایە گرێدانەکا پتەو تەواو، هەروەها ئەڤ دیاردە ل گەل مروڤییەو نابێت ژ چ لایێت دیڤە بهێتە تەماشەکرن (واتە دویر ژمروڤی نەهێتە تەماشەکرن)، هەر ئەڤەژی دبیتە ئەگەرێ کو باوەری ب چ کارلێکرنێت دیتر نەهێتەکرن دویر ژڤی کوژی و هەر ئەنجامەکێ دویر ژڤی بواری - مەجالی - دیاربیت دێ کێماسی تێدا هەبیت.

بۆ ڤێ چەندێ (چۆمسکی) دڤەکولینا خۆدا ل سەر کەرەستێت زمانییێت بهیستیو نڤێسی نەراوەستاو چەوتیا مەزن دڤی رەنگێ بەرێ خودانێ دا بڤی ئاوایی دیارکر؛ هەر مروڤەکێ تەواو بزمانەکی دئاخڤیت و دهەر گاڤەکێدا دشێت گەلەک رستا دەربریت و وەرگریت ژێ یان دژمارەکا بێ سنورا رستا بگەهیت ئەو رستێت ل بەری وی دەمی نەدەربرین یان نەبهیستین، ئەڤ کریارە هەمی دروست دبیت بێی مروڤ بدەتە هزار خۆ کو ژنۆی دەست پاڤێتە وێ کریارێ یان پێ رابیت. هەر ئەڤ تشتە بۆ ئەگەر هندێ (چۆمسکی) ڤێ بریارێ بدەت کو هەر کەسەکی شیانەک دجوانکاریا زمانیدا هەیەو هەر ئەڤ تشتەیە رێکێ بۆ وی کەسی خۆش دکەت بۆ دروستکرن و بهیستنا رستێت نۆیو ژنۆی هاتین دروستکرن کومێشتا بەری هینگێ نەبهیستین، هەروەها هەر ئەڤ تشتە بۆ (چۆمسکی) پالدای کومەلەکا پسیارا بهلشکێڤیت کو ل بەری وی دڤە کولینێت زمانەوانیدا نەهاتبوونە هلشکافتن دەربارەی کادێ چ دهزرا مروڤیدا رویدەت دەمێ رستێت زمانی دروست دبن یان مروڤ دوان رستا دگەهیت و ئەو پێنگاڤێت بیرێت - میشکی - نەهایژخۆییێت مروڤی - اللاشعوریة - ل گەل وان کارلێکرنێت زمانی پەیدا دبن چنە..! ئو پاشی کانێ پەیوەندیێا وان کارلێکرنا بروێدانێت زمانی ڤە چییە؟.

ئەڤ رێبازێ (چۆمسکی) ئینایە مەیدانێ دهێتە نیاسین ب (رێبازێ گۆرینکاری - رێبازێ بۆنیاتگەری)... هۆسا، ل سەر دەستێ (چۆمسکی)و هەڤالێت وی زانستێ زمانەوانی ژوی چارچویڤێ (دی سوسور)ی بۆ دانای (کو زمان دیاردەکا کومەلایەتییە) دەرکەفتە مەیدانەکا بەرفرەهتر، هەروەها ئەو پێناسا بناف و دەنگا بۆ زمانی هاتیەکرن (کو زمان دیاردەکا کومەلایەتییە) ل بەرچاڤێ زاناو پسپۆرێت زانستێ زمانەوانی بۆپێناسەکا سادەو ساکار وئێدی زمانەوانا باوەری بڤی رێبازی نەئینا.

ل گەل ڤێ چەندێ گیانەکێ فەلسەڤی جهێ خۆ دڤەکولینێت زمانەوانیدا کر، چونکی گریمانەکا سەرەکی دڤەکولینێت زمانەوانیدا پەیدابوو ئەوژی ئەو بوو: (کول دویڤ هەیاتیێا مێشکی زمان ژێ هەیە).

ئو هەر ژڤێ دەستپێکرنێ دڤی چاخیدا جارەکا دی سەرهلدانا بیرێت دیکارتی (النـزعـة الدیکـارتیـة) بسەر ڤەکولینێت زمانەوانیدا زال بوو[٢٠].

**(دوماهی)**

**چار :-**

**پەراوێزو ژێدەر :-**

**١- پەراوێز :-** ا - ژێدەرێت عەرەبیو وەرگێڕای سەر زمانێ عەرەبی.

**٢- ژێدەر :-** ب - ژێدەرێت ئنگلیزی.

**١- پەراوێز :-**

١- في علم اللغة ، غالب المطلبي ، ل ١٠.

٢- مدخل الى علم اللغة، محمد حسن عبدالعزيز، ل ٢٤٧.

٣- هەلبەت ئەڤ پێنگاڤە هەمی بەری وی دەمینە کو سنوور بۆ زانستێ زمانەوانی بهێنە دانان.

٤- محاضرات في علم اللغة العام ، فردينان دی سوسور، ل ١٩.

٥- سەیدا عەلائەددین سەجادی زاراوێ (زانینی کروکی زمان) بەرامبەر (فقه‌اللغة - فیلولۆژی) بکارئینایە، دگۆتارا خۆدا (زانینی کروکی زمان ل ٢٧، گۆڤاری کوڕی زانیاری کورد، ژمارە (٥)، سالا ١٩٧٧.

٦- محاضرات في علم اللغة العام، فردينان دی سوسور، ل ١٩

٧- هەمان ژێدەر، ل ٢٠-٢١.

٨ـ هەمان ژێدەر، ل ٢١.
٩ـ هەمان ژێدەر، ل ٢٢.
١٠ـ هەمان ژێدەر، ل ٢٢.
١١ـ قواعد المنهج في علم الاجتماع، اميل دوركايم، ل ٢٣ـ٢٤.
١٢ـ محاضرات في علم اللغة العام، فردينان دى سوسور، ل ٣ـ٤، مقدمة المترجم.
١٣ـ قواعد المنهج في علم الاجتماع، اميل دوركايم، ل ٥١ـ٥٣.
١٤ـ Dinneen, An Introduction to general Linguistics, P.196
١٥ـ هەمان ژێدەر، ل ١٩٨ ـ ١٩٩.
١٦ـ اللغة والتطور، د. عبدالرحمن ايوب، ل ٦٠.
١٧ـ مدخل الى علم اللغة، د. محمد حسن عبدالعزيز، ل ٣٠٥.
١٨ـ اللغة والتطور، د. عبدالرحمن ايوب، ل ٧٠ـ٧١.
١٩ـ في علم اللغة، د. غالب المطلبي، ل ٢٢.
٢٠ـ وەکی هاتیە دیارکرن چۆمسکی سەرکێشێ رێبازێ گۆڕینکاری بوو ئو یێ ئێکێ بوو بنچینێ ڤی رێبازی داناىو گرنگیا وی دیارکرىو چۆمسکی دڤی رێبازێ خۆدا پشت ببیرێت (دیکارت)ی دبەستیت بتایبەتی وێ گۆتنا (دیکارت)ی ئەوا بناڤ و دەنگ «ئەز هزر دکەم کەواتە ئەزێ هەیم (کائنم)» کو وەکی زاراڤ ئەڤ گۆتنە هاتیە ناسین ب (کوجیتو دیکارت) کو کورتیا وێ ئەوە (هزر زمانی برێڤە دبەت) ب پێچەوانەی ئەوێت دگۆت (زمان هزرێ برێڤە دبەت) وەکی زانا (ورف ـ Whorf)ی دگریمانا خۆدا پشتەڤانیا ڤی لای کری.

**٢ـ ژێدەر:ـ**

**ا ـ ژێدەرێت عەرەبیو وەرگێڕای سەرزمانی عەرەبی:ـ**


١ـ دورکایم (امیل)، قواعد المنهج في علم الاجتماع، ت : د. محمود قاسم، مكتبة النهضة المصرية، ١٩٦١.
٢ـ ايوب (د. عبدالرحمن)، اللغة والتطور، معهد الدراسات العربية، ١٩٦٩.
٣ـ مونين (جورج)، تاريخ علم اللغة، ت :ـ د. بدرالدين قاسم، دمشق، ١٩٧٣.
٤ـ كريستال، التعريف بعلم اللغة، ت : د. حلمي خليل، الهيئة العامة للكتاب، الاسنكدرية...
٥ـ خرما (د. نايف)، اضواء على الدراسات اللغوية المعاصرة، عالم المعرفة (٩) الكويت، ١٩٧٨.
٦ـ حجازي (محمود فهمي)، مدخل الى علم اللغة، القاهرة، دار الثقافة والنشر (ط٢)، ١٩٧٨.
٧ـ حسن (د. تمام)، مناهج البحث في اللغة، دار الثقافة، القاهرة، ١٩٧٩.
٨ـ زكريا (د. ميشال)، اللالسنية (علم اللغة الحديث) المبادئ والاعلام، بيروت، ١٩٨٣.
٩ـ عبدالعزيز (د. محمد حسن)، مدخل الى علم اللغة، دار النمر للطباعة، القاهرة، ١٩٨٣.
١٠ـ دى سوسور (فردينان)، محاضرات في علم اللغة العام، ت :ـ د. يوئيل يوسف عزيز، آفاق عربية، بغداد، ١٩٨٥.
١١ـ المطلبي (د. غالب)، في علم اللغة، الموسوعة الصغيرة، بغداد، ١٩٨٦.
١٢ـ زوين (د. علي)، منهج البحث اللغوي بين التراث وعلم اللغة الحديث، بغداد، ١٩٨٦.
١٣ـ جومسكى (نوم)، البنى النحوية، ت :ـ د. يوئيل يوسف عزيز، بغداد، ١٩٨٧.

**ب ـ ژێدەرێت ئنگلیزی:ـ**

1- F.P. Dinneen, An Introduction to general Linguistics, Holt, Rinehar dnd Winston, Newyork, 1971.
2- V. Fromkin and R. Rodman, An Introduction to Language, Secondt edition, Holt, Rinehart and Winston, 1978.


دهوك / ١٩٨/



# بۆ ئاگاداری

لە بەرگی یەکەمی ژمارە «٨٧»ی «کاروان»دا تابلۆی هونەرمەندێکمان بلاوکردۆتەوە، تابلۆکەمان داوەتە پاڵ برای هونەرمەند کاک «اسماعیل خیاط»: ئەوەی راستی بێ ئەم هەڵەیە لەوەوە هاتووە کە چەند ساڵێك پێش ئێستا بە «سلاید» وێنەی کۆمەڵە تابلۆیەکی هونەرمەندانی کورد گیرابوو، «سلاید»ەکان ژمارەیان بۆ دانراوەو لیستەیەکیان بۆ کراوە، بەرامبەر بەو ژمارەیە ناوی کاک «اسماعیل» دانراوە، ئەوەبو دوای بلاو بوونەوەی ئەو ژمارەیە کاک «اسماعیل» پەیوەندی پێوە کردین و ئاگاداری کردین کە تابلۆکە هی ئەو نییە نیمە لەو کاتەی داوای لێ بووردن لە کاک «اسماعیل» دەکەین بۆ ئەم هەڵەیە: لە هەمان کاتدا هیواداریین خاوەنی راستەقینەی تابلۆکە پەیوەندیمان پێوە بکات و، ناوو ناونیشانی تەواوی خۆیمان بۆ بنوسێ.

سوپاسی کاک «اسماعیل خیاط» دەکەین کە زوو بەزوو ئاگاداری کردین، داوای لێ بووردنیش لە خوێنەرە ئازیزەکانمان دەکەین بۆ ئەم هەڵەیەی کە رووی داوە.

کاروان

# دەربارەی دیوانی شێخ نووری شێخساڵح

- کاکەی فەللاح -

پێشەکی حەز دەکەم ئەو راستییە بڵێم کە کاک (ئازاد عبد الواحد) ئەرکێکی هەر تەواو زۆری بە ئامادە کردنی ئەو دیوانەوە کێشاوەو چەن ساڵێکی تەمەنی بۆ کۆکردنەوەو بژارو لەسەر نووسینی تەرخان کردووەو خزمەتێکی بێ رواڵەتی رۆشنبیرانەی ئەو شاعیرە گەورەیەمان و شیعرو ئەدەبیاتی کوردی هێناوەتە ئەنجام و لەلایەن هەموو کوردێکی دڵسۆزو بەوەفاوە شایانی رێزو پێ زانین و ئەمەک ناسییە.

منیش کە ئەمە دەڵێم، یەکێکم لەو کەسانەی کە بەهیوای ئەو ماندوو بوون و ئارام و رێخۆڵە بەکێشیو گەران و پشکنینە نەبووم و تا ئەو رادەیەش تەمای سەرکەوتنیم نەبوو.

سەرەتای ئەم پرۆژەی دیوانی (شێخ نووری)یەش بۆ سەرەتای هەشتاکان دەگەڕێتەوە، ئەو سەردەمەی کە کاک (جەناب)ی کورە گەورەی شاعیر هاتە لام و باسی دیوانەکەی باوکی هاتە ناوەوەو منیش گلەییەکی زۆرم لەکەمتەر خەمیو گوێ نەدانی نەوەی (شێخ نووری)، بەتایبەتی (جەناب)ی (رەحمەتی) کردو لە وەڵامدا وتی: هیچ نەچووە بچێ، من خۆم لەباوکمم بیستووە کە دوای خۆم دووکەس هەن مشوورم بخۆن: هەردیو کاکەی فەللاح... هەر لەو دانیشتنەدا بڕیاری کۆکردنەوەو لە چاپدانی دیوانی (شێخ نووری)مان داو بانگەوازێکمان نووسیو داوامان لە هەموو شاعیرو نووسەرو خوێندەوارو هاووڵاتییەک کرد کە هەرچی یەکیان دەربارەی شاعیر لەلایە بۆمان بنێرن و یارمەتی بەجێ هێنانی ئەم پرۆژە گەورەیە مان بدەن و ئەو وتەیەی شێخ نووریشمان دەربارەی هەردیو نووسەری ئەم دێرانە خستە ناوەرۆکی ئاگاداری یەکەوەو لەرۆژنامەی هاوکاری ئەوسەردەمەدا - کە نوسخەم لەلا نەماوە - بڵاوکرایەوە - بەپێچەوانەی ئەو چەند دێرەوە کە کاک ئازاد لەل ٤٦٦ی بەشی دووەمی دیوانەکەدا نوسیویەتی-

کۆماری عیراق
وەزارەتی رۆشنبیری و راگەیاندن
دەزگای رۆشنبیری و بلاوکردنەوەی کوردی
زنجیرەی ژمارە (٢٢٩)

# دیوانی
# شێخ نووریی شێخ ساڵح

نازاد عبدالواحد

کۆی کردووەتەوەو ساغی کردووەتەوەو لەسەری نووسیوە.

دوای بڵاوکردنەوەی ئەو ئاگاداری‌یە لەلایەن من و کاك جەنابەوە، کەوتمە کۆکردنەوەی بەرهەمە شیعری‌یەکانی شاعیرو داوام لە بنەماڵەش کرد چی‌یان لەو بارەیەوە لەلایە لە دەستنووس و رەشنووس بۆم بنێرن و هەنگاو هەڵگرین... با ئەوەش بڵێم ـ وەك دەڵێن قسە قسە رادەکێشێ ـ پێش کۆچی شاعیر،دەفتەرێکی گەورەی بەرگ رەش کە زۆر لەشیعرەکانی شاعیری گرتبوە خۆی لەلای من بوو، بۆ ماوەی ٤ ـ ٥ مانگێك گلم دایەوە، ئەو دەفتەرەیشم هەر لە شاعیر خۆی وەرگرتبو بە مەبەستی خوێندنەوە، تا ئەوەبوو دوای کۆچی شاعیر دامەوە دەست کاك روشدی عەزیز ساڵحی پارێزەرو برازای شاعیر.. دوای بڵاوکردنەوەی بانگەوازەکە، چەند شیعرێکمان بۆهات، لەگەڵ دەفتەرێکی بچکۆلەی‌بەر باخەڵ کە هەموو شیعرەکانی ناوی بەخەتی شاعیر نووسرابوونەوەو داوێنی لاپەڕەکانیش بەئیمزای خۆی (لۆك) کرابوون.

لەو ماوە کەمەدا کە من سەرگەرمی کۆکردنەوەو گەران و بژارو لە سەرنووسینی شیعرەکان بووم، سستی‌و ساردی‌ی بنەماڵەم هەست پێ دەکردو هەرچەند داوای دەفتەرە گەورەو دەستنووسەکانم لێ دەکردن، کاك جەناب دەیوت: لەرێگای کاك روشدی‌یەوە گەیشتۆتە دەست (د. کەمال مەزهەر)و ئەویش بۆ کارو باری مێژوو سوودی لێ وەردەگرێت... ئەوی راستی بێ ساردی‌ی بنەماڵە وردە وردە منیشی سارد کردەوە لە دڵی خۆمدا دەموت: ئەم کاسەیە بێ ژێر کاسە نی‌یە. تا ئەوەبوو، هەر لەو دەورو بەرەدا کاك (ئازاد عبدالواحد) هات بۆ لام و داوای لێکردم پرۆژەی ئامادەکردنی دیوانی شێخ نووری، هەردووکمان، واتە من و ئەو، بیگرینە ئەستۆو بە ئەنجامی بگەیەنین.

بەڵام من قایل نەبووم و بۆم روون کردەوە سەبارەت بە جیاوازی‌ی تەمەنی ئەدەبی‌و باری سەرنج و بۆ چوون و قەناعەتی ویژدانی، بە شتێکی رەوا گونجاوی نازانم. بۆ نموونە، من ئەوساش و ئێستاش مامۆستا گۆران بەرابەری راستەقینەی نوێ کردنەوەی شیعری کوردی دەزانم، بەڵام ئەو، واتە کاك ئازاد، شێخ نووری بەو رابەرە دادەنێت، دیارە دوو باری سەرنجی وا جیاواز لە دوو توێی دیوانێکدا، کە هی شێخ نووری‌یە، جێگایان نابێتەوەو کێشەی زۆری لێ وەشاوەتەوەو دەوەشێتەوە.. کەچی بەداخەوە وەڵامەکەی لەدڵ گرت.

بەهەر حاڵ، منیش وازم لەدیوانەکە هێناو هەر وەك لە پێشەکی کتێبی (کاروانی شیعری نوێی کوردی)دا باسی شاعیرم کردووەو دەڵێم: (شێخ نووری شێخ ساڵح دەستێکی باڵای لەنوێ کردنەوەکەدا هەبوو، ئەویش تەنها بەپەیرەو کردن و لاسایی شیعری نوێی تورکەکان و لەوە بەم لاوە لە هەناسەو بەرهەم کەوت و بە داخەوە کشایەوە دواوە و پاش ئەوەش ئەگەر بەرهەمێکی هەبوایە لەسەرتان و پۆی عەروزی عەرەبی‌و

شێوەی کلاسیکی دەیچنیو چێژی لێ وەردەگرت...)

ئێستەش کە تەواوی شیعرەکانی، لەسایەی رەنج و ماندوو بوونی کاک ئازادەوە کەوتە کتێبخانەی کوردیەوەو جێگای شایانی خۆی گرت، من بەش بەحاڵی خۆم، خۆم زۆر بە بەختیار دەزانم کە دەنگ و هەناسەی گەرمی ئەو شاعیرە گەورەیەی سەدەی بیستەممان، سەرلەنوێ، لەدیوانێکی سەربەخۆو تەواودا، بەزیندوویی و نەمری مایەوە.

جا هەر بەهەوای خۆشەویستیو رێزو بایەخی پایەی بەرزی شیعرو شاعیرێتی شێخ نووری شێخ ساڵح و پیرۆزبایی ئەو ئەرك و رەنجە دوورو درێژەی کاك ئازادو هەستی لێ پرسینەوەو بژاری باخچە هەمیشە سەوزو پاراوەکەی شیعرو ئەدەبیاتی کوردی. بەپێویستم زانی چاوێك بەدیوانەکەدا بگێرم و بەگوێرەی توانا باری سەرنج و بۆ چوونی خۆم دیاری بکەم و لەوەش دڵنیام کە چ ئامادەکەری دیوانەکەو چ خوێندەران بەگشتی، ئەگەر چاوەروانی ئەم نووسینەش نەبن، ئەوا پێیان خۆشە، چونکە پێم وایە لەسەرچاوەی دڵسۆزییەوە هەڵقوڵاوەو دەمیکە شاعیری زۆر گەورەمان (مەولەوی) فەرموویەتی:

**بە تاعەت نییەن ئیخلاص حساوەن**

**سالمی** ساحیبقرانیش دەڵێت:

**بە حەیا بێرە حضورو بە ئەدەب سوجدە بەرە**
**مەنزڵی دولبەرە (سالم) ئەمە مەیخانە نییە**

بەڵێ دیوان، دیوانی شێخ نوورییەو منیش لە ناخی دڵەوە گوێم لەدەنگێکە لەگەڵ (حەمدی) ساحیبقرانی شاعیردا هاوار دەکات:

وریابە قەڵەم ........

ئێستەش ئێوەو باری سەرنجەکان، بەپێی زنجیرەی لاپەرەکانی دیوانەکە

**١ـ ل ٣٣ ـ دێری ١**

**عیلمت میللەت نائیلی جاهو شکۆ هوشان ئەکا وشەی** (عیلمت) **شیعرەکەی بێجگە** لەوەی قورس کردووە، **ماناکەیشی شێواندووە**... **راستێکەی** (عیلمە)یە، **ناو نیشانەکەیشی هەر** (عیلمە میللەت)**ە**

**٢ـ ل ٣٣ ـ دێری ٢**

دایەیی **پاکی وەتەن پر** نەشئەو **خەندان ئەکا (نەشئەو)** برگەیەکی ناتەواوە، **(نەشئەوو)ە تاراست دەبێتەوە**... **لەم بابەتە** لە دیوانەکەدا **ئێجگار زۆرەو دەبێ خوێنەر خۆی بە سەلیقەی** خوێندنەوەی خۆی **راستیان بکاتەوە.**

**٣ـ ل ٣٩ـ د ٧**

**کە قەومێ صاحێب صنعەت نەبێ وەك جیسمی بێ جانە ئەم تاکە شیعرە لەنگە. وشەی (صاحیب) نییەو (صاحیبی)یە**

**٤ـ ل ٣٩ ـ د ١٢**

**ئەوی دەرحەق بە مەکتەب**[١] **نوتقی نووسیبو**[٢] **لەمەو پێشتر لە پەراوێزی (٢)دا نووسراوە (مەبەستی نووسابوو)ە وا دیارە کاك ئازاد ئەوی بیستووە کە جارانی زوو بەخوتبەیان دەوت (نوتق).. شاعیر کە دەڵێت:** نوتقی **نووسیبو) واتە خوتبەی نووسیبوو، یان وتاری نووسیبوو، هیچ پەیوەندییەکی بە دەنگ نووسانەوە نییەو (نووسابوو)نییەو** هەر **(نووسیبوو)ە.**

٥ـ ل ٤١ ـ ئەو (نووری محەمەد سالح)ەی کە لە (جەمعیەتی زانستی کوردان)دا بە خۆرایی دەرسی و تۆتەوەو خۆی تەرخان کردووە بۆی، (نووری شێخ ساڵح)ی شاعیر نییە کە پێم وایە رۆژێك لەرۆژان وەك مامۆستایەك دەرسی نەوتۆتەوە بەڵکوو (نووری حاجی ساڵح ئاغا)یە.

**٦ـ ل ٥٦ ـ د ١١**

**بنچینەی خۆیشم کەوا وێران بێ**

**وشەی (خۆشیم) هەڵەیە**، راستێکەی **(خۆشیم)ە. چونکە تاکەکەی تری دەڵێت: هیچ** نەبێ خەمیش **بابێ** پایان بێ

خۆشی پێچەوانەی خەم و ناخۆشییەو واتە: کە بنچینەی خۆشیم وێران بوو، کەواتە با خەمیشم بێ سنوورو بێ پایان بێت.

**٧ـ ل ٦٠ ـ د ٣**

بەڵام ئەو غونچـەی هەر ناکـرێتـەوە لە پەراوێزی ئەو لاپـەرەیـەدا نووسراوە کە (لە دەستنـووسـەکـەدا (هـەر) نەنـووسرابـوو وادیـارە لە کاتی نووسیندا بیری چووە من بە مەزەنەی خۆم (هەر)م بۆ دانا، ئەگینا شیعرەکە لەنگ دەبوو).

بەلای منەوە ئەو (هەر)ە زیادەو شاعیر لەبیری نەچووە، خوێنـدنـەوەی ئەو دێـرە بەبێ (هـەر)، سروشتی ترە، چونکە پێویستە لە خوێندنەوەدا کاف ناکرێتەوە باش دەربخرێت و ماف خۆی بدرێتێ.

**٨ـ ل ٦١ ـ د ٤**

بۆ رشتنی خوێناوی عەدو حازری راە بووین پێم وایە وشەی (راە)، (را) یە بۆ ئەوەی لەگەڵ قافیەی (وەغا)ی سەرەوە رێك بکەوێت و عەینی مانایشە:

بەم بۆنەیەوە حەزدەکەم ئەوە بڵێم کە دڵنیام لەوەی ئەم **نۆیـەرێتی** (دلاوەران)ە. وەك ناودرۆك و شێـوەی دارشتن و **بەکـارهێنـانی** فەرهـەنگی تایبەتی شاعیرو جۆری بیرکردنەوەو **رێبـازی** نەتـەوایـەتیو تێکـەڵاو کردنی دەنگی کورو کچ **بەرهەمێکی** رەسەنی شێخ نووریەو ماف هیچ شاعیرێکی تری **بەسەرەوە** نییە.

**٩ـ ل ٦٤ ـ د ٩**

وشەی (ریشەوو)، (ریشەو)ە ئەگینا لەنگ دەبێت.

**١٠ـ ٦٦ ـ دێری ٣**

مەتەڵ زانێ ئەزانێ؟ یا ئەمێنێ بە پەنهانی لەنگە، لەوە دەچێت وشەی (هەر) یا (وا) لەدوای (ئەمێنێ)وە دابنرێت هەتا راست ببێتەوە.

**١١ـ ل ٦٨ ـ شیعری (رۆح)**

لەوە دەچێت شیعری (گیان)ی مامۆستا گۆرانیش هەر لە ژێر کار تێکردنی ئەم شیعرە ئینگلیزیەدا وترابێت، چونکە هەر زۆر لەیەك دەچن دیوانی گۆران ـ ل

**١٢ـ ل ٩٠ ـ د ١٠**

گە یادی حەلاڵین و گەهێ دۆستی حەرام وشەی (کە) ئەگەر بە (گەهـ) نەنووسرێت لەنگ دەبێت.

**١٣ـ ل ٩٩ ـ بەمن بڵێ چ میللەتێ**

ئەو قەسیدەیە بە شیعری (موستەزاد) **دراوەتە قەڵەم** بەڵام موستەزاد نییە، شیعرەکانی دوای ئەو **موستەزاد**ن

**١٤ـ ل ١٠١ ـ د ١٣**

ئەو قەومە جێی صەحایفی تەئریخ و لەعنەتە

مانا شێواوە، راستێکەی وایە:

ئەو قەومە جێی صەحایفی تەئریخی لەعنەتە

**١٥ـ ل ١٠٣ ـ د ١٠**

ئەی نەی زەنی بیستان

پێم وایە (بیستان) نییەو (بوستان)ە

**١٦ـ ل ١٠٤ ـ د ١**

یەنبوعی ئەدەب، کانی گەوهەر، مەنبەعی عیرفان لەنگە. راستێکەی (کانی گوهەر)ە تاراست ببێتەوە.

**١٧ـ ل ١٠٤ ـ د ٣**

سەیری بکە بنوارە بەشارو بەکەنارا

وشـەی (سـەیـری)، (سەیرێ)یە، بۆ ئەوەی مەودای تەماشا کردنەکە فراوانتر بێت.

**١٨ـ ل ١٠٦ ـ د ٢**

مەبهـووت و سەراسیمە موکەددەر لە موکەددەر مانای نایەت و ناتەواوە

**١٩ـ ل ١١١ ـ د ٦**

نابی مونەوەر بە گوڵی یەخەیی چاکەت لەنگە، راستێکەی وایە:

نابی بە مونەووەر بەگوڵی یاخەیی چاکەت

**٢٠ـ ل ١٠**

بەڵام وەك موتبـەدای بێ خەبـەر ئاغـازی بێ ئەنجام (مـوتـبـەداعـی)، (مـوبتـەدای)ە و هەڵەی چاپـە، بەڵام لەراستکردنەوەکانی (ڤاوکاری)دا پەنجەی بۆ رانەکێشراوە.

**٢١ـ ل ١١٥ ـ د ٨**

پیر زەوق و تەرەننوم

وشـەی (پیر)، (پڕ)ە بۆ ئەوەی ماناکەی ببێتەوە جێی خۆی و روون ببێتەوە.

٢٢ـ ل ١١٩ ـ د ٦

عەزیـزم رۆ، عەزیزم رۆ، عەزیزی نەونیهالم رۆ وشەی (نـەونـیـهـالم)، (نـەونیهـالم)هو دیـارە هەڵەی چاپـە، لە راستکردنەوەکانی (هارکاری)دا ئاماژەی بۆ نەکراوە.

٢٣ـ ل ١٢٠ ـ د ١

بە ئومێدی بێمە سەرینت هەر وەکوو مەجنوون ئەگەر (ئومێدی) بە (ئوممێدی) نەنووسریت شیعرەکە لەنگ دەبێت

٢٤ـ ل ١٢٠ ـ د ٧

لەوی دیجلە وەکیلی دیدەکەی من بوو بەلێڵ سوور لەنگە، راستێکـەی بە (لێـڵی و سوور)هو لەبەر حوکمی قافیە نەبوایە دەبوو بە (لێڵی و سووری) یان (لێڵ و سووری) بوایە.

٢٥ـ ل ١٢٠ ـ د ٨

سکـووتی خستە خانەت (١) بوو بەشینی عائیلەی رەنجوور (خستە خانەت) نییەو (خەستە خانەت)ە. واتە بێ دەنگی مردنی خەسـتـە خانەت بوو بەهۆی شین و شەپۆری ماڵەوە.. دیـارە شێـخ عەزیـزیش هەر لەخـەستەخانەی بەغدا، دوور لەکـەس و کار، کۆچی دوایی کردووە... ئەگینـا یەعنی چی سکـووتی خستـە ماڵەوەو شیوەنیشی دا بە خێزان ؟! شتێکی پێچەوانەو ناکۆکەو بەم پێیە ماناش دیارە شێواوە.

٢٦ـ ل ١٢٤ ـ د ٨

گەیشتـە تەوقە سەری کێوی سەخت و بەرزی خەبەر وشەی (تەوفە)، (تەوقە)یەو هەڵەی چاپەو پێی نەزانراوە.

٢٧ـ ل ١٢٧ ـ د ٦

بە جارێ تانەیی لێلایی هێنایە سەر چاوم

لەنگەو برگەیەکی ناتەواوە.. ئەگەر (وا) بخرێتە پێش و شەی (هێنایە)وە راست دەبێتەوە.

٢٨ـ ل ١٢٨ ـ د ٣

مەگەر هەر دەست و ئەژنۆ دانیشم بۆ حاڵی خۆم بگریم وشەی (دەست و ئەژنۆ)، (دەستەو ئەژنۆ)یەو وەك زاراوەیەکی لێ هاتووەو ئاوازو تریپەکەیشی لەبارترو گونجاو ترە، بەتایبەتی لەشیعردا.

٢٩ـ ل ١٣٠ ـ دێری دوایی

گەردنی مەحموود جەودەتیش بۆ سەری سێدارە بێ

لەنگە، پێم وایە بەم چەشنە تەواو بێت:

گەردنی مەحموود جەودەت بۆ سەری سێدارە بێ

٣٠ـ ل ١٣٥ ـ د ٣

لە کاتی نەوجەوانی تا مردن بەگیان و دڵ

لەنگ و ناتەواوە. بۆ ئەوەی لەو چەقین و قورسی‌یە رزگاری ببێت رەنگە وابێت

لە کاتی نەوجەوانیێوە هەتا مردن بەگیان و دڵ

٣١ـ ل ١٣٦

ئەوەندەی من بزانم ئەو سێ بەیتە شیعرەی لاپەرە ١٣٦ و ١٣٧ی بۆ قاڵەی ئایشە خانە.. چونکە تێکرا هەموو شاعیرە ناودارەکانی کورد لەو سەردەمەدا شیعری شیوەن نامەیان بۆ داناوە.

٣٢ـ ل ١٣٦ ـ د ٢

پڕ لە ئێش و سوێی برین و شیوەنی مەجووری‌یە لەنگە.. چونکـە بەپێی رێنـووسی ئەمـڕۆی کوردی دەبێ و شەی (مەجووری) وابنووسرێت (مەجووری)

٣٣ـ ل ١٤٠ ـ د ٢

بە شوێن تۆدا هەزارو یەك بلبـلی بێ ئاشیـان ئەگری لەنگەو خۆزگە دێرەکەی خوارەوە بخرایەتە سەرەوەکە دەڵێت:

بە شوێن تۆدا هەزارێك بلبلی بێ ئاشیان ئەگری

٣٤ـ ل ١٤٣ ـ د ٣

بە کۆچی تۆوە بوو، ئەی مەحبوبی حەق مەحموودی رەبانی

وشەی (ئەی) زیادەو بەیتەکەی لەنگ کردووە

٣٥ـ ل ١٥١ ـ د ١

زوو نەوجوانی‌تر وەکوو ئەو کوشتەو جەریح

بەم رەنگـە لەنـگ و ناتـەواوە .. پێم وایە وشەی (زوو)نی‌یەو (زۆر)ە وشەی (کوشتەو)یش دەبێ بە (کوشت وو) بنووسرێت ئنجا راست دەبێتەوەو ماناو مەبەستی شاعیر بە دەستەوە دەدات.

٣٦ـ ل ١٥٧ ـ د ١٢

وەیا بە شەر هەموو بڕوا بە هایدرۆجینی

رشـــەی (هـــایـدرۆجینی)، (هـــایـدرۆجــین)ە، بۆ ئەوەی هەم کێشەکەی راست ببێتەوەو هەم قافیەشە بۆ (رووی زەمین).
٣٧ـ ل ١٥٧ ـ د ١٤
ئەگەرچی مەنفەعەتی خۆشی تیا نەبێ بەقین
وشەی (بەقین) نامۆیەو مانایەك نابەخشێ‌و دیارە (یەقین)ە واتە، هەر دەست لەمـرۆڤـایـەتی ئەوەشێنی باسوور بزانن کەڵکی خۆیشیانی تیا نی‌یە.
٣٨ـ ل ١٥٧ ـ د ١٧
ئەگەر لەمانە کەمێ زیاد بووایە میقداریان
پێم وایە وشەی (میقداریان)، (میقداری)یە. هەم لەبەر کێش و هەم قافیە
٣٩ـ ل ١٥٨ ـ دێری:
تاکـوو تۆ ماوی لە ئازاری ئەم و ئەو دوور ئەبێ دیارە وشەی (نەو) نی‌یەو (ئەو)هو هەڵەی چاپی هەست پێ نەکراوە.
٤٠ـ ل ١٦٠ ـ د ٢
گەماروێت گەر پەدەن عالەم ، هەموو دڵ لەبوغزو کین
لەنگەو مانای نایەت، ئەگەر وشەی (پڕ) کە پەڕیوە بخرێتە دوای (دل) ئەوا راست دەبێتەوە.
٤١ـ ل ١٦٠ ـ د ٧
ئەگـەر بێ گوێ نەدەیتە تانەیی نابوودی بەد خوا هان هەق وایە وشەی (بێ) لای (ئەگەر)ە کەوە بێت تا بە (بێ گوێ) نەخوێندرێتەوە
٤٢ـ ل ١٦٠ ـ د ١٦
لەبەر چاوی حەقیقەت ببینی تۆ، ئەم دوانە یەکسان بێ لەنگەو مانا تێکەڵ و پێکەڵە، راستێکەی (حەقیقەت ببینی)نی‌یەو (حەقیقەت بینی)یە.
٤٣ـ ل ١٦١ ـ د ٥
ئەگەر بێ هۆی ژیانت ئاگری تێبەر ببێ ناگاە
وشـــەی (نـــاگاە)، (ناگایەو بەعەینی مەعنا دێتەوە، بۆ ئەوەی لەگەڵ قافیەی (بیبا)دا یەك بکەوێت.
٤٤ـ ل ١٦١ ـ د ١١
لە ئەرکـانی فەضیلەت لانـەدەی، یاخـود بەحسی کەی لەنگەو لەوانەیە لەدوای (لانەدەی)هوە (تۆ) یەك راستی بکاتەوە.
٤٥ـ ل ١٦١ ـ د ١٤

ئەگـەر بیـپـەرچـێنی دڵ، تووڕەیی‌و رق، وەختی قین هەڵسان لەنگە. وا دیارە (بیپەرچێنی) نی‌یەو (بیپەرچنێ)یە بۆ ئەوەی بۆ تووڕەیی‌و رقەکە بگەرێتەوە نەك بۆ دڵ.
٤٦ـ ل ١٦٢ ـ د ٢
ئەگەر بەد ناویی شارت نەوێ نەفست بەرەڵاکە وشەی (نـەوێ) نی‌یـەو (ئـەوێ)یە. ئەمە هەر چەند لە هەڵەی چاپ دەچێت، بەڵام لە راستکـردنەوەکانی (هاوکاری)دا ئاوری لێ نەدراوەتەوەو ماناکەیشی تەواو هەڵگێڕاوەتەوە.
٤٧ـ ل ١٦٢ ـ د ٩
جیهان بێ ئێمە زۆر تێپەڕیوەو تێپەڕ ئەبێ زینهار لەنگەو دیارە وشەی (تێپەڕیوە) نی‌یەو (تێپەڕ بووە)یە.
٤٨ ـ ل ١٦٣ ـ د ٢
بۆ تۆیە ئەی ئومێدی وەتەر، خادیمی خەیات
وشەی (وەتەر) نی‌یەو (وەتەن)هو لە هەڵەی چاپ دەچێت و پێی نەزانراوە.
٤٩ ـ ل ١٦٣ ـ د ٩
هێند چاوڕێ بوو چاوی هەتا پێگەیی سوبل
مانا شێواوە. (پێگەیی) نی‌یەو (پێی گەیی)هو (سوبل) نی‌یەو (سەبەل)ە. واتە: چاوی ئەوەندە لەڕێ بوو هەتا تووشی نەخۆشی (سەبەل)ـ کە جاران بە تەراخۆمایان دەوت و دەیان بڕی ـ ئەمە جگە لەوەش (سەبەل) هاوقافیەی وشەی (ئەمەل)ە.
٥٠ ـ ل ١٧٠ ـ د ٨
ئەتلێتەوە بێ چارە لەتاو دەردو بەڵاتا
وا دیارە وشەی (لەتاو) نەبێت و لە (ناو) بێت چونکە لەڕووی رێزمانی‌یەوە (لەتاو دەردو بەڵاتا) نایەت و وەستاوە
٥١ ـ ل ١٧١ ـ د ٣
شەرت بێ دڵەکەم بگرم، وابیدەمە بەر دار
لەنگە، لەوانەیە پیتێکی (و) لەدوای وشەی (بگرم)هوە هەبێت و راستی بکاتەوە.
٥٢ ل١٧٨ ـ د ٩
لە دونیادا هەر لەبی شیرین لەبانە
لەنگەو پێم وایە (لەدونیادا) نەبێت و (لەدونیا) بێت.
٥٣ ـ ل ١٧٩ ـ د ٦

جێ‌بێکی زۆر موقەددەس و عالی خیابە دڵ
مانای نایەت و دیارە وشەی (عالی خیابە) نیەو (عالی جەنابە) و وشەی (خیابە) هیچ ناگەیەنێت.
٥٤ ـ ل ١٨٠ ـ د ٤
باکی نیە، موحیبەتە، پیاوی خراپە دڵ
هەق وابوو وشەی (خراپە) بە (خرابە) بنووسرایە لەبەر قافیە.
٥٥ ـ ل ١٨١ ـ د ٥
مەمکەرە ریسوای عالەم، ئەی بلێسەی ئاهی گرم
لەنگەو مانای شێواوە. وشەی (ریسوای)، (ریسوایی)یەو (گرم)یش (گەرم)ە.
٥٦ ـ ل ١٨١ ـ د ٨
بەسیە با نەرژێ لەلێوی کەیلی، خوێن پەیمانەکەم
وێرگولی دوای (کەیلی) دەبێ بخرێتە دوای وشەی (خوێن)ەوە تا بۆ راست کردنەوەو تێگەیشتنی ماناکەی سەر لە خوێنەر تێك نەچێت. چونکە مەبەست لێوی پەیمانەیە کە کەیلی خوێنە.
٥٧ ـ ل ١٨٣ ـ د ١
غەمی زەمانە وەکوو پردە، وا دڵی پۆشیم
وشەی (پردە) نیەو (پەردە)یە کە بابەتی پۆشینە پرد بۆ پەرینەوەیە نەك داپۆشین نیە.
٥٨ ـ ل ١٨٣ ـ د ٨
• وەکوو مەرو بزن دوو سەفاهەت ئەیدۆشیم بەم رەنگە هیچ مانای مەبەستێك بە دەستەوە نادات (مەرو بزن، دوو) نیەو (مەرو بزنی دۆ)یە، واتە سەفاهەت وەکوو مەرو بزنی شیردار ئەیدۆشیم.. لە کوردەواریدا بە مەرو بزنی شیردار دەڵێن: مەرو بزنی دۆ
٥٩ ـ ل ١٨٣ ـ د ١١
خەیاڵم ئێستەکە سەر چاو مەستی شۆخێکە برگەیەکی ناتەواوە و پێ دەچێت (سەر چاوی) بێت
٦٠ ـ ل ١٨٤ ـ ١٨٥
ئەم پارچەی (دەردی دڵی خۆم)ە هەمووی بەشێوەی (چوارین)ە نەك دوو دوو بەقافیەو یەکێتی ماناکاندا تەواو دیارو ئاشکرایە.
٦١ ـ ل ١٨٩ ـ د ٢

موحەقەقمە کە مردم بی کونە لایوسئەل و پاکم.
وشەی (بی کونە) مانای نیە. ئەم وشەیە (بی گوناه)ە بە رێنووسی کۆن (بێ گونە) دەنووسرا بۆیە وای بەسەر هاتووە. گومانم لەم شیعرەش هەیە کە هی شێخ نووری بێت زیاتر لە سەروسیمای (عەلی باپیر ئاغای شاعیر) دەچێت.
٦٢ ـ ١٩١ ـ د ٣
ئەحواڵی دڵ زرە، بەدەس رۆژەوە دیارە.
تەواو لەنگ و مانا شێواوە.. وشەی (دڵ) نیەو (دڵی)یەو (زرە)ش نیەو (زەرە)یە. ئەوسا کێش و مانا دەچنەوە جێی خۆیان.
٦٣ ـ ل ١٩١ ـ د ٩
هەرچی یەتەبەر دیدە هەموو یارەمە باغەم ماناکەی رووناك نابێت تا (رەمە) نەکرێ بە (رەمە) کە (رەم) راکردنی ئاسکە کێوییە.
٦٤ ـ ل ٢٠٤ ـ د ٦
نەونیهالانی چەمەن، بە پەردە بگرێتە کەنار
لەنگە. ئەگەر ئەو (بە)یە نەکرێت بە (با)
٦٥ ـ ل ٢٠٤ ـ د ٧
مەوسمێتی، سێوو گوڵ بێنن متروبەی کەن یێك وشەی (متروبەی) دەبێ (متوربەی) بێت ئەگینا لەنگە.
٦٦ ـ ل ٢٠٤ ـ د ١١
قەترەیی باران لەدڵ ئەشواتەوە نۆزی کەدەر (نۆزی)، (تۆزی)یەو هەڵەی چاپەو پێ نەزانراوە
٦٧ ـ ل ٢٠٥ ـ د ١

**ئاڵ و والاّ پێکەوەن وەك گوڵ لەگەڵ رەیحانە**

**لەنگە (رەیحانە) بکرێ بە (رەیحانەدا) راست دەبێتەوە**

٦٨ ـ ل ٢٠٦ ـ د ٣
هاتەوە بەر بەدەن سەبزە حەیاتی تازە
لەنگە وادیارە (بەدەن)، (بەدەنی)یە بۆ سەبزە دەگەرێتەوە
٦٩ ـ ل ٢٠٧ ـ د ١
بەدەستی قودرەتی حەق، چیهرەیی رازاوەتەوە
وشەی (بەدەستی) ئەگەر (بەدەسی) نەخوێندرێتەوە لەنگە
٧٠ ـ ل ٢٠٨ ـ د ١

بەهارە ئەمرۆ لەباغا وەنەشە مەستی ئەکا

دیارە (وەنەشە)، (وەنەوشە)یەو هەڵەی چاپەو پێی نەزانراوە.

٧١ ـ ل ٢١١ ـ د ١

وشەی (ئومێدی) ئەگەر بە (ئومێدی) نەخوێندرێتەوە لەنگە.

٧٢ ـ ل ٢١٥ ـ د ٧

لەپر گەردوونی بی رەحم و وەفا، بێ سووچ و تاوان

لەنگە. دیارە (بێ سووچ و بێ تاوان)ە. ئنجا راست دەبێتەوە.

٧٣ ـ ل ٢١٧ ـ د ٥

بگری ئەی تەبری بێ ئەمان بگری

وشەی (تەبری)، (ئەبری)یەو بە فارسی هەورە.

٧٤ ـ ل ٢٢٦ ـ د ٩

ئەوا پەردازە بلبل، بۆ دەمی غونچە گولستانت (غونچە)، (غونچەی)ە

٧٥ ل ٢٢٧ ـ د ١٠ .

حازرە ئەم رۆژە، بۆ شکستی شانی شەو لەنگەو وشەیەکی ناتەواوە وەك (دەرچێ) لەدوای رۆژەوە.

٧٦ ـ ل ٢٢٩ ـ د ١

وشەی (سەرەنگوون و)، (سەرنگوون و)ە تا لەنگ نەبێت.

٧٧ ـ ل ٢٣٧ ـ د ١٧

**وشەی (دڵگرییە)، (دڵگیرییە)یە.**

٧٨ ـ ل ٢٦٩ ـ د ١٧

وەك عەلیشیش رقی هەستان

وشەی (هەستان)نییەو (هەستا)یە چونکە هەم رق هەستا نەکە بۆ (پاشا)یەو هەم هاو قافیەی (هەشتا)یشە.

٧٩ ـ ل ٢٧٤ ـ د ٦

وشەی (تێ هەڵدا)، (تێ هەڵدان)ە. هەڵەی چاپەو نەزانراوە

٨٠ ـ ل ٢٨٩ ـ د ١٠

تشتیوا رووی نەداوە

لەنگە. رەنگە (وا)، (وەها) بێت.

٨١ ـ ل ٣٠٠ ـ د ٧

وشەی (پیرم) وادیارە (پیرێم)ە تا لەگەڵ (بکێڵرێم) قافیە بێت.

**٨٢ ـ ل ٣٠٠ ـ پەراوێزی ٢**

ئەوراقی ئەمەل نەبۆتە هۆی وەراندنی غونچەی ئومێد، بەڵکوو بێ لوتفیو بێ خزمەتی میسرەعی پێش خۆی گەڵای هیواو خونچەی ئاواتی وەراندووە. بەهەڵە ماناکەی لێك دراوەتەوە

٨٣ ـ ل ٣٠٢ ـ

ئەو قەسیدەیە بە شێوەی چوارین دارێژراوە نەك دوو دوو.

٨٤ ـ ل ٣٠٥ ـ د ٤

شوعلەی زەفەر، عاقیبەتی جەیشی موزەفەر

لەنگە. دیارە وشەی (زەفەر)نییەو (زەفەرە).

٨٥ ـ ل ٣١٢ ـ د ٤

حەمد بێ حەدبوو، خودا دیم رۆژی ئیستقلالی کورد قورسە . وشەی (حەمد)، (حەمدی)یە.

٨٦ ـ ل ٣١٣ ـ د ٤

تێفکرە میللەتی غەییورە، صاحیب غیرەتە

لەنگە. وشەی (تێفکرە)، (تێ بفکرە)یە

٨٧ ـ ل ٣١٤ ـ د ١١

بەسیەتی ئەی مەئموور، ئیتر باسی مەعاشم بۆ مەکەن

لەنگە. یان (بەسیەتی)، (بەسیە)یە، یان (ئەی) پێش مەئمووز زیادە.

٨٨ ـ ل ٣١٤ ـ د ١٤

صەد شکور لاچوو لە ئاوێنەی دڵا، رەنگی میحنەت

لەنگە. وشەی میحنەت نییەو (میحەن)ە کەوەك قافیەش لەگەڵ ئەوانی تردایەو کێشەکەیشی راست دەبێتەوە.

٨٩ ـ ل ٣١٦ ـ د ٤

جەللادی جگەر، ئاهینی بێ شەفەقەت و ریققەت لەنگە، وشەی (شەفەقەت) دەبێ بە (شەفقەت) بنووسرێت و وێرگوڵی نێوان (جگەر)و (ئاهنی)ش نەمێنێ بۆ ئەوەی ببێ بە (جگەر ئاهنی) واتە (جگەر ئاسنی).

٩٠ ـ ل ٣١٧ ـ د ٧

برسی‌و رەش و رووت ، غەمــزەدە، شۆخ و شەنت دی
لەنگە، پێش وشەی (شۆخ)، (چەن)ێك دیار نی‌یە.

**٩١ ـ ل ٣٢٠ ـ د ١**

ئەمشەو من لەخەوا من بەدیهی وەتەنم دی
هەرچەندم کرد، واتێك دراوە، بۆم راست نەبووەوە.

**٩٢ ـ ل ٣٢٠ ـ د ٣**

مەسرورو تەرو تازەو پڕ غونچە دەقەنم دی
لەنگـە. وشـەی (پڕ) زیادەو (دەقەنم)، (دەهەنم)ە کە دەمە، (تازەو)یش دەبێ بە (تازەوو) بنوسرێت.

**٩٣ ـ ل ٣٢٠ ـ د ٥**

پرسیم چی‌یە ئەم خۆشی‌و زەوق و سەفایەت
لەنگە. وا دیارە دوای وشەی (خۆشی)، (ئەم)ێك هەیە

**٩٤ ـ ل ٣٢٠ ـ د ١٣**

ئەوسا کە وسائیط لە عیراق هەموو کەر بوو لەنگە. وشەی (عیراق)، (عێراق)یە جاراست دەبێتەوە.

**٩٥ ـ ل ٣٢٠ ـ د ١٦**

بێ مەعریفەت و بێ سنعەت و بێ عیلم و هونەر بوو
لەنگە. ئەم سێ (بێ)یە یەکێکیان زیادە، ئەویش (بێ)ی پێش (سنعەت)ە

**٩٦ ـ ل ٣٢٠ ـ د ١٨**

من تازە لە تورکی قەبەو هونەرم چی
لەنگە. (قەبەو هونەرم) نی‌یەو (قەبەوو بێ هونەرم)ە.

**٩٧ ـ ل ٣٢٤ ـ د ٦**

ئاگر لە بەرابەری ئاواتینی نی‌یە
مانای نایەت. وشەی (ئاوا) نی‌یەو (ئەوا) یەگە بۆ ،وورەکە دەگەرێتەوە.

**٩٨ ـ ل ٣٢٤ ـ د ١٣**

یارەبی لەفەیزی مەعریفەت مەهجووم
لەنگەو مانای نایەت. دیارە وشەی (مەهجووم) نی‌یەو (مەهجوورم)ە

**٩٩ ـ ل ٣٢٤ د ١١**

پیاوی کامڵ دوژمنیشت بێ یێك زیان ویێك دڵە
لەنگە. وشەی (دوژمنیشت) نی‌یەو (دوژمنیش)ە

**١٠٠ ـ ل ٣٢٥ ـ د ٥**

تۆ باعیسی حاڵی حوزن و خورسنەی منی
لەنگە. (خورسنەی) نی‌یەو (خورسەندی)یە.

**١٠١ ـ ل ٣٢٨ ـ د ١**

(شووشە) چ بە ششوشە، قەدی شووشە وەکوو شمشاڵ
قورسە. وشەی (بەششوشە)، (بەشووشە)یە.

**١٠٢ ـ ل ٣٢٨ ـ د ٢**

چاوی مەست و دەهەند غونچەو پڕ عیشوەو لێو ئاڵ
هەرتەواو تێك دراوە. راستێکەی وایە:
چاو مەست و دەهەن غونچەو و پڕ عیشوەو و لێو ئاڵ جا دەبێتەوە بە شیعر.

**١٠٣ ـ ل ٣٣١ ـ د ٣**

ئەمێنم قەت کە پێ نانێمە سەر سەپیاردیێکی خۆم مانای نایەت. (ئەمێنم) نی‌یەو (ئەمینم)ە، واتە دڵنیام

**١٠٤ ـ ل ٣٣١ ـ د ٨**

بە شیری خۆم بە خێوم کردووە رۆڵەی بەڵا بۆ خۆم ئەو
شیری لە کوێ بوو؟ (خەم)ە. نەك خۆم

**١٠٥ ـ ل ٣٣٢ـ د ٣**

وەك قەولت لەگەڵ خوا کردووە. هەرگیز دەسێ نەگری
لەنگە وشەی (وەك) نی‌یەو (وەکوو)ە

**١٠٦ ـ ل ٣٣٢ ـ ل ٧ ـ د ٨**

بە نازم ورد دە خاڵی دەوری لێوت
ئەڵێی زەنگی بەچەی شەککە ر فروشە
(بەنازم) نی‌یەو (بنازم)ە، (فرۆشن)یش (فرۆشە)یەو ئەم بەیتە هی (خەستە)ی شاعیرە نەك (شێخ نووری).

**١٠٧ ـ ل ٣٣٣ ـ د ١ و ٢**

سەری تۆ وا لە گوێی قەبرا ئەلەرزێ کەی غەمی تۆمە
بەدڵ من غەم ئەخۆم بۆ ئەو کە ئەمرۆ لە دایك بێ
هەم لەنگەو هەم مانا شێواو. راستێکەی بەم جۆرەیە
سەری من وا لە گوێی قەبرا ئەلەرزێ کەی غەمی خۆمە
بە دڵ من غەم ئەخۆم بۆ ئەو کەسەی ئەمرۆ لە دایك بێ

**١٠٨ ـ ل ٣٣٣ ـ د ٣**

**هەر لە ئەوەل سفـری مەدرەسـە، مامـۆسـتـاکـەم**

(سفری)نی‌یەو (سە فەری)یە، واتە یەکەم رۆژی چوونم بۆ قوتابخانە.

**١٠٩ ـ ل ٣٣٥ ـ**

شیعـری (پـەپـوولە) وەك ناوەرۆك و مەبەستی شاعیر بابەتی شیعری بۆ منداڵ نی‌یەو هی گەورەیە.

**١١٠ ـ ل ٣٦٣ ـ د ٣**

لە دەستی خونـدەوارانـا ئەگـەر چ ئەمـرۆ بێ قەدری (خـونـدەوارانا) نی‌یەو (خوێندەوارانا)یە، (چی)یە بۆ ئەوەی لەنگ نەبێت.

**١١١ ـ ل ٣٦٤ ـ د ٦**

سبەینێ یەك بە یەك ئەیدەمیتەوە بۆ نەو جوانانە

ماناکەی نایەت. وشەی (بۆ) نی‌یەو (بەو)ە جا راست دەبێتەوە

**١١٢ ـ ل ٣٦٤ ـ د ٧**

بەهێزو قووەتی خۆت بانگ ئەدەی بۆ سبحەینێ لەنگەو وشەیەکی ناتەواوە.

**١١٣ ـ ل ٣٧٠ ـ د ٨**

واسیـطەی ئەم بیر کەوتنەوەم بۆ نەقڵی ئەم بارزانەبوو لەنگە. چونکە (ئەم)ی یەکەمی زیادە.

**١١٤ ـ ل ٣٨٢ ـ د ٧**

**ـ واز لەم و بینە. هەر بۆ ئەو بەرەی شەکوای دڵت لەنگە. (لەم و) نی‌یەو (لەم و لەو)ە**

**١١٥ ـ ل ٣٨٢ ـ د ١٣**

ئەوەڵی حەرف هەموو میسرەعەکان کۆببنەوە لەنگە. رەنگە (میسرەع ئەگەر) بێت لە جیاتی (میسرەعەکان).

**١١٦ ـ ل ٣٨٧ ـ د ٧**

ئەی عصبـــة الامم وەصی ئەقـــەوامی رووی زەمـــین (ئەقەوامی)، (ئەقوامی)یەو هەڵەی چاپە چاك نەکراوە

**١١٧ ـ ل ٣٩٩ ـ د ٢**

لەگەڵ نیگاری زاراوەی شیعرم

دیارە (زاراوەی) نی‌یەو (رازاوەی)ەیە

**١١٨ ـ ل ٣٩٩ ـ د ٩ و ١٠**

(بەلاَبێ) و (سزابێ)نی‌یە، (بەلاَبی)و (سزابی)یە چونکە لەگەڵ تۆیەتی

**١١٩ ـ ل ٤٠٢ ـ د ٢**

کاول بووە، جێی کوندە بووە شاری مووەف

(مووەف)نی‌یەو (مووزەف)ە هەموو وشەی مووزەفەکان بە ناو نیشانە کەشیانەوە بە رێنووسێکی هەڵە نووسراون.

**١٢٠ ـ ل ٤٠٢ـ د ٣**

خوێنی جگەرە بووەتە شەراب و مەیی مەئموور لەنگە.

(بووەتە) نی‌یەو (بۆتە) یە. (شەراب)یش (شەراب)ە

**١٢١ ـ ل ٤٠٣ ـ د ١**

مەئمـــوور وەکـوو شێخ هۆمەرو وەزعیش بە میسلی مار لەنگە. (بە میسلی) نی‌یەو (بە مەسەل)ە

**١٢٢ ـ ل ٤١٨ ـ د ٤**

عیشـــوەی (شرینێ) صەد فەرهــاد ئەخـاتـە بیستوون لەنگە. وشەی (عیشوەیی)یەو (شرینێ، (شیرینێ)یە

**١٢٣ ـ ل ٤١٩ ـ د ١**

نابینمەوە لێرە یەکێ یارو وەفادار

لەنگە. دوای (نابینمەوە) وشەی (من) یان (قەت) هەیە.

**١٢٤ ـ ل ٤٣٠ ـ د ١١**

(نیل) نی‌یەو (نیر)ە

**١٢٥ ـ ل ٤٣٠ ـ د ١٣**

بە قاڵو ئەم شتانە هیچ نی‌یەوە ختێ نابووت بوو لەنگە. پێش وشەی (نابووت)، (کە) یەك راستی دەکاتەوە

**١٢٦ ـ ل ٤٣٤ ـ د ١**

دایگرن توخدا. فرێی بدەن، بیخەنە تەندوورەوە لەنگە (توخدا)، (تووخوا)یەو(فرێی‌بدەن)، (فرێ دەن)ە دێری (د)ی ل ٤٣٥ و (٥)ی ل ٤٣٦ یش هەروایە.

ئێستــەش، ... شیعـرد بە نرخانەی ماموستا شێخ نووری شێخ صالحم لە بێژنگ و کەوی سەرنج و چاو پیـا گێرانەوەدا، توانیم ئەم چەردەیە سەر کۆزرو پووش و پەلاشی هەڵەو ناتـەواوی لێ بگـرم و بە پێی توانـا راستیـان بکـەمـەوە. هیوادارم بەدڵی ئەوانە بێت کە تامەزرۆی شیعرو ئەدەبیاتی رەسەنی کوردین و سوپاس و رێزیشم بۆ هەمووان.






# لایەنە میللیەکان لەرۆمانی هەڵکشاندا


نووسینی:
یوسف رۆستەم ئەحمەد


**[ئەم گشت کەلووو ئاسمانانە، مروڤ والیدمکەن هەست بە بچووکی خۆی بکات.. هەڵکشان ل ١١٠]**

رۆمان ئەو چیرۆکە دوورو درێژو تێرو تەسەلەیە کە، بۆ مرۆڤ و سەبارەت بە مرۆڤە. رۆماننوس کۆمەڵە کەسێکی ئاشوو بیو خەیاڵی دادەهێنێو بە ئارەزووی خۆیو لەراددەی مەعقولییەت کاری درامیـان پێدەسپێرێت. یانـەخـۆ کۆمـەڵێـک خەڵکی راستـەقینـە بە ناوو ناتـۆرەیـانـەوە دەقۆزێتەوەو وورد وورد بەسـەرهات و سەربردەیان بەشێوازێکی ئیقاعیو بە جۆرەها تەکنیك و هونەری نووسین دەگێڕێتەوە.

لە رۆژگـارەکانی رێنیسانسدا ئەم هونەرە چەکەرەی کردو ریشەی داکوتیو تانوپۆی بە هەموو لایێکدا هەنارد ئیدی، وەکو لایـەنێکی ئەدەبی سەربـەخـۆ بەنێـو گەلە پێشکەوتووەکانی ئەوروپادا بڵاو بۆوەو بەوەشەوە نەوەستا، چەندان داهێنیان و نوێخوازیو گۆرانکاری، لەگەڵ سوورانەوەی خەرەکی رۆژگاردا بەسەرداهات و وەکو پێویستێکی ژیان بە هەموو گۆی زەویدا بڵاو بۆوە.

(نەتەوەی کوردیش لەم لایەنەوە مێژوویێکی دوورو بەرچاو روونی نییە، جا ئاگردانی نەتەوەیێك لە رووی خوێندەواریو چاپەمەنییەوە هێندە بێتین بێو ماوەیێکی درێژی تێنەپەراندنی لەم مەیـدانـەدا چۆن چیرۆك لەزەوییەکەیدا سەوز دەبێو بە خەملاوی دێتە بەرچاو.. ئەمە جگە لەوەی کە ئەم هونەرە بیرێکی فراوانی گەرەکـەو ئەدەبی هەر میللەتێکیش پێویستە پلەیێکی پێگـەیشتن ببـرێت و خوێنـدەوارەکـانیـان رۆشنبـیریێکی بەربڵاویان هەبێت تاکو .چیرۆك بنجی داکوتێو بە نەرمەباییك هەڵنەکێشرێت )

بۆ یەکەمجار جەمیل صائب لە ساڵی ١٩٢٥دا لە رۆژنامەی ژیـانـەوەدا بەشی یێکەمی چیرۆکی «لەخەوما»ی بڵاو کردەوەو پاشـان بەبیست وسێ زنجیـرە لەسـەر لاپـەرەکانی «ژیانەوەو ژیـان»دا بڵاویکـردەوەو بە ناتەواوی وازی لێهێنا. ئەگەر ئەم

چیرۆکە بەبناخە دانانی چیرۆکی هونەری کوردی دابنرێت، ئەوا هەوێنێکی چاکیشە بۆ پێگەیاندنی رۆمانی دوارۆژی کوردی (لەرووی ناوەرۆکیشەوە ئەم چیرۆکە دەچێتە خانەی ریالیزمی رەخنەگرانە Critical Realism کە سیمایێکی مێژوویی پێوە لکاوە لەکات و سەردەمێکی دیاری کراودا... لەمەیشەوە بەو راستیە دەگەین کە چیرۆکی کوردی لە سەرەتاوە بەم رێبازە هاتۆتە کایەوە کە پەردە هەڵماڵینە لەرووی ناکۆکیو دژوارییەکانی کۆمەڵ و وورووژاندنی کرۆکی مەسەلە جۆربەجۆرەکانی ژیان و پێشچاو خستنیان)[٢] دووەم پێکول لەم بارەیەوە لە لایەن شاعیری بە سۆزو خرۆش «ئەحمەد موختار بەگی جاف)ەوە بوو کە، لە سالانی ١٩٢٧ـ١٩٢٨دا خۆی لە قەرەی نووسینی چیرۆکێکی درێژی وەکو (مەسەلەی وویژدان)دا

(ئەو رەنگەی بۆ ئەم چیرۆکە رێژراوە رەخنە گرتنێکی گشتلاییە لەبارو زروفی کۆمەلایەتیو کنەکردن لە کرۆکی نهێنیەکانی[٣] دوا بە دوای ئەوانیش (جەمال بابان بەچیرۆکی (لالۆ کەریم) ١٩٥٦ و (مستەفا سالح کەریم) بە چیرۆکی (شەهیدانی قەلای دم دم) ١٩٦٠ و (پێشمەرگە)ی (رەحیمی قازی) ١٩٦١ و (ژانی گەل) ١٩٧٤ (بلە) و (قەلای دم دم)ی (عەرەبی شەمۆ) و (نازە)ی ئیسماعیل رۆژبەیانی.. ئیدی رۆمانی کوردی وورده وورده قالبی هونەری وەرگرت و شان بە شانی بەشەکانی دیکەی ئەدەب کەوتە نەرمە پێنگاو تا (شار)ی (حسێن عارف) بە یەکجاری لاپەرەی بەسەر قۆناخی یێکەمدا هەڵدایەوەو خۆی هاویشتە قۆناخی دووەمی یێگەیشتن و سەرکەوتن، دوا بە دوای ئەویش (تووانەوە)ی (غەفور صالح عبدالله)و ئەمجا (کۆردەرە)ی (خوسرەو جاف)و ئەمجا (هەڵکشان بەرەو لووتکە)ی (عبدالله سراج) کە، ئەمێستا خەریکی لێدووان و لێکۆڵینەوەی باری میللیتیو خۆماڵیتی ئەو شاکارە مەزنەین. سەرەتا چاکتر وایە گفتوگۆیێکی سەرپێیی لەمەر پەیکەری ئەم رۆمانەوە بکەین بەڵکو ئاسانتر بچینە قوولایی مەسەلە میللییەکان.

هەڵکشان بەرەو لووتکە؛ ئەو رۆمانەی پێنج ساڵ بەزەلیلی لە چاپخانەکاندا مایەوەو رۆشنایی نەبینی تا لە کاتێکی زۆر درەنگدا چاپ و بلاو کرایەوە. ئەم رۆمانە مێژوویی کۆمەلایەتییە بە دوو دەرییەی زەمەن سەربردەی قەلەندەرانی جیهان لە ئاوێنەی شاری بێنازی دووکەڵ و باوتۆزدا نیشان دەدات.

دەرییەی یێکەمی زەمەن بە دیوی دەرەوەدا دەروانێ کە، لەبن دارزەیتوونە پیرۆزەکانەوە لەسالی (١٩٤٦)ەوە دەست پێدەکات و لەنێوەراستی شەستەکاندا دوایی بۆ سەرەتایێکی یەکجار مەزن دێنێت. رۆژان و مانگان و سالان چەشنی شایی جنۆکان مل ملانێ دەکەن و پێش و پاش دەکەون [رۆژان بوون بە هەفتە، هەفتان یەکیان گرت و بوونە مانگ، مانگان کەڵەکەیان کردو بوونە سال و سال هات و سال چوو، خەرەکی رۆژگار سوورایەوە]. هەڵکشان ل ٥

**دەرییەی دووەم بە دیوی ناوەوەدا دەروانێ، دیوی زیندەخەوو ئاشووب و زەمەنی بزربووو تووورەکەرێژی نەبوخوزنەسرو پێغەمبەر دانیال و ئەمجا پێش زانیو داهاتوو [.. نەوت.. نەوت.. نەو.. نەوەی داهاتوو] ل ٥٤**

بۆ گەیاندنی مەبەست بە راست و دروستی، سەرتاپێی رۆمانەکە بە جۆرەها تەکنیك جۆشدراوە، بەگەرانەوە بەرەو پاش و چوونە ناوەوەی کەسەکان و مۆنتاجی سینەماییو خەون بینین و جەفەنگی جۆراوجۆرو ئیدیۆمی بە توێکڵ و پەند و هەقایەتی پیروپێشینان و پروپووچی تەشەنەکردووی هەزاران ساڵەی ئەم میللەتە قەلەندەرە، لەژێر چاودێری هەلۆی سپیی سەر منارەکەی دانیال پێغەمبەر دەردەبردرێت توفیقی قالە هەرزانی؛ پیاوێکی کەساس و کولاوی چەرمەسەرییەکانی ئەم شارە گەرمەسێرەیەو دانیشتووی گەرەکی سەیسەرومەری بەری ئیمام قاسمە. دوو کەنیشك و سێکوری هەیە، لەگەڵ خاتەی ژنیو نەنەئایشێ دایکیدا مالێکی هەشت سەرخێزانی رووت و رەجاڵ پێك دێنن. تۆفیق لەنێوان دوو بەرداشی زل دایە، بەسەرێکەوە برسێتیو بەسەرێکی دیکەشەوە ستەم و خوێن مشتنی حەمەشین، کامیان سەردەکەوێ! دەنگی زیرەی برسێتی یان هاواری وویژدان، تۆفیق ماوەیێك لەم نێوەندەدا خول دەخوات و مێشك دەگوشێ، تا لە ئەنجامدا [سەری بێ رزق لە ژێر خاکدایە] ل ١٨٣ بریاری خۆی دەدات و بەگژ حەمەشینی بەلێندەردا دەچێت. ئەگەرچی ئەو بەگژداچوونە کارێکی تاکرەوانەیەو هەوڵ و تەقەلاکەش وەکو بلقی سەر گۆم بەفیرۆ دەچێ. حەمەشین هەر حەمەشینەکەی جارانەو مووییێکی لێنەبزواوە. پاش ئەو دەرکردنە تۆفیق وەخۆ دەکەوێو بە دەستەقەرزی مام عەلیو رۆژانەکەی نەوزادو هێندێ شتی ناوماڵ دەفرۆشێو دەست دەکاتە ووردەوالە فرۆشتن لەسەر

شەقامەکان. هەر ئەو کاتەی دەرباری حەمەشین کاری دەکرد سەردانێکی کن حەمەسووری ئاشنای کرد لە چوارباخ، پاش ئەوەی هەواڵی لە ئەسکەلە کەوتنەکەی زانی.

حەمەسوور گەچشێلە وەکو خۆی دەڵێت لە سێیەمین پلەی کرێکاریدایە. هەر لەسپێدەوە دەبێ لەسەر کوچکە بەردێك رۆنیشێت و دەست بکات بە گەچ شێلان هەتا بەرەبەری ئێوارە جا چۆن ئەم گەچشێلە چووە سەر ئەسکەلەو بەربووە کە، بەزۆری ئەم کەوتنانە بەشی وەستاو خەلفەن.. تۆ بڵێی حەمەسوور بەرێکەوت رێی کەوتبێتە سەر ئەسکەلە!؟. تۆفیق ناوبەناو سەر لەخاڵۆی دەدات و هەر لەوێشدا ئەورەحمانی «کاتبی نفووس»ی ناسی کە لە دوواییدا دەبێتە هاورێیێکی گیانی بەگیانی تۆفیق. ئەورەحمان زۆری پێناچێت لەسەر بیروباوەرەکەی دەگیرێت و توندی بەندیخانەی دەکەن. گیرانی ئەورەحمان دەم بەدەم دەگاتەوە تۆفیقو هەر لە خەڵکیشەوە دەبیسێت کە چۆن ئەورەحمان بەسەربەرزی رووی لەژووری وەرزش دەنا. بە هەرچی دەردی سەرێك بووبێت نامەیێکی بە جفرە بۆ تۆفیق دەنێرێتە دەرەوە. هەڵهێنانی جفرەکەش مەرگی ئەورەحمان دەگەیێنێت. زۆری پێناچێت لەلای چایخانەکەی مەجیدیەوە کابرایێکی نەناسراو هەواڵی گیرانی حەمەسووری پێدەگەیێنێت. [ووریابە. زێویەیان باسقوون کردو حەمەسووری هاورێت گیراوە] ل ٧١.

بەرچاوی تاریك دەبێت. گەرچی هیچی بە خۆی شك نەدەبرد بەڵام چاکتر وابوو بۆ ماوەیێکی کەمیش بێت خۆی لەبەر چاوان گووم بکات و بچێتە ناو خزمانی. خاتەش تەگبیری چەرچێتی بۆ کرد لەوێدا بیکات. بۆ ماوەی چەند هەفتەیێك خۆی بزر دەکات. پاشان کە، گەرایەوە دەنگ وباسی راکردنی حەمەسوور دەژنەوێت لەگەڵ دووکەسی دیکەدا بەڵام چۆن سێ‌کەس لە گرتووخانەی گشتی هەڵدێن و ئاودیوی شەقامی ئەتڵەس [illegible]. نهێنی ئەوە لەلای سالاری نەعە شەکرچی دەسگیر دەبێت و ئەو نهێنیەش دەبێتە مایەی ناسین و نزیکبوونەوە لەسالار پاش دەم و دوو سالار پێشنیاری ئیشێکی پوختەشی بۆ دەکات لە کۆمپانیای کات C.A.T کە خۆی سێ‌مانگەی هاوین ئیشی تێدا دەکات.

تۆفیق بە ئاسانی لەوێدا دادەمەزرێت و ووردەواڵە فرۆشتنەکەشی بە نەوازدی کوری دەسپێرێت کە، پێشتر شاگردی پەنچەرچی بوو. پێشان بە کرێکاریو دووایش ناونووسی کرێکارانیان پێی سپاردو لەوێدا سیامەند ناوێکی دەربەدەر دەناسێت کە لە دەوروبەری کۆیە ژنی هەڵگرتووەو لە ئیمام قاسم خۆیان شاردۆتەوە. دووایش کە، باوك و برای ژنە جێ حەشاریان دەدۆزنەوە، هەڵدەکوتنە ماڵیان و سنگی ژنە هەڵدەدرن و سیامەندیش چ لە ترساناو چ بۆ تۆڵە سەندنەوە، دەرواو بێ سەروشوێن بزر دەبێت.

پاش ئەوەی سالار لە پەیمانگای هونەرە جوانەکاندا دەردەچێت روو لە تۆفیق و عەلە گورگەو سالەی ئەمینەمۆتیو خزمێکی دەنێت بۆ ئەوەی خوازبێنی نەخشینی مام ئۆمەری بۆ بکەن. پاش خوازبێنییەکە مارە برینیشی بەسەر داهات و ئەمجا زەماوەندیش گێردراو لەکاتی بەزاوابوون و تەق و تۆق [کەسێك بەوەی نەزانی کە، شێرە لەناکاو کەوت و گەوزایە خوێنی خۆیەوە.. لەوەدا بوون بێنە دەست کە شێرە گیانی سپارد] ل ١٠٩ هەر بۆ ئەوەی دیزە بە دەرخۆنە بێت تۆفیق راوێژ لەگەڵ نوورەکەچەڵ دەکات. [واچاکە کچێك لە کچەزاکانی نەعە شەکرچی لە سمکۆی کورت مارە بکەیت و ئاشتەوایی بکەوێتەوە] ل ١١١.

دیارە ئەم ئاشتە گورگانەیە بە سەرێکەوە چارەسەرێکی بنجیو بنەرەتی نییە بۆ ئەو رووداوو کێشەیەو بەسەرێکی تریشەوە کەسێکی وەکو تۆفیق بە هیچ جۆرێك بروای بەم ژنخوازییەو چارەنووس دیاری کردنە نییە بەڵام، دوواکەوتوویی بیری میللەت و هەژاری لەلاییەك و هەلپەرستێتی نوورەکەچەڵ لەلاییکی ترەوە پاڵ بە تۆفیقەوە دەنێن داوای ئەو ئاشتەواییە بکات.

لەبەر هەر هۆیێك بووبێت تۆفیق بریار دەدات ماڵ لە سەی‌سەرووەرەوە بۆ رەحیماوای پشت کارگەی کۆلا بگوێزێتەوە. [ژوورەکەمان لە ماڵێکی پێش کونجەکەی سۆفی محێدین بوو].. ل ١٤٤. منداڵەکان دەگوێزنەوە قوتابخانەی سەرکەوتنی کوران و خانزادی کچان. نەوزادیش لەگەڵ [کورێکی کرێکاری ئاشنام رێکەوتن لە کۆشکەلی ئۆتۆمبیل بشۆنەوە].. ل ١٦٤ سۆفی محێدین ئەندامێکی ئاشکراو دیاری ئەو کۆڵانەیە بوو. [کەس نەبوو لەو گوزەرەدا سۆفی محێ‌دین نەناسێ... سۆفی لەو جۆرەکەسانە نەبوو کە زوو لەیاد بچێت. کورتە بنەیێکی ریش تۆبزی ماش و برنج بوو، وەلێ تێکەولێکەی ژیان بەشە

برنجەکەی دوو هەندەی ماشەکە لێکردبوو] ل ١٥٨.
پوورە چیمەنی خێزانی لە مێژووییکی نەزانراودا بە یەکجارەکی سۆفیی بە بێــومــێردیو تەنیــایی بەجێ دێــڵێ و پێش تریش [دەگــێڕنــەوە گوایــە لە گرانییــەکــەدا کورو کچێکی لە ژنــە ئەرمەنییەکەی پێشوی هەبووەو لە مانگێکدا بەر دروێنەی ئاوڵە کەوتوون] ل ١٥٨.
سۆفی وورده وورده دەست لەکــار دەکێشێتــەوەو دەداتە پاڵ زیکروفیکرو ئاینداریو هەر بە ئومێدی دیداری خدری زیندە چل سپێــدە نوێــژ لە مزگــەوتەکەی دانیاڵ پێغەمبەر دەکات.
**دوواجــار کە، هیــچ سەبــارەت بەخــدری زیندەوە نابینێت و نابیسێت، لەســەری دەداو شێت دەبێ. هاوسێییکی دیکــەی توفیق مام فەتــاحی کوڵهــەڵگرە کە، بەبــازارەکەی رەحیماواو دەوروبــەریــدا دەخــولێتەوە بۆ هەڵگرتنی شتومەکی خەڵکیو** دلێری کوریشی کە، هاورێــی نەوزادە غەزاتــە فرۆشی سەر شەقــامانە [خاوەن کارگەی حەڵواکە... بەپەنجەی فیز داوای نزیــك بوونــەوەی دلێری کرد، دلێریش لەتــرســانــا باوەشــە رۆژنــامــەکــەی لێکــەوت. کابــرای خاوەنــد کارگــا پەلاماری نەرمەگوێی داو نینۆکی لێتوند کرد. دلێر هاواری گەیشتە سەر شەقامەکە.
- هەی سەگبابی خوێری. بۆ پا دەکەیتە ئەم کارگەیەی منەوە] ل ١٨٥ دووای ئەو سووکایەتی پێکردنە ئیدی دلێر ببرای ببر رۆژنــامــەی نەفــرۆشــتــەوە، ئەویش چووە ریــز نەوزادو حەمەگەرمیانیو پێکەوە کەوتنە ئۆتۆمبیل شۆرین لە (کۆرشکلی).
دڵپــاکیو سافیلکەیی زۆر کەسی وەکو مام فەتاحی بە دەردی سەری بردووەو هی وەکو شیرینی ناسك و تەر هەردەم بوونەتە قۆچــی قوربــانی. ئاینــداریی پیرەی دوکــانــدار بەســە بۆ هەڵخەڵەتاندن و فریودانی هەزارانی وەکو مام فەتاح تا شیرینی کچی بداتێ. [- نەوزاد، حەوتەیەکی تر مارەی شیرینی خوشکم دەبــرن.. لەتــەرە فرۆشــەکــەی خوار مزگــەوتــەکە] ل ١٨٨.
نەوزادیش نەك هەر لەبــەر نارەوایی کارەکە، خۆشی مرخی لە شیرین خۆش کردبــوو. ئەم دوو پاڵنــەرە وایان لە نەوزاد کرد هەڵوێستێکی ئیجــابی بەرانبــەر ئەو مەســەلەیە وەربگرێت و دەبینین بە تەوسەوە بە دلێری هاورێی دەڵێت؛ [- شیرین بۆ ئەو پیرە! باوکت لای خۆی دیندارە! چۆن کاری وا دەکات!!].. ل ١٨٩ ئەم رووداوە لەســاڵی پەنجــاوهەشتدا رووی‌دا هەر لەو ساڵەشدا تەخت و تاراجی پاشایەتی رووخاو رژێمی کۆماری هاتە کایە [لەوەتی پاشایەتی نەماوە. شیرین بۆتە تەوقی ئاگرو لە گەردنی مام فەتاح ئالاوە! ووتوویە: «ئەگەر بمدەن بەو پیرە، ئاگر لەخۆم بەردەدەم و حەیای بەرودووای ئێوەش دەچێت.] ل ١٩٧
بێگــومــان لە زۆربــەی کاتــدا دایك بەر لە هەموو کەسێك لە رازونیــازی منــداڵ و جگــەرگــۆشــەکــانی تێدەگات [خاتە بە نەرمی‌یەکەوە گوتی: - دەبێ دڵی بەشیرینەوە نەبێت!] ل ١٩٠.
کە دایکەو باوکە هەردوولا شیرینیان زۆر بە دڵ بوو. [خاتە - شیرین کچێکی چاکە هەر نەبێ با نیشانی بکەین. توفیق - ددبێ مام فەتــاح دەست بە روومــانــەوە نەنێ. خاتــە - پەلێکــەو دەیهاوین] ل ١٩٧.
چەند رۆژێکی پێچوو لەولای دووکانەکەی رەشە جامباز توفیق و مام فەتــاح ئامبــازی یەك دەبن و توفیق نیازی وایە بەهەر کلۆجێك بێت سەری ئەو باسە بکاتەوەو تامی زاری مام فەتاح بکات کەچی ئەو هەلەی بۆ ریناکەوێ. کە، دەگەرێتەوە ماڵ لە کن خاتە مەسەلەکە دەگێرێتەوە: [- دەرفەتم بۆ نەلووا کە تام وبــۆی دەمی بزانم بەلام، بەیەکجاری پیرە بەدەکەی نائومێد کردووە.] ل ٢٠١
بەم پێــودانگە دەبێ لە ماوەییکی زۆر کەمدا توفیق خوازبێنی شیرین بکــات بۆ نەوزاد کەچی، وەکــو شتێك لە یاد بکرێت، نووسەر نەوزاد بە هەناسە ساردییەوە بەجێ دەهێڵێو هەر بە ئەوینی دووربەدووری راپاندەگرێت.
هاوینــانی ئەم شارە گەرمــەســێرە هێنــدە گەرمــە، مرۆ لەســەربــانیش ناحــەوێتــەوە.. ئیدی خەڵکی هەر لەکــۆتایی بەهــارەوە سەردەکەونە سەربان هەتا بەرەبەری پاییز. کە بای پاییز گفەگڤی کرد ئەمجا تێکرا دێنە خوارەوە. [کەواتە دابەزنە خوارەوە، کاتی سەربان نەماوە] ل ٢٠٤ لەمەوە واتێدەگەین کە لەسەربان دەخەون کەچی: [من زەقەی چاوم هات و گوێم لە سیســارکی ژوورەکە بوو (شەوی کپ و بێدەنگ کە هەر دەنگێکی تری هەڵلۆیشی، نۆرە دێتــە سەر مشــك و سیســارك و کێــخ و مێشوولەو گوڵێ‌ستێرە. تەراتێن دەکەن.
سێرمیان دێت..] ل ١٩١. خوێنەر کە لەم تابلۆیە وورد دەبێتەوە وا هەست دەکات لە نێو تاریکستانی ژوورەوەدایەو لە جیاتی حەپــە حەپی سەگ و لوورەو قریوەی توورگ و رێوی دەنگی

سیسارك و مشك دەژنەوێت كە، ئاشكرایە مشك لە ناو كەندووو بن دۆڵاب و ژێر قاپ و قاچاخ، چۆن دەنگی دەگاتە سەربان. نەنــە ئایش رۆژ بەرۆژ باداریــەكەی تاوی لێدەستێنێ [ئەم بادارییە لە كەڵكی خستووم] ل ١٨٤ و لەنێو رۆمانەكەدا دەنگی كز دەبێت و تا لە ئەنجامدا ئیفلیج و كتوكوێر دەبێت [تۆفیق، دایكە كەنفت و بێكەڵكەكەت بە تەواوەتی ئیفلیج بووەو لەسوێی تۆش وا ئاوی سپی زایە چاوە كزەكانیو قوڵانجێك نووای خۆی نابینێ] ل ٢٣٦ تا بە یەكجاری لەرۆژگارێكی بزردا چرای ژینی دەكوژێتەوە، هەواڵی مردنەكەش تا رۆمانەكەش تەواو دەبێ هەر ناگــاتە تۆفیق **[ئەوا بووە دوو ساڵ و چەند مانگێك باوكم نەدیوە. لەبارەی نەنكیشم ئاگادارمان نەكرد، نەبادا باری سەرشانی گرانتر بێت.] ل ٢٨٥.**

پاش ئەوەی تۆفیق لەبەر هەر هۆیێك بووبێت واز لە كۆمپانیای كات دێــنــێــت و دەست دەداتــە كرێكــاری. سێ رۆژ بەر لە سەرنگوون بوونی رژێمی پاشایەتی، وەكو حەمەسووری كۆنە هاورێی لە ئەسكەلە بەر دەبێتەوەو پەراسووێكی دەشكێت، سێ رۆژ لە نەخۆشخانە دەیخەوێنن تا خاتە بە تكاو پارانەوە دەری دەكات و پاش چەند مانگێك چاك دەبێتەوە. بەلارەلار دەچێتەوە سەركــار لە دڵیشــدا ئومێدێكی تەواوی بە نەقابەی كرێكاران پەیدا كردبوو.

**[بە شەلەشەل خۆم پەلەكێش كرد بۆ لای وەستاكەم خاتە دەم بە نزاو پارانەوە بوو هەتا بە نائومێدی نەگەڕێمەوە.] ل ٢١٢** لە پاییزە ساردەكەی ساڵی شەست و یەكدا [سێ كەس لە كۆشی خێزانەكانیان دوور كەوتبوونەوە. حەمەسوور نەیویست ببێتە كوتەك و لەشەوێكی ئەنگوستە چاودا، لەگەڵ نازەی ژنیدا، پۆشاك و كاسەو كەویلیان پێچایەوەو روویان كردە ماڵی باوكی نازە لەو بنــار شاخــانە. سالاریش وەكو تنۆكێك ئاو هەڵچوو. ئەوەش لە نەخشین پرسیاری بكردبایە دەیگوت:

«نەقڵی ئەو خوارە بووە» منیش زەنگی كاروان رایكێشام و بوومە تەتەری نێوان دێهاتی ئەو نسارو تەلان و زەبەنگانە.] ل ٢١٥. تاكــە ئامــانجێــك ئەم سێ كەســەی لە ئامێزی خێزانەكانیان راپسكاند ئەویش داهێنانی رۆژێكی تیشك زەردی نوێ بوو بۆ تاریكستانی دەردو نەخۆشییەكانی ئەم میللەتە رەش و رووتە.

پاش ئەوەی تۆفــیــق وەدووی زەنگی كاروان كەوت، نەوزادی كوری بووە كۆڵەكــەی ماڵ و سەرپــەرشتی خێزانەكەی گرتە ئەستۆ، بە رۆژ كاروكاسبیو بە شەویش قوتابخانە [ـ ئەویش وەكــو من بە شــەوان دەچێتــە قوتابخانە.] ل ٢٨٦ كە نەوزاد لێرەدا لە قوتابخانەی شەودا بخوێنێ، لەپێشتر پێچەوانەی ئەوە دەبینــین؛ [تــەنیــا نەوزاد نەبێ كە بە یەكجــاری لە خوێندن دابرا...] ل ١٩٥ تۆ بڵێی نەوزاد پاش وازهێنانی لە خوێندن دیســـان گەرابێتــەوە؟. ئەو نسارو تەلان و زەبەنگانە نەك هەر تۆفیق بەڵكو زۆر تەتەری قەلەندەری دیكەی وەكو ئازادو میرزاو شێركۆو هەزارانی دیكەی لەئامێز گرت. هەر لەوێدا كۆتایی بە رۆمانەكە دێت بۆ دەست پێكردنی سەرەتایێكی مەزن.

ئەوەی شیاوی باسە لێدوان و لێكۆڵینەوە لەگشت لایەنە جۆر بەجۆرەكانی ئەم كەڵە رۆمانە كارێكی ئاستەم و نابەجێیە. ناچار پێكــولی خۆم بۆ لایــەنی میللێتیو كوردانەی رۆمانەكە كورت دەكەمەوە، كە بە بۆچوونی من ئەم لایەنە زەقترو ئاشكراترە لە هەموو لایەنەكانی دیكە كە بۆ پسپۆری خۆی بەجێیان دێڵم.

[هــەر ئەم باوە گورگــورەش، سەردەمــانێــك، چوارشــەمووان پەناگەی ئەو ژنانە بوو كە منداڵیان نابوو یان كۆرپەكانیان لەپار دەچوو. بۆیە بەپارانەوەو نزاوە، ئافرەتێكی لەو بابەتە دەیگووت؛

**باوە گور گور      هاتم بە گور**
**بە گور هاتم      بۆ كور هاتم**

بەر لەوەی ئینگلیز بە یەكجارەكی دەست بەسەر نەوتی كەركووك دابگرێ، لە رۆژی چوارشەمووانیدا ئافرەتانی نەزۆك و وەجاخ كوێر پۆل پۆل بۆ مراز دەسگیر بوون بۆ ئاگری باوە گور گور دەچــوون. زۆر مایــەی سەرســورمــانی خەڵكــەكــە بوو كە، دەیانبینی لە زەوییێكی درز درزدا گڵپەو ئاگرێكی بە نێڵەنێڵ دەردەچێو بێبرانەوەو كزبوون هەر لە تین وتاوی خۆیدایە، تۆ بڵێی ئەو سەیرو سۆبەتە گۆری پێغەمبەرێك یان ئەسحابەیێك یان پیــاو چاكێــك نەبێت، زەوییێكی رەق چۆن ئاگری لێ بڵند دەبێ. لە هەمــووشی سەیــرو سەمەرەتر، لەو لەتكە دۆزەخەدا جۆرە كرمێكی نەرمۆڵەو نیان دەژیت، لەگەرا دەتروكێن، فەراقە دەبن و پێــدەگەن، زاوزێ دەكەنەوەو ئەمجا خۆیان لەو ئاگرە دەهــاون و قرچــە قرچــە دەســووتێن. ئەم دیاردە سروشتییە بێگــومــان، سەرنجی خەڵكەكەی راكێشاوەو پێبەپێو لەگەڵ سوورانــەوەی رەورەوەی رۆژگــاردا ئەفســانــەو پروپووچیان بەسەردا بریوە، بۆ گەیشتن بەو ئاواتانەی كە هەرگیز مرۆڤ لە توانستیدا نییە بەدییان بهێنێ. ئەو ئاگرە بە بۆچوونی ئەوان

گۆڕی پەیامبەرێك یان نزرگای وەلییێکی نوورانییەو بازنەی پێکگەیشتنە لە نێوان مرۆڤ و خوداوەندا، خۆ ئەگەر واش بێت چی بکات لەگەڵ لەکار کەوتنی پرۆستاتی پیاو یان ئەو تۆوانەی کە بەرهەمی دێنێت بێکەڵك بن تووانای کوتانی هێلکەی ئافرەتیان نەبێت، یان زێو هێلکەدانەی ئافرەت ئەگەر لەبار نەبن بۆ زاوزێ.

**[دەزانی جاران، هەرکەسێك لەم شارەدا پارەو خشڵێکی بدزیبایەو کوماڵی بکەوتایەتە سەر، جغزی ئیمام عەباسیان بۆ دەکێشا!.. بە گەچ لەسەر زەوی بازنەیەکیان دەکردو گومان لێکراوەکە دەبوایە بچێتە ناو ئەو بازنەیەو ئەوسا ئەگەر دز نەبوایە، لووس و باریك لێوەی دەردەچوو. خۆ ئەگەر تاوانبار بوایە ئەوا قەڵەمی دەست و ئەژنۆی دەشکاو، دزیەکەی ئاشکرا دەبوو!!] ل ٧**
زۆر جار مرۆڤ بە نەزانی خۆی شتێك دادەهێنێ کە لەوانەیە بەبیری هیچ زانایێکی بیر تیژی هەندەراندا نەیەت. کەسێکی گومان لێکراو دەخرێتە نێو بازنەیێکی لە گەچ دروست کراو، ئەگەر پاك بێت راست و روان لێی دەردەچێت «ئەوی پاکە لە موحاسەبە بێباکە» خۆ ئەگەر دزیش بوو لە دیوی دەرەوە کۆمەڵێك کینە لە دڵ زەق زەق تەماشای دەکەن، ترسی ئیمام عەباسیش لە دیوی ناوەوەی بێهەستیدا بووەستێ. ئیدی دزەی کلۆڵ نەك بەهێزی خوایانەی جغزی ئیمام عەباسەوە بەڵکو، بەو هێزە دەروونییەی لە نیگای خەڵکەکەوە دەردەپەڕێو بەو ترسە دەروونییە کەپکە کردووەی نێوهەستی، قەڵەمی-دەست و ئەژنۆی دەشکاو دزییەکەی لێ ئاشکرا دەبوو، تۆڵەی سەردەرێو بەردەرێی لێ دەکرایەوە.
**[ئەوەی بەزاوانەبێت کەسوکاری وای لێکدەدەنەوە گوایە بەستراوە. بەستنیش ئەوسا دەبێت کە مەلا سەرقاڵی مارەبڕینە. ئەوەی ئەو نیازەی هەیە لەو کاتەدا، چمکی سەر پۆشەکەی گرێ دەدات ئەگەر ژن بوو، یاخود پەتێك گرێ دەدات ئەگەر پیاو بوو. ناحەزی واش هەیە لەو کاتەدا بۆ ئەوەی بەستانەکە بەهیچ کلۆجێك نەکرێتەوە، تۆزقاڵێ کل دەخاتە ناو لەپیو فووی لێدەکات.] ل ١٨**
زۆربەی خەڵك شتێکی زۆر کەم لەبارەی پەردەی کچێنییەوە دەزانن و واتێدەگەن کە هەموو کیژێك دەبێ ئەو پەردەیەی لەنێو لەشدا بێت و دەبێ لە یەکەمین پێکگەیشتن لەگەڵ پیاودا بدرێو لەئەنجامدا خوێنێکی ئاڵی لێ بتکێ. بێ درێژ دادری، پەردەی کچێنی جۆرێك نییە بەڵکو، چەند جۆرێکە. بەڵام ئەو جۆرەی بڵاوە کە ٧٥٪ی کچان لەو جۆرەن کە، پەردەیێکی تەنکە دەروازەی ئەندامی مێینە دەگرێت و لە نێوەراستیدا کونێکی بازنەیی بچکۆڵە هەیە، کە خوێنی بێنوێژی پێدا تێپەڕ دەبێت و لەگەڵ پێکگەیشتن لەگەڵ نێرینەدا بەئاسانی دەدرێت و چەند تنۆکێك خوێنی لێدەتکێ. بەڵام ٢٥٪ دیکە لەکاتی پێکگەیشتندا بە هیچ جورێك خوێنی لێنایەت. و ئەم جۆرانەن «لاستیکی و پێچ پێچ و بێژنگی» و هەشە هەرکە لە دایك دەبێت ئەو پەردەیەی نییە. یان زۆر ئەستوورەو هیچ کونێکی تێدا نییەو پێویستە لەکاتی خۆناسیندا هەڵبدردرێت بۆ ئەوەی خوێنی بێنوێژی، پێدا تێپەڕ بێت.
گوایە ئەگەر زاوا لەیەکەم پێکگەیشتندا خوێنی داوێنی بووکەی نەدیت دەڵێن زاوا بەستراوەتەوە جا بەگرێدانی چمکی سەرپۆش بێت یان پەت یان پێ بزواندن لەنێو پێڵاو و تەسبیح بە دەستەوە گرتن و فوو لەکل کردن بێت. جا سەیر نییە ئەگەر مێژووی ئافرەتی کورد بە خوێنی ئەو کچانە سوور کرابێت کە، هەر لەبنی پەردەیان نەبووبێت یان هەیان بووەو لە جۆرە لاستیکیەکان بووە. بەشی داڵ و کەمتیاریش هەر گەند خۆری نییە!؟ ئەم بارە سروشتییە بازاری بۆ زۆر کەسی هەلپەرست گەرم کردو هەر ئەوانیش درۆو دەلەسەی زاوا بەستنیان بەنێو خەڵکدا بڵاوکردەوەو پەرەیان پێیدا پیاو لە خنکانا بێت دەست بۆ پووشیش دەبات **[پاش بانگی شێوان، زاوایان پەستایە ژووری بووك و چاوەروان بوون. بۆماوەی جگەرەکێشانێك دانیشتووان بێدەنگ بوون و برێکیش خۆزگەو وراوو وردی جۆراو جۆری لەدڵدا، تاوتوێ کرد. لەپڕ هەڵهەڵە لەچوار لاوە بڵند بوودوە. زاوا دەرچووە دەرەوەو ناوچەوانی ئارەقەی لێدەتکا.] ل ١٠٩**
جا پیاوی کلۆڵ لەم هەڵوێستەدا هیچ بە هیچ نەکات و باوك و برای کچەش لەو لاوە بوەستێ ئیدی چۆن پەنا وەبەر کەمتیاری وەکو مەلا واحید نەبات [مەلا واحید پێشان ساجێك جران سوور دەکاتەوە بۆ ئەوەی زاواکە میزی پیا بکات. دوایی بە رووتی لەکونی دەستارێکەوە، سەتڵێ ئاوی بەسەرا دەکات. ئەوسا سی (٣٠) هێلکەی بۆ دێنن گوایە جنۆکەو منۆکەکانی پێ

قایل دەکات.] ل ١٨. دیارە ئەو ساج سوور کردنەوەو میز پیاکردنەو دووایش ئاو پیاکردن لە کوونی دەستارو وویرد خوێندنەوەو پێ‌لەقە دان لە پشتی زاوا هەر هەمووی ئەفسانەو پروپووچی دروستکراوی دەستی خۆیانن، تەنیا بۆ چاوبەستن و ڕێ هەڵەکردنی خەڵکە نەزانەکە دەکران، دەنا ڕووتکردنەوەیێکی ئاشکرایە لە بانگی نیوەڕۆدا، چونکە هیچ پەیوەندییەکی چ سایکۆلۆجی‌و چ فسیولۆجی نیە لە نێوان پەردە نەکرانەوەو ئەو هەڵسوکەوتەی هی وەکو مەلا واحید پێی هەڵدەستن.

**[کە (شێعەلی) دەگاتە جێ ڕۆحم بەفیدای بێت، سەرتاپا دەروێش و شۆرباخۆرو ئەهلی گەرەك هەموو دەنووشتێنەوە بۆ ئەوەی دەستە موبارەکەکانی ماچ بکەن. ئەم مینارەیەش کە ئێستا لە پێش چاوتە، ئەویش هەمان دەستوور دەچەمێتەوە بۆ ئەوەی دەستی یا شێخ ڕاموسێت..] ل ٢٠**

پێویستی میتافیزیکی هەرچەندێك بەهێزو ڕەگ داکوتیو بێت بەڵام لە گرنگیدا دووای پێویستی فیزیکییەوە دێت. بێگومان مرۆڤی دوواکەوتوو لە زۆربەی کاتدا خۆی بەو هەقایەتە گەپ ئامێزانەو ئەو چیرۆکانەی گوزارشت لە ڕووقێکی خراپ دەکەن خەریك دەکات. ئەگەر هەر لەمندالییەوە ئەم چیرۆك و هەقایەتانەیان فێربکەن ئەوا کە، گەورە بوون دەبنە چەند واقیعێکی بەجێ بۆ بوونی مرۆڤ و کاریتەی ژیانی ئەخلاقی.

شێعەلی هەرچەند پیاوێکی یەزدانی‌و ئاین پەروەر بێت، بەڵام چەمانەوەی منارەیێکی زل و زەبەلاح لە ژێرییەوە دوورەو کەرامەتی ئەولیاش بەم جۆرە نەبووەو چنراوی ساویلکەیێکی وەك جەلالەشێتە، ئەوەیش لەبەر دووشت، یەکەمیان بۆ پتر چەسپاندنی بیروباوەڕی ئاینی خۆی‌و دووەمیشیان لەبەر زێدە خۆشەویستی شێعەلی‌و کوڕو کوڕەزاکانییەتی.

ئەو خۆشەویستییە پێویستییە جەکەرە دەکات و پەرە دەستێنێ تا دەگاتە ڕاددەی بەپیرۆزگرتن و لەئەنجامدا چ جەلالەشێت و چ ئەوانی پێش ئەویش بەندوباو هەڵدەبەستن و لەبەرایی هەموو کەسێکیش خۆیان برواى پێدەکەن و ئامادەن بە هەموو جۆرێك داکۆکی لێبکەن. بەڵام کە بڕوای جەلالەشێت بەو جۆرە دوواکەوتوو و بەردین بێت چۆن بەو کەسانەی لە پێشوازی شێعەلی دان کە هاوشان و هاوبیری خۆیین دەڵێت شۆرباخۆر!؟

دیارە مەبەست لە (هەموو دەنووشتێنەوە) (یەك بە یەك دەنووشتێنەوە)یە چونکە هەموو بەیەکەوە دەکاتە کڕنووش بردن و پەرستن.

**[لەو ساڵانەدا کە هێشتاکە باوکم مابوو، پاییزان دایکم دێ چوار قسناخ گەنمە ڕەشگوڵی لە خەرمانی ناو شوانی پەید! دەکرد، لە ماڵی مەجید عەجەمیش مەنجەڵێکی زنجیرداری دەخواست، ئەوسا ڕوومان لەجێ ساوەر جۆشاندنەکە دەنا. جار وا هەبوو، بەریزە شەش و حەوت مەنجەڵی گەورە پێکەوە قوڵتە قوڵتیان دەهات.**

**پێشەکی سێکوچکەیەکی بەردی زلیان دادەناو مەنجەڵەکەیان لە سەر دادەمەزراند. لە ژێرەوەش، تەپاڵەو پشقل و لاستیك و کۆنە پێڵاویان بۆ گڕدەدا.]ل ٣٤**

ساوەر کوڵاندن بۆرە جەژنێکی شەوانی هاوین و پاییزی کوردەوارییە.

هەر لە بەرەبەری ئێوارەوە مەنجەڵی زنجیردار دەخرێتە سەر کوچکە بەردو جۆش دەدرێت. کە ئاسمان تەواو تاریکی کرد ئیدی بەکوڵ دێت و بچووك و گەورە جام و قاپ و تەقیلە پڕ لە دانوولە دەکەن، خوێی پێوەر دەکەن بەچێژو لەزەتەوە دەیخۆن هەر بەدەم خواردنیشەوە دانوولەکە دەگوێزنەوەو لەسەر بەتانی یان بەرماڵ و جاجم پەرت دەکرێت بۆ ووشك کردنەوە. بەزم و ڕەزمیش هەتا درەنگانێك هەر بەردەوام دەبێت، دیارە ساوەری پاییزان شیرینترو خۆشترە لە هی هاوینان.

**[مندالێك ئەگەر تووشی لەرزوتا ببێت، کەسێکی ئەو نەخۆشە دەرگای ماڵی یەکێك لەو دوو ژنانە دەکوتێ. ...دایکی نەخۆش**

**دەڵێ: ئەی خاوەنی چوار چاو ئەمڕۆ چی نیشان دەدات؟ خاوەند ماڵەکە زوو تێدەگەیێ‌و قاپێ چێشتی بۆ دەهێنێ گوایە واباوە ئەو جێشتە دەبێتە هۆی ڕەوینەوەی لەرزوتای نەخۆشەکە ] ل ٧٠**

ئەم چارەسەرکردنە لە زۆر پارچەکانی دیکەی کوردستاندا بڵاوە کەسێکی ئەو نەخۆشە هاوار دەکاتە کابرای دوو ژن و دەڵێت :

هۆی شەوتا هۆی شەوتا
بەشەو دەگرێ تا، بەرۆژ بەردەدا
ماخۆی چوار چاو چ دەرمان دەدا.

جا خاوەنی دووژن بەپێی بارو دۆخی خاوەن نەخـۆش ناوی خواردنێـك هەڵدەدا، ئەوانیش بۆی ئامـادە دەكەن و دیدەنێ گوایە بەو خواردنە چاك دەبێتەوە.

**[چەند ساڵێك لەمەوبەر كە نەوزاد دگانی حەوت ساڵەی كەوت، فرقەی كردە سەربان و لەوێ دگانەكەی ناشت بۆ ئەوەی برایـەكی بچـووكی هەبێت لە گەڵیا چاوشاركێو گولان بكات.] ل٧٢**

یان هەر لە خوارەوە ددانەكە توور هەڵدەداتە سەربان و پر بە گەروو هاوار دەكات؛ ئەم ددانەم فڕێدا یەكی زێڕی بێتەوە جێ.

**[- نا، دەڵێن، دیسان گوناهی بەمل ئەوانە بێت كە ووتیان، گوایە سیامند، لەو وولاتەوە هەڵیگرتووە!] ل ٩٢**

گەر هاتوو مرۆڤ لە ژیانیدا تووشی هێزی دەرەكی بوو ووزەو ئارەزووی كپ كردەوە ئەم ووزەیە بە یەكجارەكی كپ ناكرێتەوە بە مانای كپ بوونەوە بەڵكو لە راستە شەقامی رەوشتدا لارێ دەبێو بەرەو رێگای چەوت لادەدات. «٦»

بێگومان سیامند خێزانەكەی لە رۆژگارێكی چ دوور چ نزیك یەكتریان خۆشوویستووە بەئاواتەوە بوون لەبەرچاوی خەڵكیو بێ‌ترس زەمـاوەنـد بگێڕن بەڵام لێ‌نەگەڕاون. جا لەبەرئەوەی یەكتـریـان خۆشـوویسـتووە، یان لەبەر هەر هۆیێكی دیكەی ئابووریو كۆمەڵایەتی بووبێت. لەم حاڵەتەدا چار چییە ؟..واز لە یەكـدی بێنن و هەركـەسـەو خۆی بەدەست چارەنـووسی نادیـاری خۆیـەوە بدات یان سەر هەڵگـرن و روو لە شاری غەریبی بنێن. بێگومان ئەوان رێگای دووەمیان هەڵبژاردووە و بە جووتـە خۆیان لە ئیمام قاسمی ئەم شارە جەنجاڵە پەستاوەو **ئەنجـامـەكـەشی‌دیسانەوە گیرو گرفتی رەدووكەوتنەكەیە! بووە حیكایەتی رۆستەمی زاڵ و نەبرایەوە! بووە تەووقی ئاگرو لە ملمان ئاڵا، لەم وولاتەدا كەس هەڵنەگیراوە! بۆ چارەسەركردنی هەردەبێ بەخوێن بێ بە خوێنی ئاڵ.!]ل ٩٢:** ئەدی لەم نێوەندەدا كێ زەرو زیان دەكات خێزانی سیامند یان باوك و براكانی یان سیامند خۆی...[نەگبەتی سوار كۆڵی ئەم كوردە بووە.] ل ٩٣.

**[ئەوسا شەرە گەرەك دەبوو لە نێوان ئێمەو بەر تەكیەدا، لە نێوان زێوێەو ئیمام قاسمدا، لە نێوان قەڵاو خوارەوەی قەڵادا، لە نێوان ئێمەو بەر تەكیەو شۆریجە لە لایەك و گڵچی‌كان و پیریادی لە لایەكی دیكە..]ل ١٠٤**

گردبوونەوەی لاوانی گەرەكە جوداجوداكان و بە شەرهاتن بە قۆچەقانێو داردوولك و دارو بەرد وەكو نەریتێك لـەگەڵ هاتنی ئینگلیـز و بگـرە پێشتریش پەیدا بوو و هەتا حەفتاكانی ئەم سەدەیـە هەر لە برەودا بوو، بەتـایـبـەتی لە نێـو نەتـەوە جیـاجیـاكـانـدا. كوردی شۆریجـە لەگەڵ توركمانی قەڵا یا توركمانی موسەڵلا لەگەڵ كوردی ئیسكان و زێوێەو بەم جۆرە نەعـرەتەیان لەیەك دەكێشاو ئامبازی یەك دەبوون و كاتێكی زۆری پێدەوویست هەتا لایێكیان هەڵدەهاتن و سەركەوتنیش بۆ لایەكەی دیكە دەبوو و لە هەردوو باردا چ سەركەوتوو و چ دۆڕاو هەر سەروگوێلاك و پەل و پێ شكانیان بۆ دەمایەوە. هۆیەكەشی ئاشكـراو روون بوو[ ئەو ساكـە حوكـومـەت نەبـوو. هەندێ كاربەدەست ئەو ناحەزی‌یانەیان ئاگر دەداو بسكەی سمێڵیان دەهات.] ل ١٠٥. چ ئینگلیزو چ عوسمانیش بەر لەوان ئاگری ئەم ناكـۆكیو دووبـەرەكانییەیان خۆش دەكرد و نەك هەر لە شارەكان بگرە لە نێو خێڵەكیو لادێكانیشدا شەرو بەزم و رەزم و هەر هەبوو، ئەگەر هی لادێییەكان لەسەر زەویو ناموس و ژن هەڵگـرتن بووبێ، هی شار لە هیچ و خۆرایی بوو، ئەگەر تاكەشتێك كرابێتە هۆ تەنیا زمان و مەسەلە نەتەوەییەكە بوو. كە، ئینگلیـزو مەلەكیەت پشتیان هەڵكرد ئیدی ئەم گۆلەزێو گێچـەڵەش روو لەكـز بوون بوو تا لەم دووا دووایـیـەدا بە یەكجاری ریشەكێش كرا.

[مـیرزاكـە لەسەر كورسی‌یەكی بڵند چوارمەشقی دادەنیشت، گوێگـرانیش لەش لەسـەر لەش، لە داوێنـەوە، چەنـاگـەیان هەڵدەبری.] ل ١٠٧ كورد یەكێكە لەو قەومانە كە لە رۆژەڵاتی كۆن و تازەدا شوێـن هەوار و شوێـن ئاگـردانـێـكـی لەو سەرزەویـەدا بۆ خۆی داگـیر كردوەو تیـایـا ستاری گرتووە، كارەسـاتی رۆژگـار وەكـو ئەدەبی قەومـەكانی تری دروست كردووە لەگـەڵ ئەمیشـدا ئەو ئامانجەی هەر نواندووە، ئەمە نەوەك [illegible] یاسای تەبیعەت و گۆران ئەم ئاوە ئەرێـژێ.«٧» جا لەو پلەیـەی میـژووی گەلدا كە ئەو چیرۆكانە تیادا هاتۆتە كایەوە كە لە ژیانی راستەقینەدا توانای هێنـانە دیی ئەوشتانەی نەبووە، ئەوا ئادەمیزاد بەباڵی خەیاڵ بەرەو ئەو ئاواتـە. چیرۆك بەرهـەمـی گەورە بوون و لە خەم رەخسینی مرۆڤـایـەتییـە. دیمەنی كێشەی ئادەمیزاد لەگەڵ سروشتـداو ئادەمیزاد لەناو خۆیاندا، لە پێناوی ژیانا پێشان

ئەدات «٨» جارانی ئەم وولاتە بەگشتیو ئەم شارە بە تایبەتی و لە پاڵ نەبـوونی ئامـرازەکـانی خۆ خەریـك کردن و کات بردنەسەر. ئەمجا هەر شتەو بەومختی خۆی حیکایەتخوانیو بەیتبێژیو سەردولکە خویندنەوە لە شەوانیسەرماو بە هاشە هاشی زستان و لەبەر ئاگردانا. مەولود نامەو ئیسماعیل نامەش لە شەوانی قەدرداو سینیو زەرفیش لە شەوانی رەمەزانی نێو چایخـانەی رزیوەکانی ئەم شارە. بۆ بچکۆلانیش سەربردەی دێوو درنج و هێلکەی نامێو کەچەڵ و کچەپاشاو بالابستەی چل گەز ریشەی سەر خوانی داپیرە.

**[دایکی زاوا بەو کەنـەفتیـیـەی بە دەستێك کەوگیر و بە دەستـەکـەی تری دەوریـیێ ئاردی هەڵگـرتبـوو، گوایە ئەگەر بووکە دەست بخاتە ناو ئاردەکەوە، هەرزانی دەبێت کەوگیرەکەش وابزانم بۆ ئەوەیە کە ببێتە کابانێکی کارامە! زاواش لەگـەڵ دەستـــەی برازاوادا خۆیـان کوتـایـە سەربانەکەو سالاریش بەزۆرەملێ، چلە قامیشێکیان دایە دەست بۆ لێدانی بووك!!] ل ١٠٩** تۆمابوا دەڵێ: ژن هێنانی کورد دوو ئاهەنگی تێدایەو پێویستیش ناکات هەردووکیان لە رۆژێکدا بکرێن. یەکەمیان ئاینییەو ناوی مارەبرینە کە بریتیە لە بەستنی پەیمانی ژن و مێردایەتی، ئاهەنگی دووەم ئەمێنێت ەویش شایی بوکێنیـیـەو هەر لە کۆنـەوە هەیەو لەبەر چاوی زۆریاندا ئەمە گرنکترەو جەماوەرێتی پترە. «٩»

ژن هێنـان بە گشتی لە هەموو پارچەکانی کوردستاندا وەکو یەکە تەنیا لە چەند لایەنێك نەبێت جیاوازییەکی بچووکیان لە نێـوانـدایە. خەسوو بە دەستێك کەوگیرو بەدەستەکەی تری دەوریێ ئارد هەڵدەگرێت و بووکە دەستی تێدەئاخنێ... دوو جەفەنگی میللین و خۆزگەی کەیبانووی چاك و هەرزانی بۆ تازە ماڵ دەخوازن، قامیش لە بووك راوەشاندنەکەش هەر بەم جۆرە دەلالەتی تایبەتی خۆی هەیە. زاوا کە لە بەرزییەوە دەوەستێت، بووکەش لە خوارەوە دانانێکی سەرەتاییە بۆ بنەرەتی خێزان. واتە پیاو هەردەم لە سەرووی ئافرەتەوەیەو پێویستە بووکە هەر لە ئێستاوە دانی پێدا بنێت قامیش راوەشاندنەکەش دەست بە سەرا گرتن و بەهێزی پیاوو دەستەلاتی بە سەر ژندا دەگەیەنێ و لە سەر بووکەیە هەر لە یێکەمین رۆژەوە ملکەچیو دەست بە سنگەوە وەستانی خۆی نیشان بدات. لە زۆربەی کاتیشدا هەر دوو لا بەم کردارانـە هەڵدەسـتـن بێ ئەوەی لە کرۆك و مەبـەستـەکـەی تێبگـەن، واتـە، هەڵسـوکـەوتـەکـە دەبێتـە گەلەبێهـەستی (اللاوعي الجمـاعي) هەر چی چۆنێـك بێت زۆربەی میللەتی ئێمە تا ئێستایش ئەم داب و نەریت و بیرە دووا کەوتووانەیان هەر لەلا ماوە و چەند قۆناخێکی دوورو درێژی پێدەوێ هەتا بە یەکجاری لە کۆڵمان دەبێتەوە.

**[مام پیرۆتی هەلاجیکەر، بە چەك و کەوانەکەیەوە خۆی کوتـایە کۆلانی سەی سەروەر. ماڵی سالەی ئەمینە مۆتێ بانگیـان کرد بۆ شیکـردنـەوەی پەمـووی دۆشـەك و سەرینەکانیان] ل ١٢٩**

مام پیرۆتی توێی ئەم رۆمانە هەر وەکو مام هەباس و مام هەمزە و دەیـان پیرەمـێردی دیکـە کوچـە بە کوچە و دەرگا بە دەرگا دەگـەرێن بۆ پەرەکـردنـەوەی پەمووی دۆشەك. دیارە مایەی گوێگرتن و لەدیار دانیشتنە کە، مام پیرۆت لەگەڵ لە راندنەوەی تەلی کەوانەکەی دەستی ئاوازێکی ئیقاعی دەردەکات و ناو بە ناویش هەر بە دەنگە کەرخەکەی تێهەڵدەکاتە سۆزو ئاوازێکی غەریبـانە تا لە پەرەکردنەکەی دەبێتەوە و ئەمجا هەقدەستی دەدرێتی و کەرەستەکانی کۆ دەکاتەوە و دەر دەپەرێ بۆ ماڵێکی دیکە و شوێنێکی دیکە.. بەلام ئەوەی جێگای تێرامان و پرسیارە سەرینگـاو بالیفـۆکـەی کوردی هەردەم پەری پەرۆلی تێـدە ئاخنرێت نەك پەموو.

**[سالار، لە مردن ناشتندا جیاوازییێکی بنەرەتی هەیە لە نێـوان رەحیمـاواو ئیمـام قاسمـدا!... لە گۆرستانەکەی شێمحێـدین بە پارە گۆر هەڵدەکـەنن! بیست دینار، چل دینار و بگرە پەنجاو شەست!! لێرە خاوەن مردوو بەخۆی نازانێ کە دەستوبرد کورگەل دەست دەدەنە بێڵ و خاکەناز و بە گورجی گۆرێکی پوختە ئامادە دەکەن!!] ل ١٤٦**

گۆرستانی شێمحێدین یەکێکە لە گۆرستانە هەرە دێرینەکانی ئەم شارە. گەرەکی رەحیمـاوا هێشتـا هەر دانەمەزرا بوو کە گۆرسـتـانـی شێمحێـدین پان و پۆر و ئاوەدان بوو هەر لە کۆنیشەوە گۆرهەڵکەن و یاسین خوێنی خۆی هەر هەبوو و تا ئێستـایش هەر لەسەر هەمان رێرەوی خۆیەتی، بەلام ئەوەی رەحیمـاوا، بە پێچەوانەوە گۆر هەڵکەن وەکو پیشەیێك مایەی پەشم و نەنگی بوو هۆیەکەشی دەگەرێتەوە بۆ خەڵکەکە خۆیان، کە زۆربەیان کۆچەری ئەو لا دێیانەی شوان و سالەیی و شێخ

بزێنی بوون و هەر لە مەڵبەندی خۆیانەوە راهاتبوون و فرچکیان پێوەگرتبوو بە گەلکاری و کۆمەکی لە گۆڕ هەڵکەندن و ناشتنی هەر مردوویێك. بەڵام ئەوکاتەی تۆفیق ئەم قسانەی تێدا دەکات کۆتایی پەنجاکانە و گۆڕ هەڵکەندن هەر گیز نەگەیشتۆتە پێنج دینار چ جای چل و پەنجاو شەست!

**[رۆژی هەینی بۆ ئێوارەکەی، نەخشین سالاری بەرێ کرد. هەر لە هەنگاوی یەکەمدا جامە ئاوەکەی لەپاش هەڵرژت] ل ١٥٤**

چاوپیسی و ئیرەیی هێزەکانی دیکەی ئەودیوی دەروونی ئادەمزاد و ئەو ئەنجامە خراپانەی لێیانەوە پەیدا دەبێ وای لە سەرانسەری جیهان بەگشتی و خۆرهەڵات بە تایبەتی کردووە بە هەرچی جۆرێك و شێوەیێك بێت خۆیان لە زیانی بپارێزن و بە پێ بیری خۆیان چارەشی بۆ بدۆزنەوە. جا چ بە نووشتەو دوعا بووبێت یان بە دەنکە میروو و هەرامەی کەمتیار.

**[لە ناو ئەو حەشاماتەدا، یەکدوانێکی فێڵبازیش مرخیان لە (دەعبای) کەمتیارەکە خۆشکردبوو] ل ٣٧**

کە ووشك دەکرێتەوە و بە دیوارەوە هەڵدەواسرێت بۆ فەرو بەرەکەت و دووربوون لە چاو پیسی یان بەکەم ناو بردنی کەسێکی خۆشەویست [ئەی چاو بەلی تیتك رشكنی قرێژ] ل ٢٧١. سالار کورە تاقانەو خۆشەویستی ماڵە بۆ ئەوەی لە چاوی حەسوود بە دوور بێت، چەشنی کچ بانگ دەکرێت و دەمو دووی لەگەڵ دەکرێت. دیارە رێزی منداڵی مێینە لەکن دایکی نەزان و نەخوێندەوار هەر کەمتر بووە لە هی نێرینە. ئاو رشتنەکەش کە ئەنجام دەدرێ بە کوێری چاوی دوژمن لە پاش کەسێکی گەشت لەبەر دەرێژرێت بۆ ئەوەی بە سەلامەتی بگەرێتەوە. ئەمانە و چەندین شتی تری لەم جۆرە لە نێو کوردواریدا بۆ چاو وزار بەکار براوە.

[نوێژە بارانەیان دەکرد. لە ئاسمان دەپارانەوە. قوربانییان سەردەبری. جا هەر گەرەك و تیرە و پیشەیەك، جوێ جوێ لەو پێدەشتانەدا، پەرت دەبوونەوە. ئاسنگەران، زێرینگەران، مەنجەڵسازەکان، حەلوا فرۆشان و سەراجەکان.] ل ٢٢٩ قاتی و قری و بێبارانی ئەگەر بقەومێ هەر لە جوتیار و دێنشین دەقەومێ. کە ساڵ ووشك و بێباران بوو کۆمەڵێك دیندار و ردێن چەرموو لەگەڵ مەلای دێدا بە ویقارەوە دەچوونە سەر گردێك و لە خودا دەپارانەوە و نوێژەبارانەیان دادەبەستا، بەشکو ئەوە خودایە دوعا و پارانەوەیان گیربێت و لە برسێتی و قری رزگاریان بێت.

دەگێرنەوە؛ جارێکیان دەستەیێك بەو مەبەستە چوونە سەر گردێك کە گەیشتن بینیان میروولەیێکی زۆر لەسەر گازەرای پشت کەوتوون و لەخودا دەپارێنەوە، کە ئەوەیان بینی لەنێو خۆیاندا گوتیان؛ هەرچی چۆنێك بێت دوعای ئەو بەستەزمانانە لە هی ئێمە گیراتر دەبێت و رێوراست دەگەرێنەوە، زۆری پێنەچوو هەورگرژ بوو گرماندی هەر بەم جۆرەش لەگەڵ کۆسەوەوی و بووکە بەبارانەدا کە دەچروپری لە هەمان لاپەرەدا باسکراوە.

**[راوە بەراز کە مانگ تابان دەبوو، لامان باو بوو. سەرجەم گوندییان کۆمەك و باربوویان دەکردو ژنان و منداڵانیش تێوە دەگلان. لەچەند قوڵێکەوە بۆسەیان بۆ دەنایەوەو بە درك و زەل و پووش دەیانشاردەوە. ژنان لە چەند قوڵێکەوە بەهاوارو تەنگی پیاوانیان دەهاتن. تەنەکەیان دەکوتا. بەکەوچکی دارین و کەوگیر، لەبن مەنجەڵ و ئاسنجاویان دەدا. هەرزەکارو یەکەیەکەش دەستیان دەبرد بۆ تێڵاو گۆپاڵ و کوتەك و خەنجەرو تاپرو هەر شتێکی برندە. ئەوی دەستی دارو چەوی بگرتایە، دەهاتە دەست و لە چمکێکەوە تێك دەئاڵا...] ل ٢٤١.**

بەرازی کێویش هەر وەکو کوللەو جورە دوژمنی دەستەو یەخەی جوتیاری ئەم کوردستانەیە. کە بەراز بە بێستان فێر بوو ئیدی شەوانە قر دەخاتە داهاتی. خۆ هێندە کەمیش نییە بە سەڵتە زەلام یخ بکرێت. بۆیە لە شەوی مانگەشەودا وەکو بەجێهێنانی تەقسێکی ئایینی، بە گەلکاری و کۆمەکییەوە دەکەونە وێزەی پیرە بەرازو کە کوژراش ئیدی، دەبێتە زەناو هەڵاهەڵاو گۆشتە تەرو برەکەشی دەبێتە پاروە چەورەی سەگەلی ئاوایی.

**[دایکم تاسولکەیەك خەنەی گرتبووەوە بۆ ئەوەی شەو لەسەری خۆی بکرێت..] ل ٢٦٢**

خەنە جگە لە سیفەتە جوانکارییەکەی، وەکو موتفەرك و دەرمانیش بۆ چاوکولی دەست و پێ قڵەشان و ئەگزیما بەکار دەهێنرێت. هەر لە کۆنیشەوە بە پیرۆزگیراوەو هەموو ئافرەتێك بۆی هەیە لە هەموو کاتێکدا (پرسەی لێ دەرچێ) قاچ و قول و سەرو تیتکی پێ سوور بکات، بە تایبەتی لەکاتی بە بووك بردن.

ئەگەر هەموو ئامرازو داوو دەرمانەکانی خۆ جوانکردن لە نێو کورددا مایەی پەشم و شوورەیی بێت ئەوا کل و خەنە هەر دەم بە چاوی ڕێزو تەقدیرەوە تەماشایان کراوە.

**[هەتا ڕۆژێك کەوتە گارەگار. دایکم دەیوویست بیهاوێتە ناو ئاوی ساردەوە بەڵکو لە کڕێ بکەوێت.] ل ٢٧٠**

پێوویستی‌و نەبوونی مرۆڤ فێری زۆر شت دەکات. مریشك کە کڕ کەوت مانای وایە بەلانی کەمەوە شەش مانگ لە هێلکە دەچێتەوە ئەمەش بۆ ماڵی هەژار زۆرە.. یان زۆر جار مریشك لەوەرزی هاویندا کڕ دەکەوێت. کابانی زۆرزان و شارەزاش دەزانێ لەم وەرزە گەرمەدا زۆربەی هێلکەکان پیس دەبن، لەبەر ئەوە مریشکەکە لەکڕێتی دەرەوێننەوە، بەوەی چەند جارێك لە ئاوی ساردی هەڵدەکێش ئیتر کەڵەشێر خۆش بێت مریشکەی بەستەزمان تا ماوەیێکی تر لە کڕێتی دەکەوێت. وەکو زاندراویشە باڕۆکەو مریشك کە، بەهێلکە هاتن گارەگار دەکەن و لە کرکەوتنیشدا دورقە دورق دەکەن.

**[بەهیس خایەکانی ڕەش کرد!] ل ٢٧٠**

جا کە کرکەوت لە بێژینگێك یان سەبەتەیێکدا کۆمەڵێك هێلکەی نوێی بۆ دادەنرێتەوە. لە هێندێ جێگادا تاك و لە هێندی جێگەی تردا تاك و جووت بەپێی قەوارەی مریشکەکە دادەنرێتەوە. جا لەو ماڵانەی مریشکی زۆر بووایە قەپێلکی هێلکەکانیان بە هیس ڕەش دەکرد بۆ ئەوەی کاتێك مریشکە کورکەکە بۆ ئاوودان خواردن هەڵساو مریشکی تر هێلکەی لەسەر هێلکەکان کرد یەکسەر بناسرێتەوەو جیابکرێتەوە... بێگومان مریشکیش هەر بە غەریزەی خۆی حەز دەکات هێلکە لەسەر هێلکە بکات و تاوێك لە سەریان هەڵنیشێ هەتا ئازارەکەی دەرەوێتەوە.

**[- کورم نەوزاد خەونەکەت لای کەس نەگێڕیتەوە ئێمە لەتەمەنی تۆدا بۆوین، ئەگەر خەونمان بدیبایە، لە گوێی ئاوێکدا دەمانگێڕایەوە... نەبادا...] ل ٢٧٨؟**

تا ئێستا مەسەلەی خەون لە کوردەواریدا وەکو تەلیسم و جادوو تەماشا دەکرێت و بەدوور دەگیرێت لە فزوڵییەتی دەوروبەر، سەبارەت بە خەون، ئەگەر خەون دیتوو بە چاکی ڕاڤە کرد ئەوا گێڕانەوەی لەلای کەسانی تر دەبێتە هۆی هەڵفراندنی ئەو پێش زانییە چاکەیەی لێوەی دەکرێ‌و بە خراپە بەسەر خاوەنەکەیدا دەشکێتەوە. خۆ ئەگەر خەونەکە پێش زانی خراپی لێکرا ئەوا دەستبەجێ ماڵی خەون دیتوو نان دەبەخشنەوە بۆ خوا بە چاکە گێڕانی خەونەکە، دەنا وابووە هەر وەکو لەلاپەرە (٢٧٨)دا پەنجەی بۆ درێژکرا بۆ جۆگەلەیێك یان زێیێك دەگێڕدرێتەود بەواتای هەرچی خراپەیێك لە ناوەڕۆکی ئەو خەونە چاوەڕو دەکرێت هەمووی بە دەم ئاوی بە خوردا بچێت و هیچ شوێنەوارێکی خراپی لێ بەجێ نەمێنێ.

لەکۆتاییدا هەر بۆ مێژوو دەڵێم؛ ئەگەر بە دەیان لیکۆڵینەودو لێدوان لەبارەی لایەنە جیاجیاکانی ئەم ڕۆمانەوە بنووسرێت ئەمجا مەگەر بتوانرێت هەقی خۆی بدرێتە دەست ئەگەر تا ئێرە ڕۆمانی کوردی شلك و شیواو بوو ئەوا خاڵی سەرەتا دانرا بۆ گرتنی ڕاستە شەقامی ئەم هونەرە مەزنە.

نەمری‌و بەرزی بۆ ئەو کەسانەیە بە ڕاندایەتی مێژوو لە مێشکی میللەتدا هەڵدەکۆڵێ.

**پەراوێزەکان :**

«١» :- لیکۆڵینەوەو بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی. ل ١١
«٢» :- هەمان سەرچاوە ل ٢١
«٣» :- هەمان سەرچاوە ل ٢٥
«٤» :- المراة والجنس ل ٢٦
«٥» :- شوبنهاور ل ٩٤
«٦» :- المراة والجنس ل ٥٥
«٧» :- مێژووی ئەدەبی کوردی ل ٨٣
«٨» :- لیکۆڵینەوەی ئەدەبی فلکلۆری کوردی ل ٢٥
«٩» :- ژیانی کوردەواری ل ١١٣

**سەرچاوەکان :**

١- هەڵکشان بەرەو لووتکە: ڕۆمان عبدالله سراج بغداد ١٩٨٩
٢- لیکۆڵینەوەو بیبلیۆگرافیای چیرۆکی کوردی ١٩٢٥-١٩٦٩ عمر معروف برزنجی چاپخانەی کۆڕ بغداد ١٩٧٨
٣- قلعة اكسل: ادمون ولسن بيروت ١٩٧٩
٤- کوردستان لەساڵەکانی شەری یەکەمی جیهاندا: د. کمال مظهر بغداد ١٩٧٥
٥- مێژووی ئەدەبی کوردی: علاءالدين سجادي بغداد ١٩٥٢
٦- لیکۆڵینەوەی ئەدەبی فلکلۆری کوردیێ: د. ع. م. رسول سليماني ١٩٧٩
٧- عشرون قصة كردية: ئامادەکردنی حسين عارف بغداد ١٩٨٥

٨- ڕۆمان و پیشەی نووسینی ڕۆمان: وەرگێڕانی ئەژی گۆران بغداد ١٩٨٢
٩- شوبنهور: تاليف/ اندريه كريسون/ ت/ احمد كوى/ بيروت ١٩٥٨
١٠- صنعة الرواية: تاليف بيرسي لوبوك. ت: عبدالستار جواد بغداد ١٩٨١
١١- المراة والجنس: د. نوال السعداوى بيروت ١٩٨٤
١٢- تفسير الاحلام: سيغموند فرويد ت: جورج طرابيشى
١٣- ژیانی کوردەواری: تۆمابوا. و: حمە سعيد حمە کريم بغداد ١٩٨٠



# پێدا چوونەوەیێکی
# کتێبەکەی مامۆستا محمدی مەلا کریم
# لەمەڕ ساغکردنەوەی دیوانی حاجی

فائیزی مەلا بەکر

دوو سێ مانگ بەرلە ماڵ ئاوایی کردنی ساڵی ١٩٨٩ ، لە دەزگای ڕۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی، کتێبێکی مامۆستا محمدی مەلا کریم، بەناوی .
(هەنگاوێکی تر بەرێگادا بەرەو ساغکردنەوەی دیوانی حاجی قادری کۆیی) کەوتە نێو جیهانی کتێبان.
مامۆستا لەم کتێبەی دا هەوڵی داوە داکۆکی لەو ئاڵ و گۆڕ کردنانە بکا کەلە کاتی سەرپەرشتی کردنی چاپی چوارەمی دیوانی حاجی و بەپشت بەستن بە کۆمەڵێ دەستنووس و ڕۆژنامەو گۆڤار، کردوونی.

ئەوەی گومانی تێدا نییە ئەوەیە کە مامۆستا یەکەم جار لەرێگای سەرپەرشتی چاپی تازەی دیوانی حاجی و، دواجار لە رێگای نووسینی ئەم کتێبەی خزمەتێکی گەورەی دیوانی حاجی کردووەو کەلەبەرێکی گەورەی بواری ساغکردنەوەی ئەو دیوانەی گرتووە.منیش ، لەگەڵ ئاواتی سەرکەوتن و بەردەوامی زیاترم بۆ مامۆستا، رێگام بەخۆم دا، لە رێگای پێدا چوونەوەی کتێبەکەی دا، گەرچی دڵنیاشم کەتۆزی ئەو ناشکێنم، بکەومە کوتانەوەی رێگای ساغکردنەوەی شیعرەکانی حاجی .
لەبارەی (هەژا) ی (ب٠ ، ل ٣٢)ی:

**لە شادی وەك صەفی شایی لە کێو و کەژ ئەزهار**
**هەژا بەخەلعەتی گولگوون و کەوتە رقص سەما**

کەلە تێکستەکەی شارەزاو میران دا «هەزار» بووەو مامۆستا محمدی مەلا کریم بە گوێرەی دەستنووسەکانی یەکەم و دووەم و گۆڤاری دیاری کوردستان و بەبەڵگەی ئەوە کە «ئەگەر (هەژا) نەبێ و (هەزار) بێ ، کەواتە (بولبول) ، مەعنای نیوە بەیتەکە تەواو نابێ» ـ هەنگاوێکی تر .. ل ٣٨ ـ گۆڕیویە ، دەڵێم :
(هەزار) هکەی شارەزاو میران باشترە ، بەڵام نەك بە مەعنای (هوزار =

بولبول) ، بەڵکوو بە مەعنای (هەزار)ی ژمارە . لەم حاڵەدا پێویستیمان نابێ بە (و) ی عەتف کە مامـۆستـا بە بۆ چوونی خۆی داینـاوەو بۆ پارسەنگی کێشی شێواو (و) ی سێیەمی (گوڵگوون) قرتێنراوە.

لەبارەی ئەوەیش کە لە کۆتایی نووسینی سەر ئەم بەیتە نووسیویە «من پێشتریش لام وابووەو ئێستایش هەر لام وایە حاجی قادر وشەی (شایی) یشی لەو نیـوە بەیتـەدا هەر بە (شـادی) نووسیـوە، هەم بۆ راگـرتنی جینـاسەکەو ، هەم لەبەر ئەوەیش کە (شایی) بەوشە لە (شادی) یەوە هاتووەو بە مەعنایش هەر (شادی) دەڵێم:

جا بۆ (شادی) یەکە (شایی) نەبووبێ ، بەم جۆرە جیناسەکەیش دەسگیر دەبێ و لە دیـالێکتی کۆیێی ولاتی (حـاجی) یش نزیك دەکەوینەوە لەو هەرێمـە (ئەوەندەم شایی پێ هات ..) و (شایی بەخۆ ـ مەغرور) باوە ئەمەو، (شایی) لەجێی ( شادی ـ خۆشی) هاتووە: (حاجی) دەڵێ : سەراپا بێ غەم و (شا) بوون) ـ ب٦ ، ل ٩١ ـ بەلام (شادی) بە مەعنای (شایی ـ هەڵپەرکێ) نەبیستراوە.
لەبارەی (سی لە سەران)ی (ب٣، ل ٣٣)ی:

**خرینگ و هۆڕی قوڵینگ و قەتاری سی لە سەران**
**دەبینێت و کەو دەفڕێت و شەهێن چریکە دەکا**

بشەوە کە نووسیویە «لەنیوەی یەکەمی ئەم بەیتە هەڵەیەکی تریش هەیە لە یادم چووە لە کاتی لە چاپـدانی دیوانەکەدا راستی کەمەوە، ئەویش لەوشـەی (سی لە سەران)ایە کە راسـتـەکـەی (سێ لە سەران) »» ـ هەنگاوێکی تر ... ل ٤٠ ـ دەڵێم : دەبوو مامۆستا بەڵگەی راستی (سێ لە سەران)ی نووسیبـا ، راستـە بەرێنـووسی کۆن هەردوکیـان وەك یەك دەنووسران ، بەلام ئێمـە کە یەکێکیـان پەسند بکەین و ئەویدیکەیان بخـەینـەلاوە دەبێ بەڵگـەیێکمان بەدەستەوەبێ من لە (سێ لە سەران) مەعنایەکی وام هەڵنەکراند بۆ ئێرە بگونجێ (سي) : جۆرە قازێکی کێوییە.

لەبارەی «دووبارەی»ی (ب٣ل ٣٤)ی:

**لە گورگە لوورو، حەپەی سەگ ، لە قارە قاری بزن**
**لە عەکسی دەنگی دووبارەی کە دێتەوە لە چیا**

بشـەوە کە لەتێکستـەکەی شارەزاو میران دا (دووبارە) بووەو مامۆستا بەگوێرەی دەستنووسەکانی یەکەم و دووەم گوڤاری (دیاری کوردستان) و، بەبەڵگەی «پێویستی گەیاندنی مەعنا بە پوختی و بۆراگرتنی سەنگی نیوە بەیتـەکـە) ـ هەنگـاوێکی تر ...ل ٤٣ ـ دەڵێم بەش بەحـاڵی ئەوە کە (دووبارەی) مەعنا بە پوختی دەگەیێنی پێچەوانەکەی راستەو (دووبارە) پوختـەتـر مەعنـا دەگەیێنێ ، چونکە بەگوێرەی تێکستە هەڵبژاردەکەی مامۆستا (ی) مکە دەگەڕێتەوە بو قارە قاری بزن ، واتە : لە عەکسی دەنگی دووبارە-دەنگدانەوەی بزن لە چیاو شاخ کەچی بەگوێرەی تێکستی دووبارە ـ دەنگدانەوەکە بەرەهایی دەمێنێتەوەو دەنگدانەوەی گورگەلوورو حەپەی سەگ قارەی بزن و تاد ، دەگرێتەوە، نەك تەنیا قارەی بزن جا بۆ ئەمەیان باشترو پوختەتر نییە ! بەش بەحاڵی راگرتنی کێشی بەیتەکەیش، دەڵێم : مامۆستا لە کۆتایی نووسینی سەر ئەم بەیتەی (و) ی دووەمی (دووبارەی) بە هەڵە داناوە، دەڵێ : لێرەدا ئەبێ بەیەك (و) بێ ئەگینا نیوە بەیتەکە لەنگ ئەبێ »ـ هەنگاوێکی تر.. ل ٤٣ ـ جاکە (و) کێشی بەیتەکە لەنگ بکا، چۆن راگرتنی سەنگ دەبێتە بەڵگەی راستی (ی) ی (دووبارەی) کە بوەتە هۆی هەڵەیی (و) ی دووەم !.

لەبارەی (بوونە) ی (ب ٥، ل ٤٢):

**بە بازوڵفی کە لەرزی تابە تابوو،**
**لەگەڵ لەرزو لەگەڵ تا بوونە هەمتا**

بشەوە نووسیویە : «لەتێکستەکەی شارەزاو میراندا: «بوتە» راستکردنەوە: بەگوێرەی دەستنووسی یەکەم بەڵگەی راستی هاوتایی لە نێوان دوو شتا ئەبێ و بەیەك شت ناکرێ، هەنگاوێکی تر ... ل ٥٨ ـ بەڵێ ! هاوتایی لە نێوان دوو شتا ئەبێ و (بوتە) یش بێ دوو شتەکە هەر هەنیەکەم (زولف)ەو دووەم (لەرزوتا) بۆ مەعناو وردەکاری و تەوری یەکاری بەیتەکەیش هەر (بوتە) دەگونجێ ، چونکە مەعنای بەیتەکە ، وەك من تێی دەگەم ، بەم جۆرەیە : زولفی یارکە بە (با) لەرایەوەو بە هۆی لەرانەوەکە داوداوو تاڵ تاڵ بوو ـ تا ئێرە مەعنـای نیوەی یەکەمەو نیوەی دووەمیش دوو مەعنا

دەبەخشێ ، یەکەمیان: زولفی یار بەشێوەی سەرولەگەڵ لەرزو تاڵ هێنانی بینەرانی (بوتە) هەمتا، هەر لەرایەو بینەران لەرزو تایان لێدێو نەخۆش دەکەون وەك ئەوە ئەفسوون و جادوویان لێکرابێ.دووەمیان:

زولفی یار ئەوەنـدە نەرم و خاوو ئاوریشمینـە بەکـزەبـایێکی هێـواش دەلەرێتەوەو تاڵ تاڵ و داو داو ئەبێ جا کە کزە بایشەهەردەم هەڵدەکات و

هەمیشەیی یە، لەرانەوەو تاڵ تاڵ بوونی زوڵفی یاریش بۆتە
هەمیشەیی و، لەگەڵ لەرانەوەو تاڵ تاڵ بوونا هاوتایە ئەمەو، کە باس
باسی زوڵف بێ دەبێ هەر ئەو ببێتە فاعیلی (بۆتە).لە بارەی (بۆ) ی (ب ٦
لەبارەی (بۆ) ی (ب ٦، ل ٤٢)ی

**موتالای دەوری زولفەینی موسەلسەل**
**ئەوەندەم کردووە لێم بۆ بە سەودا**

یتەوە، کە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا (بوو) بووەو مامۆستا بەپێی بۆ چوونی خۆی و بەڵگەی ئەوە کەمادەم عەتفی (بۆ = بووە) کراوەتەسەر (کردووە) ، ئەبێ (بۆ = بووە) بێ نەك (بوو)، گۆڕیویە، دەڵێم : پێشەکی عەتفی (بۆ) (بووە) یا (بوو) ، بەچی کراوەتە سەر (کردووە) و، بۆ؟! ئەوەی من تێی گەییوم، عەتف و شتی‌والەنێوان دانی‌یەو (لێم بوو بە سەودا ئەنجامی فیعلی یەکەمە کە زۆر موتالا کردنی زولفەینی موسەلسەلە.
ئەمەو، من ئەم زانیوە (بووە) بکرێتە (بۆ) تەنیا (بووەوە) دەکرێتە (بۆوە) ،

هەروەك (بووەتە دەکرێتە (بۆتە) هەروەها، ئەگەر (بۆ) (بووە) نەك (بوو) بێ، لەرووی زمانوزمانەوانی‌یەوە، چ پێویستیمان بە (بە) ی پێش (سەورا) نابێ ، (لێم بووە سەودا) کوردییێکی رەوانەو بێ گرێ و گۆڵە، کە (بە) یەکە هەیە (بوو بە سەودا) یەو فاعیلەکەیشی موتالاکردنە.دیارە مامۆستا خۆیشی هەستی بەلاوازی و نامۆیی رستەی (لێم بۆ بەسەودا)ی کردووە، بۆیە نووسیویە (بەبۆچوونی تایبەتی ئێستایشم کە لە هیچ دەستنووسێکا پاڵپشتێکم بۆ نەدۆزیوەتەوە ، لام وایە «لێم بۆ بە سەودا نەبێ لێم بۆتە سەودا بێ.وابزانم لەحاڵی دەسکەوتنی پاڵپشتیش هەر بوو بە سەودا) راسترە، چونکە (بۆتە) وەك مامۆستایش لە لاپەرە (٦٣) ی کتێبەکەی دا گوتوویە، دیالێکتی کۆیێ نی‌یە.
لە بارەی (چێ)ی (ب٥ ، ل ٤٦)ی

**لێی مەپرسە مەسئەلەی نوقتەی دەم و موویی کەمەر**
**مووشکافە، بووعەلی باسی پەری و جین چێ دەکا**

یشەوە، نووسیویە :(لەتێکستەکەی شارەزاو میراندا «جیننی دەکا) راستکردنەوە: بەگوێرەی دەستنووسی یەکەم بەڵگەی راستی: حاجی قادر ئەیەوێ دەمی یار لە بچووکیداو کەمەری لە باریکیدا بەنەبوو بشوبهێنێ و ئەڵێ : یەکێکی وردی وەك ئەبوو عەلی سینا ـ ئیبن سینا ـ ف ـ باسی شتی نادیاری وەك پەری‌و جنۆکە چاك ئەکاو ساغ ئەکاتەوە) ـ هەنگاوێکی تر ل ٦٣ ـ مامۆستا هەر ئەمەندەی نووسیوە کەنەمەعنا تەواو دەدا بە دەستەوە، نەبەکاری بەلگەی راستی (چێ) یش دێ دەبوو هەر ئەوەی بکردبایە بەڵگە کەنووسیویە «هاوجۆری سنووری دوا وشە لە هەموو بەیتەکانا کە بە (... ێ دەکا) دوایی دین وا پێویست ئەکا لەمیشدا (باسی پەری و جین چێ دەکا) بێ ...) ئەمە ئاواو،لەبەر ئەوەیش کە تا ئێستا نەبیستراوە (حاجی) تەنانەت بە دەگمەنیش دوو وشەی کرمانجی سەروو، بەتایبەت لە غەزەلەکانی‌دا، بەکاربێنێ ، کە (چێ‌دەکا) ی کرمانجی سەرو نە بێ و لە ئەوەلەوە (جێ دەکا) بووبێ بەهەڵەکرا بێتە (چێ) .
لە شێوە نووسینی کۆن بۆ هونەر نواندنی خۆشنووسی نوقتەکانی (ج) و (ی) ی (چێ) یان لە شێوەی سێ کوچکە دادەنا .
لەبارەی(مەهـ)ی (ب ١، ل ٤٩)ی

**کە تۆفانی سروشکم کەوتە غەوغا،**
**بەمەهـ ماهی گوتی : (یا حافظ الله)**

یشەوە، نووسیویە «ئەم بەیتە لە تێکستەکەی شارەزاو میراندا هەڵەیەکی تیابوو لەگەڵ ئەوەیشا کە بەپێی مەعنای بەیتەکەو بەگوێرەی دەستنووسی یەکەم دەستنیشانم کردبوو راستی کەمەوە، لەیادم چووەو لە چاپەکەیشدا ماوەتەوە.
ئەویش وشەی (مەه)ە کە ئەبوو بەکردایە بە (ما) چونکە حاجی قادر ئەیەوێ بڵێ: کەفرمێسکم لافاوی کرد ، لافاوەکەی ئەوەندە زۆربووەماسی کە لەناو ئاوا ئەژی و لە ئاو ناترسێ، ترساو پێی وتین خوا بتانپارێزێ لەم ئاوە. کەواتە وشەکە ئەبێ (ما) بێ بەمەعنا (ئێمە) و (مەه) کە مانگە لەم شوێنەدا هیچ مەعنایەك نابەخشێ» ـ هەنگاوێکی تر ...ل ٦٨ ـ ئەمەی خوێندتەوە رای مامۆستا بوو، بەلای منەوە هەر (مەه) کە پەسندترە، چونکە لەودا موبالەغە زیاترەو حاجی دەڵێ: لەگەڵ سەرکردنی لافاوو سێلاوی سروشکم، ماسی نێو دەریایان هاواریان لێ‌هەڵساو بانگیان کردە مانگی ئاسمانان : وریای خۆت بەو خوا بتپارێزێ لەم لافاوو سێلاوە کە ئاوا توندوبە خوڕو زۆرە لەوانەیە تۆیش، نەك هەر تەنیا خەلکی سەر گۆی زەمین، بخنکێنێ ئەمەو ئەگەر (ما)ی پێشنیاکراوی مامۆستا بێ، دەبێ دان بەوەدا بنێین کە بەکارهێنانی (ما) لە جیاتی (مە)ی دیالێکتی کۆیێ تەنیا بۆ زەروورەتی شیعرە.
لەبارەی (تەدبیری) ی (ب ١، ل ٥٢)ی

**دڵ هیلاکی نازتە باغەمزە تەدبیری نەکا**
**هەر دەبێ بمرێ مەگەر خەللاق تەقدیری نەکا**

یشەوە، نووسیویە «لەتێکستەکەی شارەزاو و میراندا «تەگبیری» راستکردنەوە:
بەگوێرەی دەستنووسی یەکەم بەڵگەی راستی: «تەگبیر» وشەیەکی ناوخەڵکی هەندێ ناوچەی‌کوردەواری‌یەو. ڕێبازی شیعری کلاسیکی

عەرەووزیی کوردی واپێویست نەکا (تەدبیر) بێ، سەرەڕای ئەوە کەدیالێکتی ناوچەی کۆیەی نیشتمانی حاجی قادریش (تەدبیر)ە» ـ هەنگاوێکی تر ...ل ٧٠ ـ بەڵێ ! (تەدبیر) لەگەڵ ڕێبازی شیعری کلاسیکی و ئاستی خوێندەواری حاجی دەگونجێ. ئەمە شتێکە براوەتەوە. بەڵام بەچی بۆمان دەچەسپێ کە (تەدبیر) دیالێکتی ناوچەی کوێی‌یە ؟! من لەو بڕوایەدام هەموو ناوچەی کۆیەی سەردەمی حاجی و، بگرە ئێستایش ، مەلایەکی مەلای چاك نەبێ، نەی گوتووە (تەدبیر). لەبارەی (حاڵە) ی (ب٢ ، ل ٥٩)ی

**حاڵە نەقدینەیە، موستەقبەل و ماضی پەشمە،**
**بێ ئەمەل صەرفی مەکە سیم و زەری فورصەتی خۆت**

یشەوە کە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا (حاڵ) بووە، مامۆستا بەگوێرەی دەستنووسی یەکەم و بەبەڵگەی ئەوە کە «مەعنای بەیتەکەو ڕاگرتنی سەنگی نیوە بەیتەکە کە ئەگەر وەك تێکستەکەی شارەزاو میران بێ لەنگ ئەبێ» هەنگاوێکی تر ...ل ٨٤ ـ گۆڕیویە، : دەڵێم نازانم (حاڵ نەقدینەیە) لەڕووی مەعناوە چ نارێکی‌یەکی تێدایە : لە کوردی‌دا ڕستەی لەم جۆرە زۆرن بۆ نموونە: حازر لەقەرز چاکترە، ماڵ لە نەخۆشخانە خۆشترە.ئەگەر بۆ مەعنا (ە) پێویست با، دەبوو بڵێن (حازرە) و (ماڵە) ! ئەوەش کە سەنگی بەیتەکە پێویستی پێ‌بەتی، نابێتە بەڵگەی دانان و پارێزگاری لێکردنی چونکە خوێنەر، بەناچاریی ، بۆ دەرباز بوون لە (ئیلتیقائوسساکینەین) سووکە بزوێن دەخاتە سەر (ڵ) هکەو دەبێتە پارسەنگی لەنگی بەیتەکە لەبارەی (نەکەیە)ی (ب٤ ، ل ٥٩)ی

**من بە پەیغام و بە قاصید (موتەسەللی) نابم**
**تاکو بانگم نەکەیە بارەگەهی حەزرەتی خۆت**

یشەوە، کە لەتێکستەکەی شارەزاو میران دا (نەکەنە) بووە، مامۆستا بە گوێرەی دەستنووسی یەکەم و ، بەڵگەی ئەوە کە شاعیر «باسی خۆی ئەکاو لەگەڵ یار ئەدوێ و ڕووی دەم ئەکاتە ئەو، سەرەڕای ئەوە کە دیار نی‌یە ضەمیری جەمعی (نەکەنە) بۆکێ ئەگەڕێتەوە» ـ هەنگاوێکی تر ...ل ٨٥ ـ گۆڕیویە ، دەڵێم: بەرلەوەی پاڵپشتی یەکێك لە دوو تێکستی (نەکەیە)و (نەکەنە) بکەم، لە ڕووی مەعناوە هەردوو تێکستەکە دەگونجێن.

بەڵام کامیان گونجاوترە ؟ بەلای منەوە (نەکەنە) گونجاوترە جا قسە لەگەڵ کراو یاربێ ، کە تاکە ئەو کاتە بەزاراوەی حوجرە وەك (إنا أعطیناك)میەو بۆ ڕێزلێنان تاك بە کۆمەڵ دانراوە یاضەمیری (نەکەنە) بگێڕینەوە بۆ (پەیغام) و (قاصید) واتە تا پەیغام و قاصیدەکان بانگی بارەگای حەزرەتی خۆتم نەکەن، ناحەسێمەوە من-(نەکەنە) م بەم مەعنایە، ، بەلاوە، پەسندترە، چونکە خاوەن بارەگاو حەزرەت خۆیان، یەکسەر ، بانگی خەڵك ناکەن، بەڵکوو دەست وپێ پەیامیان ڕادەگەیێنن.

لەبارەی (دەهەژاوو) ی (ب٤ ، ل٦٠)ی

**وەکوو دەریایە نەسیمی سەحەری سەبزەیی گوڵ**
**پێکەوە مەوج و حوبابی دەهەژاوو دەبزووت**

یشەوە کە نووسیویە: «لەتێکستەکەی شارەزاو میراندا : «دەهەژاودو» ڕاستکردنەوە: بەگوێرەی دەستنووسی یەکەم. بەڵگەی ڕاستی: مەعنای نیوە بەیتەکەو، پێویستی هاوجۆریی فیعلی مەعطوف (دەبزووت) و فیعلی مەعطوفو عەلەیهی (دەهەژاوو) ، چونکە ئەبێ یا یەکەم دەهەژاووبێ یا دووەم (دەبزووتەوە) بێ، ئاشکرێ دووەم (دەبززوتەوە) بێ، کەواتە یەکەم (دەهەژاوو) وە» ـ هەنگاوێکی تر ...ل ٨٧ ـ دەڵێم: ئەوەی پێویستە لە نێوان مەعطوف و مەعطوفو عەلەیهی دابێ بوونی پێوەندی‌یەو بۆ پێوەندیش ئەوەندە بەسە کەهەردوو فیعلی (دەبزووت) و (دەهەژاوە) لە ئەصلی (بزوتن و جوولان) یەك دەگرنەوە،دیارە پێوەندی نێوان دوو شت وهاوجۆرییان زۆر لەیەك جیان ئەمەو لە ڕووی مەعنایشەوە (دەهەژاودو) بەلا غەت و موبالەغەی زیاترە لە (دەهەژاوو)، چونکە (هەژان) دووبارە بوونەوەی (بزووتن)ە و (هەژانەوە)یش واتە دووبارە بوونەوەی (هەژان) دیارە ئەمەیش لەگەڵ شەپۆلدانی بەردەوامی دەریاو شیناوەرد زیاتر دەگونجێ عەتفەکەیش لەهەردوو حاڵ دا، هەر عەتفی عاصمە بۆ سەر خاص.

لە نیوەی یەکەمی ئەم بەیتە دوو هەڵەی زەقی دی هەن، وادیارە تائێستا ، بیریان لێ نەکراوەتەوە، بۆیە بە پێویستم زانی سوود لە هەڵکەوت وەرگرم و ڕاستیان بکەمەوە داکۆکێ کردن لە ڕاستیشیان هەڵ دەگرم بۆ کاتێك کە بۆم بلوێ ئەو پەراوێزانەی بەم دوایی‌یە بەسەر دیوانی حاجی‌یەوە نووسیومن، بخەمە بەرنیگای وردبینتان.

ئەمەیش ڕاستکردوەی نیوە بەیتەکەیە:

**وەکوو دەریا بە نەسیمی سەحەری، سەبزەو گوڵ**

لەبارەی نیوەی یەکەمی (ب١ ، ل ٦٥)ی:

(حاجی) وەك دڵ تۆ بەگریە بەشوێنی مەکەوە
ئاسکێکە بە بەزین و بەهەرا نایەتە گیر

یشەوە کە نووسیویە «ئەمە ئەو تێکستەی شارەزاو میرانە کەلە چاپی دیوانەکەیشدا دەسکاری نەکراوە، بەڵام لە دەستنووسی یەکەمدا نیوەی یەکەمی بەیتەکە بەم جۆرەیە:

**حاجی وەك پەیکی دڵ و گریە بەشوێنی مەکەوە**

ئێمە ئێستا ئەمەی دەستنووسەکەمان لاپەسەندترە لەبەر زۆرتریی مەعنای و، لەبەر ئەوە کەلە (بەشوێنی)دا بەگوێرەی ئەم هیچ گیری و وەستانێك نابێ» ـ هەنگاوێکی تر ... ل ٨٩ ـ دەڵێم: لەوانەیە ئەم تێکستەیەی دەستنووس بەهۆی وشەی (پەیکی) مەعنایێکی زیاتر بە بەیتەکە بدات، بەڵام (گریە کەوتنە شوێن) کۆسپی سەر ڕێگای پەسندکردنیەتی و، نەبیستراوەو نەدیتراوە نەگونجاوە گریە بکەوێتە شوێن شت ئەمە ئەگەر

عەتفی (گریە) بکرێتە سەر (پەیکی دڵ)، خۆ ئەگەر عەتفی بکرێتە سەر (دڵ) ، ئەوا کێشەکە قووڵترو ناقۆڵاتر دەبێ ، دەنا (پەیکی گریە) یانی چی؟! دەبێ (گورپە) بووبێ (حاجی) لە بەیتی یەکەمی لاپەرە ١٢٣ دا دەڵێ : (ئەی دڵی خەستە وەکوو گورپە بە شوێنی مەکەوە) ، (گریە) هەڵەی نوسخە گرموەکان یاچاپە.

لەبارەی (فیدای جوتیارتان بێ) ی (ب ٢ ، ل٧١)ی:

**فیدای جوتیارتان بێ حاتەمی تەی**

**بە قوربانی سەپانتان ئالی بەرمەك**

یشەوە کە نووسێویە :«لە تێکستەکەی شارمزاو میراندا «بەفیدایی شوانتان».

راستکردنەوە: بەگوێرەی دەسنووسی دووەم و سێیەم. بەڵگەی راستی هەرچەندە (شوانتان) بۆ ئەم شوێنە لە (جووتیارتان) بەهێزترە چونکە جووتیار لەوانەیە شتێکی ببێ، بەڵام شوان هیچی نییە، ئەوەندە هەیە کە (فیدایی شوانتان) بەو دوو ئیشباع پێدانە نیوە بەیتەکە زۆر قورس ئەکا، ـ هەنگاوێکی تر ل ٩٤ ـ دەڵێم : وەك لەوتاری (دیوانی حاجی قادری کۆیی و چەند سەرنجێك)ی (کاروان)ی ژمارە (٤٧) و، لە وەڵامی هەڵسەنگاندنی ئەو وتارەم لەلایەن مامۆستاوە، گوتومە، (جووتیارتان) لەبەرانبەری (حاتەمی طەی) دا ناگونجێ، بۆیە یا دەبێ تێکستەکەی (فیدای گاوان و شوانتان ...) ی (گیوموکریانی پەسند بکرێ، یا (بەفیدایی شوانتان) ی تێکستی دەسنووسی شارمزاو و میران پەسندبکرێ. ئەمەو، ئەگەر دەسنووسی یەکەم و (دیاری کوردستان) ، کە بەقەولی مامۆستا، ئەم پارچە شیعرەیاتێ دا تومارکراوە، (بەفیدایی شوانتان) یان نووسیبێ ئەوا تێکستی دەسنووسی شارمزاو میران بەهێزتر دەکەن.

لەبارەی (باوجوودی)ی (ب١، ل ٨١)ی:

**دووصەد گوناهی هەیە خەلق باوجوودی کەریم**

**ئەمی کە داویە دەیدا چ رازیقێکە کەریم!**

یشەوە کەنووسیویە : «لە تێکستەکەی شارمزاو میراندا «باوجود» راستکردنەوە.

بەگوێرەی دەسنووسی دووەم بەڵگەی راستی: (باوجوودی) واتە لەگەڵ بوونی ئەو گوناهانەیشداو، ئەو ضەمیری (ی) بۆ (گوناە) ئەگەرێتەوەو پێویستەو ئەگەر نەبێ (باوجود) هیچ مەعنایەك نابەخشێ سەرەرای ئەوە کە نەبوونیشی تا رادەیەك نیوە بەیتەکە لەسەر زمان قورس ئەکا، هەنگاوێکی تر ...ل ١٠٩ ـ دەڵێم : کە ضەمیر پێویست بێ ، دەبێ ضەمیری جەمع بێ ، چونکە گوناهەکان دوو صەدن و ضەمیری موفرەدی (باوجوودی) یان بۆ نابێ، دەبێ (باوجوودیان) بێ کە ئەمەیش لەگەڵ کێشی شیعرەکە رێك نایێ بۆیە دەبێ (باوجوود) بێ بۆ مەعنا بەخشینیش: مەعنای (لەگەڵ ئەوەیشدا)ی مامۆستاو (کەچی) یا (ئێستایش) پر بە پێستییەتی ، واتە خەڵك ئەو هەموو تاوان و گوناهەیشی هەیە ، کەچی، یائێستایش ، کەریم ئەوەی داویە هەردەیدا ... ئەوەیش کە (باوجوود) بەیتەکە لەسەر زمان قورس ئەکا، نابێتە بەڵگەی راستی (باوجوودی) ، چونکە هەر چۆنێ بێ تۆزێ قورسی ، ئەگەر هەیشبێ ، لە هەڵەی وەك یەك نەبوونی ضەمیرو مەرجەع باشترە بۆیەیش دەڵێم : (ئەگەر هەیشبێ) چونکە لێرەدا وابزانم، قورسییەکی ئەوتۆ لە ئارادا نییەو ئەوەیش کە بەهۆی زیاد کردنی (ی) یێ (باوجودی) هاتۆتە سەرکێشی بەیتەکە بەلەدەس دانی (و) ی دۆوەمی (دووصەد) لەدەست دەچێ کەواتە، کورد گوتەنی، کەس لە کەس .

لە بارەی (گەر مردوون) ی ب٢ ، ل ٨٥)ی:

**وارێکەتان دەبەسرێ عێلاتی جاف و بڵباس**

**گەر مردوون لەگەرمێ مەمنووعە بچنە کوێستان**

یشەوە کەلەتێکستە دەسنووسەکەی شارمزاو میران دا (کە) و (مردبن) ن. مامۆستا بەگوێرەی دەسنووسی یەکەم، یەکەم و ، بەگوێرەی پارچە بەیازێك، دووەمی گۆڕیوە

دەڵێم : دەبوو مامۆستا هەردوو وشەکانی بەگوێرەی پارچە بەیازەکە راست بکردایەتەوەو (ئەگەر مردوون) ی نووسیبا ، چونکە لە (گەر مردوون)ی تێکستی پەسندکراوی مامۆستا بۆوەدەس هێنانی برگەیێك دەبێ بۆرێکی چکۆلانە بخرێتە سەر (و) ی دووەم نازانم بۆ ئەو بۆرە ، ئەگەر چکۆلەیشە، ئەوەندە قورسە کاری ناچاریی نەبێ مرۆ بۆی هەڵناگیرێ، بۆیە کەیشە خوێنەران زۆربەیان پارێزگاریی لێناکەن.

لەبارەی (ماون) ی (ب ٦ ، ل ٨٦)ی:

**رۆمی وەکوو بەنی موون کەس پشتیان پێ نەبەستێ**

**کەوتوونە داوی خۆیان، سەرگەشتە ماون و حەیران**

یشەوە، کە لەتێکستەکەی شارمزاو میران دا (ماون)ە و مامۆستا بەگوێرەی دەسنووسی یەکەم و بەڵگەی ئەوەکە «بوونی ئەو (و)ی عەتفە بۆ دروستیی مەعنای رستەکەو بۆ لەسەر زمان رەوانیی نیوە بەیتەکەیش پێویستە» گۆڕیویە ـ هەنگاوێکی تر ...ل ١١٥ ـ دەڵێم: بەش بەحاڵی مەعنا دروستیی رستەکە بەبێ (و) ی عەتفیش مەعناکە دروستە، بەڵکوو باشتر وایە بێ (و) بێ، چونکە عەتفی تەفسیر پێویستی بە ئەدات نییە. بەش بەحاڵی رەوانی نیوە بەیتەکەیش ، دیارە (ماون حەیران) لەسەر زمان رێکەو بەلای منەوە لە (ماون و حەیران) لە بارترەو، کێشی بەیتیش تەواوە، کەوابێ (و) مکە زیادە.

لە بارەی (کوندەبوو و جوغدە) و (دۆمان) ی (ب٤، ٩٢)ی:

**سەراو ئەیوانیان ئێستا کەلاوەی کوندەبوو و جوغدە**

**ئەگەر مەیدان و دیوانە سەراپا بوویتە جێی دۆمان**

یشەوە، کە لەتێکستی شارەزاو میران دا (کوندو دالآشە) و (دۆمان) بوون و، مامۆستا (کوندەبوو)ی بەگوێرەی دەستنووسی یەکەم وگۆڤاری (ژین) و، (جوغدە) ی بەگوێرەی دەستنووسی چوارەم و بەڵگەی ئەوەکە «کوندەبوو و جوغدە) گونجاوترو پڕمەعناترە بەتایبەتی کە (کوند) هیچ نییە» ـ هەنگاوێکی تر ...ل ١٢٨ ـ پەسندکردوون و، (دۆمان) یشی بە گوێرەی دەستنووسی یەکەم و بەڵگەی ئەوەکە (مەیدان) بۆ ڕۆم دەس نادا کە حوکمیان کردووە، بۆ (دۆم) باشترە کلآشی تیا بکەن» ـ هەنگاوێکی تر... ل ١٢٨ ـ هەڵبژاردووە، جا لە ئاستی بەڵگەی هەڵبژاردنی (کوندە بووو جوغدە) دەڵێم: بۆ (کوندەبووو جوغدە) کە وەك مامۆستا خویشی لە پەراوێزدا نووسیویە، هەردووکی یەك شتن ، گونجا وترو پڕمەعناترە ، لە (کوند و دالآشە) کە دووباڵندەیَ وێرانەیی و گۆشت خۆرن لەوانەیە هۆی پەسندکردنەکەی مامۆستا تەنیا هەر بۆ خەلاس بوون لە (کوند) بووبێ ، کە بەرای ئەم هیچ نییە! بەلآم لە هەولێرو دەوروبەری کە (کۆیێ) یش دەگرێتەوە (کوند) بەکار دەبرێ و لەفەرهەنگەکانی (خاڵ) و (مهاباد) یش، تۆمارکراوە.

ئەمەو، کە (کوند) پەسند نەکرێ، دەبێ (کوندەبۆ) بنووسرێ ، چونکە لە (کۆیی)ی ولآتی (حاجی) (کوند) و (کوندەبۆ) و (کوندەبەبۆ) گوتراوەو (کوندەبوو) جگە لەوەی نەبیستراوە، لە حاڵی بەدوا داهاتنی (و) عەتف ، وەك لەبەیتەکەدا ، لەڕووی شەکل و تەلەففوز کردنیشەوە ناقۆڵاو قورسە .

سەیری نووسینەوەی ئەم وشەیەلەچاپیتازەی دیوانی حاجی و کتێبەی مامۆستادا، بکە ، چۆن بوەهەموار کردنی شەکل سێ (و) ی بەدوایەکدا هاتوو (و) ی عەتف ، کە بەپێی ڕێنووسی کوردی لەتەك وشەی پێش خۆی دەنووسرێ ، وەك وشەیەکی سەربەخۆ مامڵەتی لەگەڵ کراوەو لە نێوان مەعطوف و مەعطوفو عەلەیهی دا دانراوە:.

لەبارەی هەلآوێردنی (دۆمان) بەسەر (ڕۆمان) یش دا، دەڵێم : کە ڕۆم حوکمڕان بوون و لە دیوان دانیشتوون، هەڵبەت پێویستیان بەلەشکرێك بووە بۆ پارێزگاریی و بەردەوامیی حوکمڕانی و تۆقاندن و داگیرکردنی زیاتر دیارە لەشکریش پێویستی بە (مەیدان) ە، (دۆم) ی بەسەزمان ماڵ و کەرستەی باری دووکەری بۆزو پووزەو بە (٢٠) ماڵ (مەیدان) ێك پڕناکەن و، بەیەکەوەیش ناگەڕێن تا لەمەیدان نەبێ جێگەیان نەبێت چاکە مامۆستا ، لەپەراوێز، گەڕاوەتەوە سەر ئەوەکە (ڕۆمان) مکە ڕاستە.

لە بارەی (ناغەڵەتێن) و (لە ئاخیرا) ی (ب ٣ ، ل ٩٦)ی:

**بەحوققە بازی یو لەعبی زەمانە ناغەڵەتێن**

**ئەمێستە پێ دەکەنین و لە ئاخیرا دەگرین**

یشەوە کە نووسیویە : «لەتێکستەکەی شارەزاو میراندا «ناخەڵەتێن»و «لە ئاخیری» ڕاستکردنەوە: بەش بەحاڵی جیاوازیی یەکەم بە گوێرەی دەستنووسی یەکەم و، بەش بە حاڵی جیاوازیی دووەم هەردوو دەستنووسی یەکەم و دووەم بەلگەی ڕاستی بەش بەحاڵی جیاوازی یەکەم (ناغەڵەتێین) دیالێکتی ناوچەی کۆیەی نیشتمانی حاجی قادرە بەش بە حاڵی جیاوازی دووەمیش (لە ئاخیری) بە پێی گراماتیکای زمانی کوردی هەڵەیەو یا ئەبێ بووترێ (ئاخری) یا بووترێ لە (ئاخرا) هەنگاوێکی تر ..ل ١٣٢ ـ دەڵێم : بەش بەحاڵی جیاوازی یەکەم ، ئێمە لەسەرمانە بەرلەوەی بەتەنگ دۆزینەوەو چەسپاندنی دیالێکتەوە بین ، بەدەنگ بردنەوە سەریەکی تەواوی مەعنای بەیتەکەوە بێین، چونکە بەیتەکە بەو جۆرە کەلە چاپی تازەی دیوانی حاجی دا هاتووە، مەعنا بە دەستەوە نادا و گریانی ئاخیری کاران پیشەی پیاوی غەڵەتاوە، نەك نەغەڵەتاو بۆیە دەبێ بۆ ڕاست کردنەوەی ئەم بەیتە سوود لە چاپی سێیەمی دیوانی حاجی وەرگرینونیوە بەیتەکە بەم جۆرە بنووسینەوە : (بەحوققەبازی و لەعبی زەمانە، نا غەڵەتین ) واتە : نانا ئێمە غەڵەتین ، کە بەحوققە بازی و لەعبی زەمانە پێ دەکەنین ڕاستە ! ئێستا پێ دەکەنین ، بەلآم لە ئاخیری دا دەگرین ئەمەو، ئەگەر بەنەبوونی (و) ی دوای (پێ دەکەنین و) تووشی لە نگی کیش نەبین نەبوونی باشترە.

بەش بە حاڵی پەسندکردنی (لە ئاخرا) بەسەر (لەئاخیری) یش دا، دەڵێم ئەمەیان بەپێی گراماتیکای زمانی کوردی هەڵەبێ، یانا ، لەولآتی کۆییو دەوروبەری باوەو گوتراوە. لە فولکلوردا هاتووە (... لە ئاخیری هەرێی خۆمی) و خاڵە (تایەر توفیق)یش ، خوا لێی خۆشبێ ، لە ئاخیری ئازیزەمیەکی نزا لە بەکرۆکان دەکاو دەڵێ: « ... لە ئاخیری ساڵێ رەنج بەخەساربی!» حاجی قادر بۆخویشی لە بەیتێکی دا دەڵێ:

**ئەم هەموو زوڵەی ڕەقیب کردی لە ئاخیر دولبەرم**

**ماڵی ئاوابێ ! بەماچی لێوی تۆڵەی کردەوە**

لە بارەی (زێری زەمین)ی (ب ٤، ل ٩٧)ی:

**لە قور بنیشە بڵێ: قەوم و قیلە هاوارە**

**ئەسیرە (کەیفی) لە ڕۆما لەحەبسی زێری زەمین**

یشەوەکە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا (ژیری) بووەو مامۆستا بەگوێرەی دەستنووسی دووەم و بەبەڵگەی ئەوەکە «لە شیعری کلاسیکی عەرووزیی کوردیدا (زێر زەمین) وتراوە نەك (ژێر زەمین) گۆڕیویە، دەڵێم : بەڵێ ! (زێرزەمین) وەك زاراوە ئێستایش و لە ئاخاوتنی ئاساییش دا، نەك هەر لە شیعری کلاسیکی کوردی، بەکار دەبرێ ، بەلآم کەزاراوەکەمان بە هێنانی (ی) یێ ئیزافەی دوای (زێر) لەیەك هەڵوەشاند ، وابزانم ، هیچ شتێك ڕێی ئەوەمان لێ ناگرێ کەزیاتر وشەکە بەلای کوریدا پێنین و (زێر) بکەین بە (ژێر) ئەمەو، ئەوەیش کە مامۆستا لەلاپەرە ٥٩ی کتێبەی داو، لەکاتی داکۆکی کردنی لە ڕاستێ (دندان) و هەڵەیی (دەندان)، نووسیویە : «(دەندان)یش وەك (دندان) ڕاستە.

بەڵام وشـــەیـــەکی فارسی زەقی وەك (دەنـدان) تا ئێستـە لە کوردیـدا نەبیسراوەو ئەگەر کورد نەیشلێ (ددان) یا (دان) و فارسی‌یەکە بەکاربێنێ، ئەوەندەی دەسکاری ئەکا لەگەڵ سروشتی زمانەکەی خۆیا بگونجێ...»

هەروەها ئەوەیش کە لەپەراوێزی ژمارەیەکی لاپەرە ١٠٣ دا نووسیویە : «گـەلێ وشـەی فارسی‌یش کە هاتـوونـەتـە شیعـری کوردی‌یـەوە جۆرە دەسکاری‌یەك هەرکراون» پشتگیری رایەکەم دەکەن.

لەبارەی (چەن) و (دەگرین) ی (ب ٧، ل ٩٧)ی:

**حەزین و دەرهەمی ئەم شارە زۆری بێگانەن**
**لە حەسرەتی عەجەبا شارەزووری چەن دەگرین**

یشەوە کە لەتێکستەکەی شارەزاو میران دا (چۆن نەگرین) بووەو ماموٚستا بەگوێرەی دەسنووسی دووەم و بەبەڵگەی ئەوە کە (چەن دەگرین) لە رووی مەعنـاوە زۆر دەوڵەمـەنـدتـرە، چونکە (چۆن نەگرین) بەڵگە بۆ ئەسلی گریـانـەکـە دێنێتـەوە، بەڵام لە (چـەن دەگـرین) دا ئەسلی گریانەکە سەلمێنراوە بەجێ‌یە، باس باسی ئەندازەکەیەتی» ـ هەنگاوێکی تر ... ل ١٣٦ ـ دەڵێم: من وام بەلاوە پەسندترە کە (چۆن) ەکەی تێکستی شارەزاو میران و (دەگـرین) ی دەسنـووسی دووەم بەیەکەوە دابندرێن و (چۆن دەگرین) بنووسرێ ، بەم جۆرە سەرباری چەندایەتی (الکمیه) کە زیمنەن وەدەس دێ، (چۆنایەتی (الکیفیه) شمان دەسگیر دەبێ.

لەبارەی (عاقل) (بەیتی ٦، ل ٩٩) :

**ئەدیب و عاقلی لەم بەحرە وەك (ترێ بنگۆم)**
**گەلێکی وون بووە (حاجی) وەچاکە لێی دەرچین**

یشـەوە کە لەتێکستـەکـەی شارەزاو میران دا (عاقل) بووە و ماموٚستا بەگـوێرەی دەسنووسی یەکەم و دووەم بەبەڵگەی (ڕاگرتنی سەنگی نیوە بەیتەکە) گۆڕیویە، دەڵێم: بەڵگەکە رەوایە ، بەڵام (ی) ە کە چ کارەیە؟! بۆ ڕاناوو ئیزافەو نیسبەت ناشێ، بزوێنیش نی‌یە، کەواتە (هەڵە) نەبێ هیچی دی بۆنەماوە. بەلای منەوە، (عامل)ی تێکستی شارەزاو میران و گیویی موکریانی ڕاستەو بۆ چارکردنی لەنگی سەنگی بەیتەکەیش دەبێ (وەك) بگێرینەوە سەر دیالێکتی کوێ و (وەکی ترێ بن گوم) ی بنووسین.

لە بارەی (کەلکی) ی (ب ٧، ل ١٠٣)ی:

**زەمانی حاڵ و سەرمایەی بەدونیکت نەبوو کەڵکی**
**لەموستەقبەل بڵێ (حاجی) لە ماضی دا زەمانی بوو**

یشەوە کە نووسیویە «ئەم بەیتە هەڵەیەکی تریشی تیایە لەگەڵ ئەوەیشدا کە دەسنیشمانمان کردبوو بۆ ڕاستکردنەوە، فەرامۆشمان کردووە ڕاستی کەینەوە.

ئەویش وشەی (کەڵکی)یە کە ئەبوو بەگوێرەی دەسنووسی یەکەم وسێهەم و بەپـێی ڕێبـازی شیعـری کلاسیکی عەرووزی کوردی بیکـەین بە (سوودی)»ـ هەنگاوێکی تر .. ل ١٤٣ـ دەڵێم: دەڵێم ئەگەر بەگوێرەی ئەم بەڵگەیە ڕەفتار بکەین و گوێ بەلایەنی دی نەدەین، دەبێ هەرچی (کەلکی) و داڕێژراوەکانی هەیە وەك (بەکەل دێ ... و، کەلکیان دەگرێ..) بکەینە (سوودی) و (بەسوودە) و (سوودی لێ وەردەگرن) کە ئەمەیش یاکێش یاسـەروا یا هۆی دیکـە ڕێگەی نادەن بەڵێ ! ڕاستە ، زمانی ئەدەبێ و ڕێبـازی شیعری سەردەمی شاعیر دەبێ بپارێزرێن، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نی‌یـە هەر وشـەیێ بەرانبەرێکی باوی ڕێبازی شیعری کلاسیکی هەبێ بیکەین بەم. هەروەها مەرج نی‌یە شاعیری کلاسیکی واز لەهەمەو وشەباوو بڵاوەکانی دیالێکتی ناوچەی خۆی بێنێ.

لە کۆتایی پەراوێزی کۆتایی سەر ئەم پارچە شیعرەو، دوای هەڵسەنگاندنی بۆچوونەکانی ماموٚستایان مەلا جەمیل ڕۆژبەیانی و عەبدوڕڕەزاق بیمار لەبارەی (بەیتی ١، ل ١٠٩)ی:

**فیدجوملە وەکوو خاڵی ڕوخی دولبەری (حاجی)**
**دڵ پەستە، دەسابادی هەستە مەلەرزە**

یشەوە نووسیویە : «... لەگەڵ هەموو ئەمەیشدا، من هێشتا نەوەجهی ئەم تەشبیهەم بۆ ساغ بووەتەوە، نەپێوەندی نێوان نیوەی یەکەم و دووەمی بەیتەکە» ـ هەنگاوێکی تر ... ل ١٤٨ـ

لە بۆ چوونـەکـانی مامـۆستـایـان مەلا جەمیل و عەبدوڕڕەزاق بیمارو هەڵسەنگاندنیان لەلایەن ماموٚستاوە، وادەردەکەوێ کەبەلای ئەوانەوە دڵی (پـەست) یا (بـەست) لە خاڵی ڕوخی دڵبەر چوێندراوە، بۆیە ماموٚستا بەدەست ساغ کردنەوەی وەجهی شەبەهی نێوانیانەوە داماوە، بەڵام وەك من لەم بەیتە دەگەم، تەشبیهی دڵی پەست بەخاڵی سەرگونای یار لەنێوان دا نی‌یـە، تا بەدوای وەجهی شەبـەه دا بگەڕێین ، بەڵکوو تەشبیهەکە تەشبیهی بای صەبـایە بە خاڵی سەرگۆنای خرپنی یارو وەجهی شەبەه لەرزینەوەیە. واتە بایی صەبا دەخیلتم ! چیدی ئاوا وەکوو خاڵی سەرگۆنای خرپنی یار لەکـاتی لارو لەنجە کردنیدا، بە ئێواشی مەلەرزەو، هەستەو نەختێ توند هەڵیکە ، دڵم زۆر پەستەو پشووم سوارە بەباێکی توند نەبێ سی‌یەکانم پڕنابن.

لەبارەی (کەمانە)ی (ب ١، ل ١١١)ی:

**دالی قەدم کە ئەلفی عەسای گرت بە دەستەوە**
**تیروکەمانە، صەیدی جەوانیم نەبەستەوە**

یشـەوەکە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا (کەمانی) بووەو، ماموٚستا بەگوێرەی دەسنووسی یەکەم و بەڵگەی : «مەعنای بەیتەکە کەباڵای پیری وەك تیپی (د) چەماوەی شاعیری تیا شوبهێنراوە بە (کەوان) و، عاسای وەك تیپی (١) ڕاستی دەستی تیا شوبهێنراوە بە (تیر) گۆڕیویەو، نەختێ دواتریش نووسیویە : ئەیشگونجێ (تیروکەمانی)بێو مەعنای بەیتەکە وای لێ بێتـەوە : هێشتـا تیرو کەوانی ڕاوی سەردەمی جوانی و لەزەت وەرگرتنیم ئامادە نەکردبوو، پیر بووم و باڵای وەك تیپی (د) چەماوەم دار

عاسای وەك تیپی (١) راستی بەدەستەوە گرت» ـ هەنگاوێكی تر ... ل ١٤٩ ـ جابـەش بە حاڵی (كـەمانە) و بەڵگەكەی دەڵێم : ئەو مەعنایەی كردوویەتی بەبەڵگەی راستی (كەمانە) هیچ شتێكی وای تێدا نابینرێ بۆ بەڵگـە بشێ بۆ ئەوەیش كە نووسیـویە (ئەیشكوَنجێ تیرو كەمانی)، بێ دەڵێم: دەبێ هەر (كـەمـانی) بێ، چونكـە ئەگەر (كەمانە) بێ مەعنای بەیتەكە ئاوای لێ دێت : كەباڵای چەماوەی وەك (د)م عەسای راستی وەك (١)ی گرتە دەستەوە ئەوە تیرو كەوانە ـ تائێرە مەعنای بەیتەكە رێكە ، بەڵام ئەوە كە حاجی دەڵێ : (صەیدی جەوانیم نەبەستەوە) لەگەڵ رێك ناكەوێ لە سەر وشەی (هەستە)ی (ب ٦، ل ١١١)ی:

**ئەو نەورەسەی ئیجارمیی مسكینەكان دەكا**

**حەججاجە گەرچی سەییدە بەم خورج و هەستەوە**

یشـەوە، لەكـاتی مەعنـا لێدانـەوەی مامـۆستـا پەراوێزێكی نووسیوەو لەبەشێكی دا دەڵێ : « لەوانەیشە وشەكە لە بنەرەتا (دەستەوە) بووبێ لەبـەر ئەوە كە لەشێـوە نووسینی كوردیی كۆنـدا مەیـدانی ئەوە زۆرە (دەستە) و (هەستە) بگۆڕێن بەیەك، چونكە لە نووسینی فارسی ئامێزدا زۆر جار (ه) ئەكەوێتە پشت [راستەكەی پیش ـ ف] تیپی درێژكاری وەك (سێن) و لای بنیادەمی بێ ئاگا وەك (د) ی لێ دێ».

جا كەلە شێوە نووسینی كۆن دا مەیدانی ئەوە زۆربێ وشە بگۆڕێن بەیەك، دەڵێم : پێ دەچێ لەبنەرەتا (خورج)یش (گورج) یاگورز) بووبێ.

**هەروەها (هەستەوە) یش، لەشێوە نووسینی كۆندا، لە (پێستەوە) نزیكتـرە، بۆیە دەڵێم : پێ دەچێ لە جێی خۆیدا (بەم گورجی ـ یاگورجە ـ پێستەوە) بووبێ ئەمەو، شوێنەكە داوای بەڵگەی ئەوتۆ دەكـا، كە حەججـاجێتی نەورەسـەكـە ئیسپـات نەك سەیدایەتی یەكـەی، حەججـاجێتیش بەگـورزو ئـامـرازەكـانی زەبرو زەنگ و تۆقاندن دەبێ نەك بەتوورەگەو جۆركی سواڵ كردن.**

**لە بارەی (فیلە) و (لێی لابدە) ی (ب ٣ ، ل ١١٤)ی:**

**شێر وەكوو مووره لەلای زوڵفی كەمەند ئەندازی**

**فیلە مێشوولەیە، لێی لابدە، عەنقاش مەگەسە**

یشەوە كە نووسیویە: «لەتێكستەكەی شارەزاو میراندا «فیل» و «لابدەكە».

راستكـردنـەوە: بەگـوێرەی دەسنووسی یەكەم. بەڵگەی راستی : بەش بەحاڵی جیاوازیی یەكەم ئەگەر (فیل) بێ نیوە بەیتەكە لەنگ ئەبێ بەش بەحاڵی جیاوازیی دووەمیش هیچ پێویستییەك بە (لابد) نییە، بەڵام (لێی لابدە) رستەكە جوانترو بەهێزتر ئەكا» ـ هەنگاوێكی تر ...ل ١٥٧ ـ دەڵێم : بەش بە حاڵی بەڵگەی راستكردنەوەی یەكەم، بۆ چاركردنی كێشی لەنگی بەیتەكە ئەوەندە بەسە كە زمان لەسـەر (ل) ی (فیل) نەختێ گیر بكەین

تابیێتــە دوو برگـە، خۆ ئەگەر لە زمان گیركردن سەرووتر بچین و (٥ ـ فەتحە) بدەینە (ل) كە، ئەوا بەهۆی (لێی لابدە) ی دواوە لەوانەیە بیسەر وای لێ تێبگـا كە ضەمیری (لێی) دەگەرێتەوە بۆ (فیل) ، واتە: (فیلە، یامێشـولەیـە لێی لابـدەو خۆتی لێ بپارێـزە، كەچی راستی مەبەستی (حـاجی) ئەوەیـەبـڵێ : شێر هەرچـەند بەهێزو شەركەرو درندەیە، وەك مێرووله وایـە لەئـاست زوڵفی كەمەند ئاسای یار ناتوانێ لێی دەرچێ، (فیل) یش بەهەموو گەورەیی و گرانی خۆیەوە وەك مێشوولەی بچووك و سووكە، كە ئەمانە لەئاست زوڵفی یار ئاوابن، هەڵبەتە ـ (البتە) (عەنقا)ی باڵـنـدی ئەفسـانـەییش، مەگـەسـە . كەواتە (لابو دەكە) پڕ بە پێستی جێگاكەیەو (لێی لابدە) هەڵەیە.

لەبارەی (وێرانەبە)ی (ب ٧، ١١٤)ی:

**بوومی وێرانە بەرۆژو سەگی ئەو كۆیە بەشەو**

**هەردووكی خزمی یەكن (حاجی) بەبێ خزم و كەسە**

یشەوە كە لەتێكستەكەی شارەزاو میران دا (وێرانەیە) بووەو مامۆستا بە گوێرەی دەسنووسی یەكەم راستی كردۆتەوە، دەڵێم : بەڵێ ! (وێرانە بە) راستە، بەڵا ئەوە كە لە بەڵگەی راستكردنەوەكەدا گرتوویە : «ئەگەر وشەكە (وێرانەیە) بێ دیار نابێ كێ بەشـەو (بوومی وێرانە) و بە رۆژ (سەگی كۆ) واتە بەردەرگای یارە، بەڵام ئەگەر (وێرانەبە) بێ رووی دەم ئەكاتە كەسێك ...» هەنگاوێكی تر ... ل ١٥٨ ـ وانییە، چونكە لەم حاڵەیش دا رستەكە ئیخبـاری یەو ئینشائی وەك (وریابە و ئازابە) نییە تابڵێین رووی دەم كراوەتە كەسێك تەنیا مەبەستی (حاجی) ، نیشاندانی بێكەسیی خۆیەتی.

لەبارەی (كاهیدە میسلی بەرگی) ی (ب ٢، ل ١١٦)ی

**لەبەر نەوخێزی سەبزەی دەوری لێوت**

**تەنم كاهیدە میسلی بەرگی كایە**

یشـەوە كە لە تێكستـەكەی شارەزاو میران دا (كاهیدمیە تیمسالیكایە) بووەو، ماموستا بەگوێرەی دەسنووسی یەكەم و بەڵگەی (كاهیدە میسلی بەرگی كایـە) مەبەستی شاعیر بۆ دەربڕینی لاوازیی لەشی زۆرباشترو وردتر دەردەبڕێ تا (كاهیدمیە تیمسالیكایە) هەنگاوێكی تر ...ل ١٥٩ ـ گۆڕیـویـە، دەڵێم: (بەرگی كایە) كێ دبویەو بیستوویەو دەبێ چیبێ! تامـەبـەستی شاعیر بۆ دەربڕینی لاوازیی زۆر باشترو وردتر دەربڕێ نەخـێر ! هەر (كـاهیـدیە، تیمسالی كایە) كەی شارەزاو میران و گیویی موكریانی، راستە، واتە تەنم كە بەرچاو واپێ دەچێ هێزو قورسایی هەبێ وانییە، بەڵكو كاهید ـ لاوازو كڵۆڵەو وەك پەیكەری بە (كا) ئاخنراو سووك و بێ كێشە.

لەبارەی (عیشقە)ی (ب ٤، ل ١١٦)ی

**تەبیبم هاتە باڵینم وەهای گوت** :.

**دریغا دەردی عیشقە بێ دەوایە**

یشەوە کە لەتێکستەکەی شارەزاو میران دا (عیشقی) بووەو مامۆستا بە گوێرەی دەستنووسی یەکەم و بەڵگەی ئەوە کە: «ئەگەر (عیشقی)بێ مەعنای نیوە بەیتەکە وای لێ دێتەوە دەردی عیشق جۆری وایشی هەیە کە دەرمانی ببێ، لەکاتێکا کە لە جیهانی ئەدەبیاتدا عیشق بە دەردێکی بێ دەرمان ئەدرێتە قەڵەم و ئەڵێن تەنانەت پێگەیشتنی یاریش چاری ناکا» گۆڕیویە هەنگاوێکی تر ...ل ١٥٩ دەڵێم : هیچ مەرج نی یە (دەردی عیشقیبێ دەوا) مەعنای ئەوەبێ دەردی عیشق جۆرێکی دیکەی هەیە چاری دەکرێ ئەوەتا خەڵك دەڵێن (خوای تەوانا) کەچی کەس مەبەستی ئەوەنی یە بەم سیفەتە خوای ناتەوانا لەمەبەست دوورخاتەوە. چونکە لای خاوەن باوەران ، جگە لەخوا، خوایێکی دی، نەتەوانا نە ناتەوانا، نی یە، ئەم جۆرە سیفەتانە تەنیا بۆ دەرخستنی واقیعن ئەمە ئاواو، بەش بەحاڵی تێکستێکی راستیش دەڵێم : بەلای منەوە تێکستەکەی خوالێ خۆشبوو (گیویی موکریانی)، کە بەم جۆرە یە (دریغا ! دەردی عیشقێ بێ دەوایە) لە هەردوو تێکستە کانی مامۆستایان شارەزاو میران و، مامۆستا محمد ، جوانترە ، چونکە پزیشکی ژێر لەم حاڵەتانەدا یەکسەرو رووبەروو بەنەخۆش ناڵێ : نەخۆشییەکەت لە چارکردن نایە ، بەڵکوو بە شێوەیەکی ناراستەوخۆ رای دەگەیێنێ.

لە بارەی (خەمیدە) ی (پ ١،ل ١١٧) ی

**خەمیدە قامەتی داوی خەمی تۆم**

**ئەمەندەی راستە (حاجی) بێ ریایە**

یشەوە، کە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا (خەمیدەی) بووەو مامۆستا بەگوێرەی دەستنووسی یەکەم و بە بەڵگەی ئەوە کە «شاعیر ئەیەوێ بڵێ من بالا چەماوەی تاڵی لوول و چەماوەی زوڵفی تۆم نەك بەهۆی بالای تاڵی زوڵفی لول و چەماوەی تۆوە چەماومەتەوە چونکە ئەوە هیچ مەعنایەك نادا بەدەستەوە» هەنگاوێکی تر ...ل ١٦١ گۆڕیویە ، دەڵێم رای مامۆستا، مادەم دەستنووسەکان (قامەتی) یان نووسیبێ ، تەواوە ، بەلام کە مامۆستایان شارەزاو میرانیش، هەڵبەت لەرووی دەستنووسێکەوە (خەمیدەی) یان راگوێزاوەتەوە، دەبێ بەرلەوەی بڕیاری هەڵەیی (ی) کەی بدەین ، کە بەگوێرەی رێنووسی کۆنیش دەنووسرێ، ئاورێك لە راستی و هەڵەیی (قامەتی) بدەینەوە، کەبە رێنووسی کۆن (قامت) دەنووسرا، دیارە ئەم (٤) پیتەیش هەر وەك بۆ (قامەتی) دەشێ بۆ (قامەت و) یش دەس دەدا، چونکە (و) ی عەتف کەم دەنووسرا جا من وای بەراست دەزانم (قامەتی) هەڵەبێ و، راستییەکەی بەم جۆرە بووبێ : (خەمیدەی قامەت و داوی خەمی تۆم) واتە : من بالا چەماوەی بالای بەرزو راست و زوڵفی لوولی تۆم) دیارە بەگوێرەی ئەم خوێندنەوەیەی من بەیتەکە پر مەعناترو هۆیەکانی بالا چەمانەوە زیاتر دەبن تا (هۆ) یش زۆر بێ، (هۆکار) زۆرتر دەبێ.

لەبارەی (لەشەو رۆژ)ی (ب ٢، ل ١٢٠)ی

**ئەسپی رەش و سپی بەگرەو، غاردەدەن بەتاو**

**وەك رۆژو شەو، دیارە لەشەو رۆژ دەباتە**

یشەوە کە لەتێکستەکەی شارەزاو میران دا (رۆژلە شەو) بووەو مامۆستا بەگوێرەی دەستنووسەکانی دووەم و سێیەم و بەبەڵگەی «راگرتنی سەنگی نیوە بەیتەکە کە ئەگەر (رۆژ لە شەو) بێ لەنگ ئەبێ» گۆڕیویە، دەڵێم : بەرای من هەر (رۆژ لە شەو)ە

کەی شارەزاو میران رەوانترو پەسندترەو کوردانە تریشە، کورد لە گفتوگۆیان دا (فاعیل) پێش هەموو شتێکی تر دەخەن . بۆ سەنگ لەنگی نیوە بەیتەکەیش دیارە پاش و پێش پێکردنی وشەکان شتێکی وا لە کێشی نیوە بەیتەکە ناگۆڕن، تابەشێوەیێك لەنگ و بە یەکێکی دی لەنگەری تەواو بێ .

لەبارەی (مێرغوزار)ی (ب ٤، ل ١٢٠)ی

**نەرگس لە مێرغوزار دەزانی بەچی دەچی**

**بنوارە ئاسمان لەشەوا عەینیهی ئەوە**

یشەوە کە لەتێکستەکەی شارەزاو میران دا (مێرغوزارا) بووەو ماموستا بەگوێرەی هەرسێ دەستنووسەکانی یەکەم و دووەم و سێیەم گۆڕیویەو، بۆ بەڵگەی راستکردنەوەیش نووسیویە: «بەڵگە شك نابەم چونکە ئەم جۆرە زەرفانە بە (١) و (دا) ی نیشانەی زەرفایەتی و بێ ئەوانیشەوە ئەبینرێن لام وایە بەڵگەم هەر پشت بەستن بووە بەیەککەوتنی هەرسێ دەستنووسەکە لە نەبوونی ئەو ئەلفەدا بەلام ئێستا لام وایە راستتر ئەوەبوو دەستم لێ نەدایە لەبەر ئەوە کە بوونی (١) لەم شوێنانەدا زۆرترە لە نەبوونی و، کەمێکیش نیوە بەیتەکە بە نەبوونی لەنگ ئەبێ ، هەر چەند لە حاڵی بوونیشیا ئەبێ زۆر بە کورتی دەرببڕرێ . دووریش نی یە راستەکەی (مێرغوزاری) بووبێ، واتە مێرغوزاری نەرگس» ـ هەنگاوێکی تر ... ل ١٦٦ـ٠

منیش دەڵێم : کەنیوە بەیتەکەبە نەبوونی (١) کەمێك لەنگ ببێو، لە حاڵی بوونیشی دا دەبێ بەکورتی دەربببڕدرێ ، واپێ دەچێ لە ئەوەڵەوە (میرغوزاری) بووبێ، کە دیالێکتی ناوچەی کۆییەو نووسەرەوە لەکاتی نووسینەوە (ی)کەی لە بیرچووبێ.

بۆ ئەوەیش کە نووسیویە: « دووریش نی یە راستەکەی (میرغوزاری) بووبێ، واتە مێرغوزاری نەرگس » ، دەڵێم : مێرغوزار واتە چیمەن و سەوزایی جا ئەگەر شوێنەکە گوڵی زۆرتر بوو گوڵزار دەگوترێ و ئەگەر نەگسیشی زورتر بوو نەگسەجار دەگوترێ تەشبیهەکەیش ئەوە دەگەیێنێ کە (حاجی) لە مێرغوزار) مەبەستی شوێنێکە گیاو نەرگسی لێ روابێ ،

بەڵام نێرگـزی ئەوەنـدە زۆر نەبێ زاڵ ببێ بەسـەر گیایەکەدا ، چونکە (حـاجی) شینـایـەتی و سەوزایـەتی مێرگـەکەی لە ئاسمان چواندوەو نێرگزەکانیشی لە ئەستێرە.

بۆیە (مێرغوزاری) نەرگس، کە دەکاتە نەرگسەجار ، دوورەو ڕێی تێ ناچێ.

لە بارەی بەیتی ٦، ل ١٢٠ی

**میسلی شەراری کاغەزە سووتاوە عومرمان**

**ڕۆمی کەدەفع بوو گرێی دڵ دەفع دەبێتەوە**

یشەوە نووسیویە :« ئەم بەیتە لە تێکستەکەی شارەزاو میراندا چۆن بوو هەر وام هێشتەوە، لەگەڵ ئەوەیش کە نیوەی دووەمی لەهەر سێ دەسنووسی یەکـەم و دووەم و سێهـەمدا بە جۆرێکی ترە، ئەم نیوەی ئێستایەیش هەرچی لەگەڵ بکەی لەنگە» ـ هەنگاوێکی تر ...ل ١٦٧ ـ.

جا بۆ چارەکردنی لەنگی‌یەکە دەڵێم : دەکرێ نیوە بەیتی دووەم بەم جۆرە بخوێنینەوە : «ڕۆمی کە دەفع بوو گرێ دڵ دەفع دەبێتەوە) دیارە (گر)یش لەگەڵ (شەرار) و (سوتاو) دەگونجێ نەك (گرێ).

لە بارەی (کوهنە)ی (ب ٤، ل ١٢٨)ی.

**ددان و مووی سەری وەك کوهنە پیران**

**نیشانەی داوەشان هەڵوەرانە**

یشـەوە کە لەتێکستـەکـەی شارزاو میران دا (کـۆنـە) بووەو وەمامۆستا بەگـوێـرەی دەسنووسی یەکەم و بەبەڵگەی «ڕێبازی شیعری کلاسیکی عەرووزیی کو بدی»کردوەتیە (کوهنە) دەڵێم : نازانم بۆ تەلەففوز کردن بەم (ە) یی (کوهـ ،) ئەوەندە قورسە! لەو بڕوایەدا نیم کەسێك هەبێ بڵێ لە تەلەففـوز کردنی‌دا پشـووسـوارو هیـلاك نابم دیـارە یەك لە مەرجـە سەرەکیەکانی فەصاحەتی هەر شاعیرێکیش بەکار نەهێنانی پیت ووشەی ناهەموارو قورس لە ڕووی تەلەففوزەوەیە بۆیە من (کەونە)ی دیالێکتی کۆیێ وڵاتی حاجی پەسنـد دەکـەم ئەمـەو، بە پێـویستی دەزانم، کە ئیشـارەت بۆ ئەوەیش بکەم کە مامۆستا لە زۆر جێگای چاپی چوارەمی (دیـوانی حاجی)دا بەبەڵگەی دیالێکتی کۆیێی وڵاتی حاجی (کۆن) ی کردوتـە (کـەون) ئەوەیش کارێکی چاك و پەسندە، بەڵام کە (کەون) و (کۆن) بە ڕێنووسی کۆن هەر بە (کون) نووسرابن و لەڕووی کێشەوەیش هاوکێش بن، دەبـوو لە سەرلەبەری دیوانەکەدا (کەون) پەسند کرابا ، تەنیا لەو حاڵانەدا نەبێ کە (کۆن) بۆ سەروا ڕێکتر بێ.

لەبارەی (درونێنەیەو)ی (ب ٦ ، ل ١٢٨)ی

**بەسەر چوو خەتتی سەبزی، مژدە ئەی دڵ**

**دەمی درونێنەیەو خەرمان و دانە**

یشەوە کە لەتێکستەکەی شارەزاو میران دا (درونێنەوو) بووەو مامۆستا بە گوێـرەی دەسنووسی یەکەم و بەڵگەی ئەوە کە «زۆرکردنی خەبەرەکانی موبتـەدا جوانتـرە لە ئیشبـاعی واوی عەتفی (درونێـەو) کردنی بە (درونینەوو) گۆڕیویە، دەڵێم : مامۆستا (داوەشانەو)ی تێکستی شارەزاو میرانی بەیتی چوارەمی هەر ئەم پارچـە شیعـرەی کردوتە داوەشان و) بەبەڵگەی ئەوەکە «بەپێی گراماتیکای زمانی کوردی لە حاڵی عەطفدا کە ئەگـەر ضەمـیرێ بوو بگـەڕێتـەوە بۆسەر مەرجەع، بەدوا مەعطووفەوە ئەنـووسێ و بەتـەنهـا ئەو ضەمـیرەیش بەسـە بۆ بەستنـەوەی تێکڕای مەعـطووفـەکـان بە مەرجـەعەکەوە» ـ هەنگاوێکی تر ... ل ١٨٠ ـ جا بەگوێرەی ئەم بەڵگەیە دەبوو ماموستا (درونێنەوو)ی شارەزاو میرانی وەك خۆی بهیلابایە لە بارەی (نوونی)ی (ب ٨، ل ١٢٨)ی .

**لەبەینی زوڵف خاڵ و نوونی ئەبرۆ**

**بە ئەلفی قامەتی جانی جیهانە**

یەشەوەکە لە تێکستەکەی شارەزاو میراندا (موویی) بووە (ماموستا بە گوبرەی دەسنووسی یەکەم و بە بەلگەی ئەوە کە «لە نیوە بەیتی دووەما باڵای یار شوبهێنـراوە بە (ئـەلف)، دیـارە لە نیـوەی یەکەمیشا بڕۆی چەماوەی شوبهێنراوە بە (نوون). سەرەڕای ئەوە کە (موویی ئەبرۆ) لەم شوێنەدا تەعبیرێکی زۆر ناشیرین و ناشاعیرانەیەو هیچ مەعنایشی نی‌یە» گۆڕیـویە، دەڵێم : (حاجی) دەیەوێ لە دەم و چاوی یار وشەی (جان) وەدەس بێنێ و هاتـووە زولفی لوول خواردووی یاری لەگەڵ خاڵی سەر گۆنای لە (ج) و، ئەبرۆی لە پیتی (ن) چواندووە و ئنجا هاتووە لە نێوان (ج) و (ن) دا (١) باڵای بەرزی یاری داناوەو (جان ـ گیان) ی بە بەر جیهان دا کردووە لێرەدا خەریکە بڵێم (حاجی) لە (نالی) وەستاترو دەس ڕەنگین تر بووە، چونکە ئەم لە :

**لەبت میم و قەدت ئەلف و زوڵف چیم**

**دەزانیی بەم سییانە تالیبی چیم!**

ئەرکی دیار کردنی نوقتەکانی (چ) وەئەستۆ نەگرتووە، کەچی (حاجی) وەستایانە (خاڵ) کردوتە نوقتەی (ج) ، لەوانەیە نوقتەی (ن) ڕەشێنەی چاو یاهەر (خاڵ) بەڵام بە ڕێگای تەنازوع بێ جا لە ئەنجامی ورد بوونەوە لە بەیتەکە گەیشتمە ئەو قەناعەتە کە هەر (موویی ئەبرۆ) کەی شارەزاو میران جوانترە ، چونکە حاجی کە ناوی (ج) نەبردووە واباشە ناوی (ن) یش ڕاستـەو خۆ نەبات و بۆ زیرەکی خوێنەر جێ بێڵێ و بەتایبەت کە لە نیوەی دووەما بە (جان)ی جیهان ڕێگای دۆزینەوەیانی بۆ ئاسان و ساناکردووە.

لەبارەی (وادەزانم)ی (ب٦، ل ١٣٢)ی

**ئەی سەبا یارم ئەگەر پرسی لە حاڵم پێی بڵێ:**

**مابوو تا ئەو وەقتە هاتم وادەزانم مردووە**

یشـەوە کەلە تێکسـتـەکەی شارەزاو میران دا (وابزانم) بووەو مامۆستا بەگوێرەی دەسنووسی یەکەم و بەڵگەی ئەوە کە «حاجی قادر مەبەستی

کەیشـی مەی و نەرمحەتیی خۆیەتی. لەبەر ئەوە گەیاندنی هەواڵی مەرگی تاڵە چەرد و ... ـیەوە نزیکتر بێ زیاتر بۆ ئەم شوێنە دەس ئەدا، گۆڕیویە، دەڵێم (وادەزانم) ئەم شوێنانەدا بلاو نییەو، نامۆیە، کەچی (وابزانم) باوە بۆ ئەم شوێنانەیش هەر ئەم دەس دەدا.

لەبارەی (تەققەی)ی (ب٣ ، ل ١٣٤)ی

**لە بەرقی رەنگی شەرواڵی حەیا دامێنی هەناڵی**

**لە تەققەی دەنگی خلخاڵی لە کەردوون زوهرە داماوە**

یشەوە کە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا (شەققەی) بووە و مامۆستا بەگوێرەی هەرسێ دەستنووسەکەو بەڵگەی «بازنی دەس کە ئەدەن لەیەك تەقـەیان لێ دێ، شەقەیان لێ نایەت» گۆڕیویە، دەڵێم : راستکردنەوەکە نەواوەو لە جێیە ، بەڵام حاجی کەی باسی بازنی دەستی کردووە؟! حاجی لەم بەیتـەو بەیتی دوای هەر بەدەوری (شەرواڵ) و (دامێن) و (ناڵ) و (پانی بەرز) دا هاتووە ئەمەو، بازنی دوو دەست کەم دەدەن لەیەك، بەڵکوو خلخاڵ کە دوو حەلقەی ئەستووری زێر یا زیون ئافرەتی کورد بۆ جوانی ئەیکاتە پێی ، لە کاتی رۆیشتندا دەدەن لەیەك و تەقەیان لێدێ،

لەبارەی مەعنای (ب٤، ل ١٤٠)ی

**سالیکی ریخە ئەگەر شێخە ئەگەر مێخە، لەوێ**

**شێخە هەر کامێ نەدا تا دەمرێ هەر دەدەیە**

یشەوە کە نووسیویە: «لە وڵاتی رۆم ئەوی شوێن شتی پیس کەوتبێ و پیس و پۆخڵ بێ، شێخ بێ و مێخ بێ بە شیخی دائەنین و، ئەوی نەیداتێ و پێی نەبەخشێ تا ئەمرێ بەشێتی لە قەڵەم ئەدەن» ـ هەنگاوێکی تر ...ل ١٩٩ ـ دەڵێم : وەك دیارە لە بەیتەکەدا.

باسی شێت نەکراوە! (حاجی) وەك من تێی گەیشتووم ، دەیەوێ بڵێ: لە وڵاتی (رۆم، هەمووی، بە شێخ و ناشێخیەوە، هەتیوو هەتیوبازەو سالیکی ریخە، واتە رێگای ریخ دەکوتێ، لەوێ ئەگەر کەسێ دەس کەوی (... نەدا) ئەوە شێخەو بەشێخی دەزانن ، چونکە زۆر کەمە یەکێ لەوێ دەس کەوێ نەدا، بەڵکوو تا دەمرێ هەر (دەدە) یە.

لەبارەی (دین و دەولەت) ی (ب ٧، ل ١٤٧)ی:

**کە نەفعێکت نەبێ بۆ دین و دەولەت**

**بە من چی (نەقشە بەند)ی یانە (مانی)**

یشەوە کە نووسیویە : «لە تێکستەکەی شارەزاو میراندا: «نەبوو بۆ موڵك و میللەت».

راستکـردنـەوە: بەگوێرەی دەستنووسی دووەم بەڵگەی راستی: زۆرتریی مەعنـای بەیتـەکـە بە گوێرەی ئەم تێکستە هەڵبژاردەیەی ئێمە لە چاو تێکستـەکـەی شارەزاو میرانـدا چونکە (دین) و (دەولەت هەردوو دنیا ئەگرنەوە، بەڵام (موڵك) و (میللەت) هەر یەك دنیا ئەگرنەوە» ـ هەنگاوێکی تر ...ل ٢٠٥ ـ دەڵێم چونکە کورد (دەوڵەت) ی بە مەعنا رامیاری یەکەی نەبووەو، نایشبێ مەبەستی دەوڵەتی رۆم بووبێ، بۆیە من هەر (موڵك و میللەت) مەکەی شارەزاو میران بە باشتر دەزانم .

لە بارەی (دووە) ی (ب١ ، ل ١٥٦)ی

**مەتنی کوتوبی ئەم دووە با شەرحی کرابێ**

**ئیشکالی رەموززی مەسەلەی قازیی مابێ**

یشـەوە کە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا (دەرە) بووەو مامۆستا بە گوێرەی دەستنووسی یەکەم و دووەم بە بەڵگەی ئەوە کە «ئەم (دووە) واتە ئەم دووکەسە کە مەبەست لێیان قازیی شوێنێك و ئافرەتێکی (مروەت) ناوە، کە حاجی قادر ئەم پارچە شیعرەی بۆ لێدوانی روو داوێکی نێوان ئەو دوانـە دانـاوە . هەرچی (دەرە) یە هیچ مەعنایەکی دیار نابەخشێ» گۆڕیویە، دەڵێم: هەر (دەرە) کەی شارەزاو میران باشترە بۆ مەعناکەیش دیارە کە حاجی مەعنای (دەر)ی مورادیفی (باب) ی مەبەست بووە کەلە زووەوە کتیب دابەش کراوە بۆ (کیتاب) و (باب) و (فەصل) بە تایبەتی کتێبەکانی (فیقە) کە قازییەکان دەبێ تێیان دا بسپۆربن . مەعنای بەیتەکە ئاوای لێ دێتەوە: بەڵێ هەر چەند شتی ئەم (دەرە) واتە (باب)ی یا بابەتی بە یەککەیشتنی پیاو و ژنێك بە رێگایێکی ناشەرعی زۆر شەرحی کراوە، ئەمە مانای ئەوە نییە ئیشکال و رەموززی ئەم دەرە پێویستی بە شیکردنەوە نەماوە ئەوەتا ئەم مەسئەلەیەی:

**خۆت حاکمی ئەم مەسئەلەیە کەی دەبێ وابێ**

**پیری وەکو تۆ «ماە» ی هەبێ و ماکەری گابێ**

**پەردەی سەر سامی لە روو لا نەدراوە.**

لە بارەی (بەیتی ٥، ل ١٥٦)ی:

**(حاجی) دەڵێ ئەم میسرەعە تەئریخییە قازی**

**«إنصاف نیە، عاری چیە، مروەتی گابێ»**

یشەوە دەڵێم : ئیوە بەیتی دووەم بە شێوە نووسینی سەروو، وەك مامۆستا خۆیشی نووسیـویـە «وا ئەگەیەنێ لە ١٢٨٥ی هیجریدا و تووبەتی کە ئەکاتە ١٨٦٨ ـ ١٨٦٩ ی میلادی» بەڵام من بەسەر لابەرگێکی (کەمالی صەرف) لای کاك مەلا موصلیحی مەلا عوسمانی زێوە ئەم نیوە بەیتەم بەم جۆرە بینیوە:

**إنصاف نیە عاری چیە مروّت گابێ)**

بەم جۆرە مێژووی دانانی شیعرەکە یا رووداوەکە دەکەوێتە بەر ساڵی (١٢٧٥) ی هـ بەرانبەر بە (١٨٥٨ ـ ١٨٥٩)ی زاینی.

لەبارەی (وێرانن) ی (ب ٢، ل ١٧١)ی:

**لە نەشئەی دیدەیی مەستی هەموو مەیخانە وێرانن**

**هەموو کەس بەستە زوننارە لە سەودای زوڵفی تاتاری**

یشـەوە کە لە تێکستـەکەی شارەزاو میران دا (وێرانە) بووەو بە گوێرە دەستنووسەکانی یەکەم و سێیەم وبە بەڵگەی ئەوە کە «(هەموو مەیخانە)

مەعنـای جەمع ئەگەیەنێ و (وێرانن)ی لەگەڵ ئەگونجێ نەك (وێرانە)» مامۆستا کردوویەتی بە (وێرانن) ، دەڵێم : لەوانەیە مەبەست لە (هەموو مەیخـانـە) سەرتـاپـای مەیخـانـە بێ، ئەو کاتـە (وێـرانە) ڕێك و پڕ بەپێستی‌یەتی. ئەمەو، ئەگەر (هەموو مەیخانە وێرانن) بێ دەبێ (هەموو کەس بەستە زووننارە) یش بکرێتە (... بەستە زوننارن).
لە بارەی (شوعاع و شەعشەعە میهری، ئەشیعەعو میشعەلی) ی (ب ٦، ل ١٧١)ی:

**شوعاع و شەعشەی میهری، ئەشیعەعو میشعەلی بەدری**
**لە سایەی پرتەوی رووتە بە قوربان نووری یا ناری**

یشەوە کە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا (ئەشیعەعەی میهری گەردوون و شوعـاع و شەعشەی) بووەو مامۆستا بە گوێرەی دەسنووسی سێیەم گۆڕیویەو نووسیویە.

«بەش بە جاڵی نیوە بەیتی یەکەم لە ڕاستیدا جگە لە متمانە کردنی زیاتر بە دەسنووسێکی کۆن تا بە دەسنووسێکی تازە بە تایبەتی کە دەسنووسە تازەکە هەڵەی زۆریشی تیابێ، شتێکی ئەوتۆم بەدەستەوە نی‌یە دەسنووسە هەڵاوێـردەکـەی خۆمانی لە تێکستەکەی شارەزاو میران پێ بە باشترو ڕاستتر بزانم» ، دەڵێم: ڕاستە متمانە کردن بە دەسنووسی کۆن زیاترە تا هی نوێ، بەڵام ، لەم نیـوە بەیتـەدا، تێکستـەکەی شارەزاو میران، کە هەڵبەت لە ڕووی دەسنووسێکی کۆن نووسراوەتەوە، پەسندترو ڕاستترە، بە گوێرەی تێکستی هەڵبژاردەی مامۆستا مەرجەعی دوو ڕاناوی دوای (میهر) و (بەدر) دیارنین، کەچی لە تێکستە شارەزاو میران دا (ی) دوای (میهـر) بۆ ئیـزافـەیـەو هی دوای (بـەدر) یش ڕاناوەو دەگەڕێتەوە بۆ (گـەردوون). ئەمـەو، مامـۆستا باسی تێکستی دەسنووسی یەکەمی لای خۆی، کە ئەم پارچە شیعرە لەوێشدا هەیە، نەکردووە.
لە بارەی (کاسەك) ی (ب ١، ل ١٨٨)ی:

**صوفی وەك تینشنە بوو لە زیکری هەتاو**
**صەد نوێژی دەدا بە کاسەك ئاو**

یشەوە کە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا (کاسەیێ) بووەو مامۆستا بە گوێـرەی دەسنـووسـەکـانی یەکەم و دووەم (ب) و بە بەڵگەی ئەوە کە «(کاسەك) دیالێکتی ناوچەی کۆیەیە نەك (کاسەیێ)» گۆڕیویە، دەڵێم: دەبـوو بۆ زیاتر نزیك بوونە لە دیالێکتی ناوچەکەو بۆ ڕاست کردنەوەی کێشی بەیتەکە (کاسەکی) بنووسرابایە.
لە بارەی (بەیتی)ی (ب ٤، ل ١٨٩)ی:

**یا وەکوو بەیتی شیرن و فەرهاد**
**شیعری حاجی لە بەرکرایە بەیاد**

یشەوە کە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا (ئولثی) بووەو مامۆستا بە گوێرەی دەسنووسی یەکەم و بەڵگەی ئەوە کە «بەشیعری باسی (شیرین و فەرهاد) نەوتراوە (ئولث) و لە فۆلکۆری میللی کوردا بە (بەیت) ناوو بانگی ڕۆیشتـووە» گۆڕیویە، دەڵێم : (حاجی) یش نایەوێ بە باسی شیرین و فەرهـاد بڵێ (ئـولث) بەڵکوو دەیەوێ بڵێ : هەر وەکوو شیرین و فەرهاد لەبەردەکەن ئەگەر وەك ئولثێکی شیرین فەرهاد بەیتی (حاجی)تان لەبەر بکردایە ئێستا دەبوونە صاحیبی جاه بۆیە (ئولثی) باشترو پەسندترە لە بارەی (نێو) ی (ب١، ل ٢٠٧)ی:

**ئەو زەمانی بوونە ئاردی نێو درك**
**پارمیەك ناكا دوو صەد جار بێتە رك**

یشـەوە کە لە تێکستـەکەی شارەزاو میران دا (ناو) بووە و مامۆستا بە گوێرەی دەسنووسی یەکەم و بە بەڵگەی ئەوە کە «(نێو) لە (ناو) باوترە لە دیـالێکتی ناوچەی کۆیەی نیشتمانی حاجی قادردا) گۆڕیویە، دەڵێم : (ناو) دیالێکتی کۆیێ‌یە، خەڵکەکە کەمێکی زۆر کەمی خوێندەواران نەبێ (نێو) بەکار ناهێنن لەوانەیە حاجی ئەگەر (نێو)ی بەکارهێنابێ، وەك زۆر وشەی دیکەی ناوچەی موکریان ، لە ئەنجامی مانەوەی بۆ چەند ساڵێك ، لەو ناوچەیە بووبێ.
لەبارەی (سەییدی قەوم و شێخی) ی (ب ٢، ل ٢١٣)ی:

**یەك بە یەك حافیظی شەریعەت بوون**
**سەییدی قەوم و شێخی میللەت بوون**

یشەوە کە لە تێکستەکەی شارەزاو میران د (سەییدو شێخی قەوم و..) بووەو مامـۆستـا بە گوێـرەی دەسنووسی دووەم و بەڵگەی ئەوە تایبێتە ئیشـارەت بۆ وتـەی (سید القوم خادمهم) و بۆ زاراوەی (شیخ الملة) گۆڕیـویە ، دەڵێم: یەك لە بنەماکانی ڕەوانبێژی و جوانکاری گوزارەیی شیعری کلاسیکی (لەفف و نەشری مورەتتەب - پێچەو پەحشە)یە. جا بۆ ودەس هێنانی ئەم جوانکاری‌یە تێکستەکەی شارەزاو میران پەسندترەو بە گوێرەی ئەو تێکستەیەیش ئیشارەت کردن بۆوتەو زاراوەکە لە دەس ناچێ.
لە بارەی (شاعیرێکە) ی (ب٨، ل ٢١٩)ی:

**یەکی تریان (ئەمین بەگی) دزەیی**
**دزنی‌یە شاعیرێکە جەربەزەیی**

یشەوە کە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا (شاعیرێکی) بووەو مامۆستا بە گوێـرەی دەسنـووسی دووەم و بەڵگەی ئەوە کە «ئەگەر (شاعیریکی) بوایـە، ئەبـوو (جـەربەزەیە)یش بووایە تا ڕستەکە تەواوبێ» گۆڕیویە، دەڵێـم: ڕێـی تێ دەچێ (شـاعـیرێکی)ش ڕاست بێ و (٥) ی دوای (جەربەزەیی) بۆ زەروورەت لابرابێ ، هەر وەکوو لە (لەبەر ئەم ناتەبایی و کینە جۆیی) کە دەبوو (جۆیی‌یە) بوایە، لابراوە.
لە بارەی ئەوەیش کە نووسیویە : «ئێستا لام وایە هەڵەکە لە (شاعیرێکی) دا نی‌یەو (شاعیرێکی) ڕاستە، بەڵکو لە (دزەیی) و (جەربەزەیی) دایەو

ڕاستەکەیان (دزەیە) و (جەربەزەیە)یە» بەلگەیشی ئەوەیە کە ئەگەر وانەبێ «کەس گومانی بۆ ئەوە ناچێ کە ئەم شاعیرە دزبووە، تا ئەویش بلێ: «(دزنییە)» دەڵێم : هەر (دزەیی) و (جەربەزەیی) ڕاستن ، لەبەر ئەم هۆیانە یەکەم: (دزەیی) کەناوی هۆزێکی کوردی نیشتەجێی باشووری ڕۆژئاوای هەولێرەو، وشەیەکی سەرەکییە بۆ ناسینی شاعیرو نابێ یاری لەگەڵ دا بکرێ دووەم : ڕاستە نووسینی کۆن مەیدانی هەڵە ئەدات، بەڵام (دزەیی) و (جەربەزەیی) کە دوو وشەی سەروای بەیتن ، ڕێی هەڵە تێکەوتنیان دوورە.

لەبارەی (موتعە)ی (ب٧، ل ٢٢٧)ی:

**یانە ئێرانییەك کە مەعلوومە**

**دایکی موتعە، باوکی مەوهوومە**

یشەوە کە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا (موتعەیە) بووەو مامۆستا بە گوێرەی گۆڤاری (دیاری کوردستان) و بە بەڵگەی ئەوە کە «ئەگەر (موتعەیە) بێ نیوە بەیتەکە لەنگ ئەبێ، مەگەر (موتعەیە) بە (موتعایە) بخوێنینەوە بەپێی ئەم تێکستە هەڵبژاردەیەی ئێمە تەنها خستنی سووکە ژێرە (کەسرە) یەك ئەسەر (ی)ی یەکەمی (دایکی) نیوە بەیتەکە ڕاست ئەکاتەوە» گۆڕیویە، دەڵێم : جا خوێنەر بەچی بزانێ وشەی دوای وشەی سەرەتای میسرەع لەنگە تا لە وشەی سەرەتادا کە لێرەدا (دایکی) یە سووکە بزوێن بخاتە سەر (ی) ی یەکەم لەوانەیە زۆربەی خوێنەران، بۆ چارکردنی لەنگی یەکە، ئیشباع بە (و) ی (موتعە) بدەن، بۆیێکە من (موتعەیە) بە باشتر دەزانم.

لە بارەی (کەوتە)ی (ب ٢ ل ٢٣٠)ی

**لە بیعاری هەموویان کەوتە یادم**

**ڕوموزی ئیتتیفاق و ئیتتیحادم**

یشەوە کە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا (کەوتنە) بووەو مامۆستا بە گوێرەی دەسنووسی یەکەم و (ڕۆژی کورد) و (تێگەیشتنی ڕاستی) و بە بەڵگەی ئەوە کە «ئەوەی کەوتۆتە یادی حاجی، شەخسی عاقل نییە تاسەرنج دانی موفرەدو جەمعی تیا پێویست بێ و تێکرایش شەخسی ناعاقل ضەمیری موفرەدی بۆ ئەگەڕێتەوە کەواتە (کەوتە) یەو (کەوتنە) نییە» گۆڕیویە ، دەڵێم: مامۆستا لە لاپەڕە (٢٤٠)ی کتێبەکەیدا، لەبارەی (هەموو مەیخانە وێرانن)، کە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا (وێرانە) بووە ، نووسیویە: (هەموومەیخانە) مەعنای جەمع ئەگەیەنێ و (وێرانن) ی لەگەڵ ئەگونجێ نەك (وێرانە)».

ناشێ، خوا نەخواستە، شوێنێ تیا لەدەس دانی هۆش، هۆشدار بێ !! ئەمەو، من دوای بۆ دەچم لە ئەوەلەوە (کەتنە یادی) دیالێکتی ناوچەی کۆیێ بووبێ‌و، بەهەر هۆیێك بووبێتە (کەوتنە) و (کەوتە)

لە بارەی (بەیتی ٤ ، ل ٢٣٣)ی :

**لە بۆتان تا بەبان و سەرحەدی ڕەی**

**لە ئەولاتر وەها نۆش بێتە سەر دەی**

یشەوە کە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا بەم جۆرە بووە:

**لە مەولا پاکتان با بێنە سەر وەی**

**لە (بۆتان) تا (بەیات) و سەرحەدی (ڕەی)**

مامۆستا بە گوێرەی ڕۆژنامەی (تێگەیشتنی ڕاستی) گۆڕیویەو بە ئەمانەتەوەیش نووسیویە : لەڕاستیدا لە ڕووی مەعناو داڕشتنەوە شتێك شك نابەم تێکستە هەڵبژاردەکەی خۆمی پێ بەباشتر بزانم لە تێکستەکەی شارەزاو میران» دەڵێم:

(دەبا نۆش بێتە سەر دەی) لەکاتێك دەگوترێ کە کارەساتێك بەسەر نەچووبێ، کارەساتێکی گەورەتر ڕووبدات دیارە مەبەستی (حاجی)ش چەند گەورە و پیرۆزە، کەواتە دەقەکەی شارەزاو میران ڕاست و گونجاوترە لەبارەی ئەوەیش کە دەڵێ : «بەرانبەرکێ پێکردنی (بۆتان) و (بەبان) بەجێ ترە لە بەرانبەرکێ پێکردنی (بۆتان) و (بەیات)» دەڵێم: حاجی دەیەوێ هەموو کوردستان بەیەکەوەببەستێ ، لەبەر ئەوەیش (بەیات) وڵاتەکە فراوانتر دەکا، لە (بەبان) پەسندترە.

لەبارەی (ببینە یەك لە تەعلیمو) ی (ب ٥، ل ٢٣٣)ی:

**ببینە یەك لەتەعلیم و لە نووسین**

**جل و بەرگ و زوبان و ڕەسم و ئایین**

یشەوە کە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا (هەمووتان ببنە یەك دەستوورو) بووەو مامۆستا بەگوێرەی گۆڤاری (ڕۆژی کورد) و بەبەڵگەی «گونجانی زیاتری لەگەڵ ڕەوتی بەیتی پێشووی» گۆڕیویە، دەڵێم : لە بەیتی پێشووتر (ببنە ئەحباب) و (وەکوو شەخسێکی واحید بن لە هەربابٍ) هاتوون جا ئەگەر ڕەوتی بەیتی پێشوو یا پێشووتر لەبەر چاو بگرین دەبێ (هەمووتان ببنە یەك دەستوورو) ی شارەزاو میران پەسند بکەین.

لەبارەی (یەکێکی بێتە)ی (ب ٤، ل ٢٣٧)ی:

**بۆ ئەمیرانی غەیرە دەبنە گزیر**

**نەك لە خۆیان یەکێکی بێتە ئەمیر**

یشەوە کە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا (یەکێ ببتە) بووە و مامۆستا بە گوێرەی دەسنووسی یەکەم کە تێکستەکەی ئەو

«لەدیالێکتی ناوچەی کۆیەی نیشتمانی حاجی یەوە نزیکترە تا تێکستەکەی شارەزاو میران و، زیاد لەومیش تێکستەکەی ئەوان نیوە بەیتەکە لەنگ ئەکا» گۆڕیویە، دەڵێم: ئەم تێکستە هەڵبژاردەیەی مامۆستایش هەرچەند کێشەکەی تەواوە، بەلاّم بەهۆی (ی)ی کۆتایی (یەکێکی) کە دەبوو (یان) ی راناوی کۆ بوایە، ئەویش کێش رێی نادا و، بەهۆی ئەوەی کە بێتە) ، لەوانەیە خوێنەر بەهەڵەی ئەوەدا ببا، کە لە چاوگی (هاتن)ە نەك (بوون)، ناریك و نالەبارە من بۆ ئەوە دەچم لە ئەوەلەوە (یەکێك) یا (یەکەك ببیتە)ی دیالێکتی وڵاتی کۆیێ بوویێ.

لەبارەی (فەخرەکەی)ی (ب ٥، ل ٢٤١)ی:

**بوونە ئوستادی فارسی و تازی**
**تا گەیشتن بە فەخرەکەی رازی**

یشـەوە، دەڵێم: ئەم (کـەی) یەی (فـەخـرەکـەی) جگـە لە پرکـردنـەوەی کەلێنی (کوو)ە لادراوەکەی (تاکوو)ی شارەزاو میران، چ سودێکی دیکـەی نییە، بۆیە من (تاکو گەیشتن بە فەخری رازی) خوالێ خۆشبوو (گێویی موکریانی)م لاپەسندترە.

لەبارەی (دانا)ی (ب ٧، ل ٢٤٣)ی:

**عیباراتی (دەری) و (تازی)م نەهێنا**
**دەزانێ ماڵی خۆمە مەردی دانا**

یشەوە، دەڵێم: (بێ‌تا)کەی تێکستی شارەزاو میران لەئەوەلەوە (ببینا) بووەو بەهەڵە خوێندراوەتەوە دیارە ئەمەیش بۆ سەرەوای بەیتەکە گونجاوترە، بەتایبەتی ئەگەر (نەهێنا) یش بکەینەوە (نەهینا)ی دیالێکتی وڵاتی کۆیێ.

لەبارەی (بەشەو)ی (ب ٢، ل ٢٤٤)ی:

**سەرو ریشم سەرا پا بۆتە لۆکە**
**بەشەو هەمرازمە پشمین و کۆکە**

یشـەوە کە لەتێکستـەکـەی شارەزاو میران (شـەوێ) بووەو مامـۆستـا بەگـوێـرەی دەسنـووسی یەکـەم و بەڵگەی ئەوەی «(بـەشـەو) واتـە (هەموو شەوێ)، بەلاّم (شەوێ) واتە ئەم شەوی دێ» گۆڕیـویـە، دەڵێم: بەچیڕا دیـارە (شـەوێ) بەمـەعنـای (ئـەم شەوی دێ) یە! ئەمە قسەیێکە پێویستی بەبـەڵگەی موقنیع هەیە بەرای من (شەوێ) یەکەی شارەزاو میران رەوانترەو ئامرازی (بە)ی (بەشەو) یشمان لە کۆڵ دادەگرێ.

لەبارەی (کۆیێ)ی (ب٦، ل ٢٥٣)ی:

**زەمانە تووشی دەردو غوربەتی کرد**
**غەمی کۆیێ پەرێشانی هەمووی کرد**

یشـەوە، کەلە تێکستـەکـەی شارەزاو میران دا (کۆیە) بووەو مامـۆستـا بە گوێرەی دەسنووسی یەکەم و بەڵگەی ئەوەی کە خەڵکی کۆیێ (کـۆیێ) ئەڵێن نەك (کـۆیـە)، گۆڕیویە، دەڵێم راستـە، بەلاّم بۆ پاریـزگـاری کردن لە مەعنای (غەمی کۆ)ـ کۆمەڵ، زۆرو، بۆ طیباقی تێوان (کۆ) و (پەرێشان)، (کۆیە)ی شارەزاو میران باشترە.

لە بارەی (زێر دەستی)ی (ب ١، ٢٦٥)ی.

**حاڵەتی زێر دەستی هەروایە**
**نۆکەری کاری چاکی بۆنایە**

یشەوە، کە لە تێکستەکەی شارەزاو میران دا (ژێر دەستی) بووە مامـۆستـا بەگـوێـرەی دەسنووسی یەکەم و بەڵگەی (ڕێبازی شیعری کلاسیکی عەرووزیی کوردی) گۆڕیویە، دەڵێم: نازانم بۆ دەبێ بەبیانووی ڕێبازی شیعری کلاسیکی سەرو پۆتەلاّکی زاراوەیەکی کۆن و بەسەر زارانەوە، بشکێنین!

لەبارەی (بیخەنە)ی (ب٢، چوارینی ٢، ل ٢٦٦)ی:

**وەك سەفینە بگەرێ بیخەنە بەر بەحری قسەم**
**حەیفە وەك من لە غەریبی بمرێت و نەتەوێ**

یشـەوە کە لەتێکستـەکەی شارەزاو میران دا (بیخەرە) بووەو مامۆستا بەگوێرەی دەسنووسی یەکەم و بەڵگەی ئەوە کە «ڕووی دەمی حاجی قادر لە (رەفیقـانی وەطەن)ە، لەبـەر ئەوە ئەبێ (بیخەنە) بڵێ کە صیغەی جەمعە نەك (بیخەرە)» گۆڕیویە دەڵێم ئەمـە وایە، بەلاّم چی لە (بگەرێ) و(نەتەوێ) بکەین تا ببنە جەمع! جا من وای بەبەش دەزانم کە (بیخەرە) بەسند بکرێ تا صیغەی ئەمرەکان ببنە ئەمری موخاتەبی موفرەد کێشەی وەك یەك نەبوو نیشیان لەگەڵ (ئەیْ رەفیقان ...) لە کوییّتی دا، بخەینە بەر قاعیدەی (ئیلتیفات).



# باخ

# ١٦٨٥ - ١٧٥٠

وەرگێڕان و ئامادەکردنی

ئازاد دلزار

کاتێ - یوهان سەبستیان باخ - هونەری مۆسیقای کردە پیشە بەلای خەڵکەوە سەیر نەبو، بەڵام جێگەی سەر سوڕمان دەبو ئەگەر پیشـەیەکی تری هەڵبژاردبایە. ئەم هونەرمەندە لە شارۆچکەی - ئەیزناخ - لە خێزانێکی ناو دار لە بواری هونەری مۆسیقادا لەدایك بووە، باپیرانیو زۆربەی خزمەکانی پیشەیان ئەرغەنوون و کەمان زوڕنا ژەنی بووە، یاخود مۆسیقایان ڕوو نووس دەکردو ئەم هونەرەیان کردبو بە بەشێك لە ژیانیان، ژمارەی ئەوانەی لەم خێزانەدا بەکاری مۆسیقاوە خەریك بوون لە نێوان ساڵەکانی ١٥٦٠ - ١٨٧١ز، دا لە پەنجاو سێ کەس کەمتر نەبوون هەر چەندە هەموویان خاوەنی ئەو بەهرەیە نەبوون کە ژیانیان تەنها لە ڕێگەی مۆسیقاوە مسۆگەر بکەن بۆیە پەنایان دەبردە بەر پیشـەی تر وەك چنین و نانەوایییو پێڵاو دروست کردن، ئەندامەکانی بنەماڵەی - باخ - هەردەم هەژارو نەدار بوون.

یوهان سەبستیان لە ماڵێکدا چاوی بۆ دونیای ڕۆشن هەڵهێنا کە پڕ بو لە ئاوازی مۆسیقا هەر لە زووەوە بەهرەی مۆسیقا تیایدا چەکەرەی کرد.

باوکی یوهان، - ئەمبرۆ سێوس - لە مۆسیقا ژەنەکانی دەربار بوو یەکەم مامۆستا بوو بۆ کورەکەی کە لە دوای دەر چوونییەوە لە قوتـابخانە تا درەنگانی شەو وانەی مۆسیقای پێ دەگوت، یوهـان زۆر تۆکمـەو لەش دامەزراو نەبوو گەلێ جار نەخۆشی لەقوتابخانەی دادەبری.

ماڵی سەبستیـان بە باغێك دەورە درابو گەلێ جار بۆ پشودان

رووی تێدەکرد هەر لەوێدا فێری یەکەم دەرسی خۆش ویستنی سروشت بوو، وانەکانی ئاینی لە دایکی وەرگرت کەهەر جارە چەند برگەیەکی لەکتێبی پیرۆز بۆ دەخوێندەوە ئەویش لەسەر گازەرای پشت لێی رادەکشاو لەتێك خورینی هەورەکان رادەما. ئەو چیرۆکانەی کە ئەو کاتە لە دایکی‌یەوە کەوتبوونە بەر گوێی یەکەم کاریگەری ئاینی لەناخدا چەسپاند ئەو ساڵە پڕ لە بەختەوەریانە زۆریان نەخایاند بەلکو زوو کۆتاییان هات پاش گەیشتنی بەتەمەنی نۆ ساڵی دایکە خۆشەویستەکەی کۆچی دوایی کردو ساڵێکی تێوەر نەسووڕایەوە باوکیش بەدوایدا رۆیشت، بەڵام خۆش بەختانە برا گەورەکەی ـ کریستۆف ـ شانی دابن باڵی کریستیان و برایەکی تری.. کریستیان و براکەی توانیان بەردەوام.بن لە خوێندنی مۆسیقاو بچنە قوتابخانەی شاری ـ ئۆردۆروف ـ کە ٣٠ میلێك لە ئیزناخەوە دوور بوو، کە ـ کریستۆف ـ ی برا گەورەیان لەو شارەدا ئەرغەنوون ژەن بوو. کریستیان لەوێدا بو بە قوتابێکی بەرچاو. رۆژ لەدوای رۆژ ـ باخ ـ ی بچکۆلە پتر مۆسیقای دەچوو بەدڵدا زۆربەی کاتی خۆی بۆ روو نووس کردنی بەرهەمی گەورە مۆسیقاژەنەکان تەرخان دەکرد دووبارە رێکی دەخستنەوەو بۆ ئامێری تری ئامادە دەکردن جیالەو ئامێرانەی کە ئەو مۆسیقایانەیان بۆ داندرا بوون. جارێکیان دەیویست پارچە مۆسیقایێك روونووس بکا کەبراکەی لە سنووقێك قوفڵی دابو، بەڵام دەرگای سنوقەکە لەشیش دروست کرابوو و خانە خانە بوو، سەبستیان دەی توانی دەستە بچکۆلەکانی تێ بخا بۆماوەی شەش مانگ هەلی ئەوەی وەردەگرت تا هەموو خێزانەکە دەخەوتن ئەویش پەرەیەکی دەردەهێناو لەژێر رۆشنایی مانگە شەودا روو نووسی دەکردو بەیانی دەی خستەوە جێگەی خۆی بێ ئەوەی کەس پێی بزانێ.

کاتێ تەمەنی گەیشتە پانزدە ساڵان ماڵی براکەی بەجێ هێشت و کەوتە بیری ئەوەی مشووری ژیانی خۆی بخوا. لەگەڵ یەکێك لە برادەرەکانیدا رووی کردە ـ لونبرغ ـ کە نزیکەی دووسەد میل لە ـ ئوردروف ـ وە دووربوو لەوێدا بوو بەئەندامی کۆرس لە دێرەی ـ قەدیس میخائیل ـ و بۆی رەخسا کە رەوشن بیری مۆسیقەیی تەواو بکا لەبواری مۆسیقای کلیسەی‌داو گوێ بۆ باشقە ئەرغەنوون ژەنەکانی زەمانی خۆی شکل بکات. پاش ئەوەی دەستی کرد بەئاوازدانان بۆ ئامێری ئەرغەنوون لەتەمەنی هەژدە ساڵیدا ـ باخ ـ یەکەم کاری گرنگی وەرگرت لە شاری ـ ئەرنستات ـ لەوێدا بو بە ئەرغەنوون ژەن و بەرێوەبەری جووقەی کلیسایێکی تازە دروستکراو کە دەبوایە بەیانی هەموویەك شەموان لە سەعات هەشتی بەیانی‌یەوە تاسەعات دە ئەرغەنوونی لێ بداباو پێنج شەموانیش لە سەعات حەوتەوە تا نۆ رۆژانی دووشەمەش لەکاتی نوێژدا. ئەم فرمانەش هەموو کاتی لە دەست نەدەسەند ئەوکاتانەی کە بێ ئیش دەبو خەریکی ئەرغەنوون لێدان دەبو تا بوبە ئەرغەنوون ئەنگێویکی گەورەو بەناوبانگ، گەلێ لاواندنەوەی دانا لە جۆری ـ کەنتاتا ـ واتە: (چیرۆك یانواندن کە جووقە بە گۆرانی بیڵێن) هەروەها جۆری ـ تۆکاتا ـ واتە: (ئاوازێك بۆ پیانۆ کە لێهاتویی پیانۆژەنە کە دەردەخا) وەجۆری ـ فیوغ ـ واتە: (چەند دەنگێك بە دواییەکدا بێن و وتێکەڵاوبین). لە ساڵی ١٧٠٧ دا کە تەمەنی گەیشتە بیست و دوو ساڵان کرا بە ئەرگەنوون ژەنی مکیسای ـ قەدیس بلاسیوس ـ لە ـ مولهەوزن ـ هەرچەندە باری ئەوێ سەخت بو لەگەڵ ئەوەشدا توانی هەندێ لە نایابترین ـ کەنتاتا ـ کانی دابنێ تەنها ساڵێك لەوێدامایەوە لەوکاتەدا لەگەڵ کچە مامە بچکۆلەکەیدا ـ ماریا بەربارە ـ دا زەماوەندی کرد. لە هاوینی ساڵی ١٧٠٨ دا دۆقی «ساکس وایمار کە زۆری پێ گەشکە دار بوو بانگی کردە لای خۆی‌و کردی‌یە ئەرغەنوون ژەن و پێش رەوی ئۆرکستەرای دەرباری خۆی ئەمە یەکەم جاربو ـ باخ ـ لە فرمانەکەی خۆی رازی بێ، لە (ویمار) هەندێ لە چاکترین بەرهەمەکانی خۆی نووسی کە تایبەتین بە ئەرغەنوون لەوانەش: «تۆکاتای گەورە» و «فیوغی پەیژەی دۆی بچووك» و «فیوغی پەیژەی رێ».

دۆق پیاوێکی رۆشن بیری خولیای ئەرغەنوون بو حەزی لە هونەر پەروەری بو وای بە خەیاڵدا هات کە «لویس مارشان» بانگ بکا کە ئەو کاتە ئەرگەنوون ژەنی دەرباری «لویسی پانزدەهەم» بو تا پێش برکەیەك لە نێوان ئەوو ـ باخ ـ دا سازبدات رۆژێکیان هەروا بە رێکەوت مۆسیقا ژەنی فەرەنسەوی واتە ـ لویس مارشان ـ گوێی لە ژەنینی ـ باخ ـ

دەبێ تووشی شپرزەیی دەبێو شار بەجێ دێڵێ پێش ئەوەی لە پێش برکەکەدا بەش داری بکا.

- باخ - جگە لەوەی کە ئەرغەنوون ژەن بو لە دەرباری دۆقدا - کلافیکۆردرو - کەمان - یشی لە ئۆرکسترای دۆقدا لێدەدا کە لە بیست و دوو مۆسیقا ژەن پێك هاتبوو. کاتێ کرا بە پێش ڕەوی مۆسیقا - مایسترۆ - لە ساڵی ١٧١٤دا دەبوایە هەموو مانگان - کەنتاتایەك - و چەند پارچە مۆسیقایەك بۆ ئۆرکسترا بنووسێ ئەم کارانەش پسپۆرێکی گەورەیان پێ بەخشی. کاتێ فرمانی سەرۆکی گشتی مۆسیقای دەربار لە - ویمار - بە چۆڵی مایەوە لە ساڵی ١٧١٦دا حەزی دەکرد ئەو پری بکاتەوە بەڵام بۆی نەرەخسا ساڵێکی نەبرد - میرلیۆپۆلد - میری - ئەنهەلت کۆتهن - کارێکی لەم بابەتەی پێ سپارد ئەویش قبووڵی کرد گەلێك دڵنەوای کرد کە خۆی مۆسیقازانێکی باش بوو. باخ زۆر بەختەوەر بوو ئیشەکەی بریتی بو لە سازکردنی ئاهەنگی بچکۆلە جۆری - مۆسیقای ژووران - بواری دانان و سەفەری لە بەردەمدا کرایەوە چو بۆ - لایبزگ - بەهیوای ئەوەی کە بە - هەندل - بگا بەڵام لە ڕۆژی چوونی ئەو دا شاری بەجێ هێشتبوو.

ساڵی ١٧٤٠ سەفەرێکی کرد بۆ «کارلسپادسپا» لەگەڵ دەست و پەیوەندەکانی میردا. لەکاتی گەڕانەوەیدا زانی ماریا بەربارەی ژنی کۆچی دوایی کردوە زۆری ئازار چەشت و نیگەران بو چونکە ژنێکی باش و دایکی حەوت منداڵ بوو. لە دوای ساڵێك - آنا مجدلینا - ی هینا کە کچی بووق ژەنێکی یەکێك لە شارەکان بوو لەوێش سیانزدە منداڵی تری بوو آنا گۆرانیو ڕوونووس کردنی مۆسیقای باش دەزانی فێری - کلافیکورد - ی کرد بو کە ئێواران بە ماندوێتی لە کاردەگەڕایەوە بۆی لێدەدا.

ئەو ساڵانەی (باخ) لە - گوتهن - بەڕێی کردن ١٧١٧ - ١٧٢٣ ساڵی بە برشت بوون بۆ بەرهەمی مۆسیقاکەی - شەش - کۆنشرتۆ - ی بەناوبانگی نووسی بۆ میرەکەی کە شەیدای مۆسیقابوو ناوی نان - برندنبورغ - کە یەکێك بو لە دەڤەرەکانی برووسیای کۆن.

ئەگەر ئەمیر لیۆپۆڵدا ژنێکی نەهێنابا کەرکی لە مۆسیقا دەبووە بۆی هەبو - باخ - بە درێژای تەمەنی لە دەربارەی ئەو میرەدا بمابایەوە بەم جۆرە باخ لەدوای شەش ساڵان دەستی لەکارەکەی هەڵگرت. لە پاش دڵەراوکێ داوای کاری مامۆستایەتی کرد لە قوتابخانەی - قەدیس تۆماس - لەلایبزگ داوا کاریەکەی پەسەندکرا هەرچەن کاری ئەوێی وەکو ئەوەی پێشووی نەبو بەڵام پێی ڕازی بو بۆ ئەوەی خوێندنی باشتر بۆ منداڵەکانی مسۆگەر بکا.

هەرچەندە لە دەست ئەوپلانانەی کە دەستەوەدایەرەی کلیسەی - قەدیس تۆماس - بۆیان دادەناوە گەلێك ئازاری چەشت بەڵام بەشی دوایی ژیانی پڕ بو لە کاری بەرهەم دارکەنایاب ترین - کانتاتا - و - لاوانە - وەو - ئازارەکانی مەسیح - ی تێدا دانان وە هەروەها «ئازارەکان بە گوێرەی ئینجیل مەتی»و «ئۆرا تۆریۆی لەدایك بوون)ی تێدا دانان.

باخ لە سەردەمی ژیانیدا خەڵکی ڕێزیان لێدەنا نەك لەبەر دانراوەکانی بەڵکو لەبەر بەتوانایی لە ئەرغەنوون ژەنیدا هەر کەسێك ئەرغەنوونێکی تازەی دروست کردبا ڕاوێژی بەو دەکردو لە ڕێ نومایییەکانی کەلکی وەردەگرت کاتێ سەری لە - پۆتسدام - دا لە ساڵی ١٧٤٧دا مەلیك بانگی کرد کە هەموو ئەرغەنوونەکانی شار لێبدا - باخ - بەم ڕوو لێنانە دڵگوشاد بو کاتێ گەڕایەوە بۆ - لایبزگ - پارچە مۆسیقایێکی بۆ مەلیك دانا.

دەڵێن ئەو ئەرکە گرانەی باخ بە درێژایی ژیانی کێشای بۆ ڕوو نووس کردنی بەرهەمەکانی لەبەر تیشکی چراو گێکی کزدا بوونە هۆی کەم بینایی چاوەکانیو لە دوا دوای ژیانیدا بەیەکجاری چاوەکانی لەدەست چوون ساڵی ١٧٥٠ز بە نەخۆشی ئیفلیجی کۆچی دوایی کرد، تەرمەکەی لە ڕێرەوێکی ساکارانەدا بەرەو گۆڕستانی - قەدیس یوحەننا - بەڕێ کرا.

● **سەرچاوە:**

سیرکبار الموسیقیین - لیدبیرد، انکلترا، ط ١٩٧٥

لەکتێبی: (سیرکبار الموسیقین وەرگێڕدراوە
طبع انکلترا الطبعة الاولی ١٩٧٥
من کتب : لیدبیرد



# هونەرو چارەسەری نەخۆشیی دەروونی

عومەر رەسول



وێنەی - ١ -

کۆنگرەی بیستەمینی پەروەردەکردنی هونەری، کە لە ڕۆژی (٨ - ١٩)ی مانگی «ئابی» ساڵی ١٩٧٠: لە شاری «کۆڤنتری» لە « ئینگلتەرە»دا گیرا (کۆمەڵەی جیهانی پەروەردەکردنی هونەری نیگار کێشانی منداڵان)، لە نەخشەو پرۆگرامی باسەکەیان دا، گرنگی‌یەکی تەواویان بە لایەنی (هونەری نیگار کێشان) وەك هۆیەکی دەست نیشان کردن و چارەسەرکردنی نەخۆشیە دەروونی‌یەکان دا، ئەم بەرنامەیە لە وڵاتانی، ئینگلتەرەو، ئەمەریکاو، فەرەنسادا، جێبەجێ کراون و چەندین مامۆستایان بۆ کارکردن لە نەخۆشخانە دەروونی‌یەکان دا ئامادەکرد، بۆ چوونەکانیان زیاتر دەربارەی ئەم چەند خاڵانەی خوارەوە بوو..

١- بوونی ئەو ڕەمزانەی کە وێنەکە پێك دەهێنێت و منداڵەکە بەکاریان دەهێنێ‌و، چەند جارێك دووبارەیان دەکاتەوە، منداڵ زۆر جار لە وێنە کێشاندا پەنا دەباتە بەر دووبارەکردنەوەی هەندێ لەو ڕەمزانەی، بەردەوام بەکاریان دەهێنێ ئەم دیاردەیەش دەگەڕێتەوە بۆ باری دەروونی منداڵەکەو چێژ وەرگرتنی لەو دووبارە کردنەوەیە، کە تەنها بۆشایی پەڕەکەی پێ پڕ دەکاتەوە.. بڕوانە وێنەی (١، ٢، ٣، ٤، ٥)

شارەزایانی پەروەردەکردن و دەروون ناسی ئەوەیان ڕوون کردۆتەوەو سەلماندووە، کە ئەم جۆرە منداڵانە تەنها لە وێنە کێشان دا شتەکان دووبارە ناکەنەوە، بەڵکو لە نووسین و یاری کردنیشدا هەمان شێوە هەڵس و کەوت دەکەن، گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی، کە ئەو منداڵانە تووشی نەخۆشی (شیزۆفرینیا) بوون، ئەوەش لە بەر ڕەگ داکوتانێکی قووڵە لە دەروونی منداڵەکەدا...

٢- ئەم ڕەمزانە لەڕووی جوانی‌یەوە لاوازن، بەڵکە منداڵەکە هەر ناچێت بەلای مەسەلەی ئەو جوانی‌یەدا، چونکە لەم کاتانەدا زیاتر هونەرەکەی هۆیەکی بەیەك گەیشتنە بۆ یەکتر ناسین، یان بە واتەیەکی‌تر دەربڕینێکی ئەوەیە کە منداڵەکە خۆی خووی پێوە گرتووە.

٣- زۆر لەم ڕەمزانە بە ڕاستەوخۆیی دیاری بدەن، یان بە لابەلای دەرکەون، بەستراون بە وزە پەنگ خواردووەکانەوە

وێنەی - ٢ -



وێنەی - ٣ -



(الطاقات المكبوته).. جا لێرەدا مامۆستاکەی هونەرکاری چەند شارەزا بێت لە خوێندنەوەو شیکردنەوەی ڕەمزەکان، لە ڕووی هونەرکاری‌و جوانی‌یەوە، ئەوەندە زیاتر دەتوانێت دەست نیشانی نەخۆشی‌یەکەی بکات و چارەسەری ڕاستی بۆ بدۆزێتەوە، چونکە ئەو پەرە کاغەزەی منداڵەکە وێنەی لە سەر دەکێشێ، هەرچی شێوەکانی وزە پەنگ خواردووەکان و حەزو خواست و ئازارێك هەیەتی، کە لەلایەن کۆمەڵەوە بە سەری‌دا

وێنەی ـ ٤ ـ



وێنەی ـ ٥ ـ



سەپێنراوە لە سەر پەرەی کاغەزەکە بە دەر دەخات،

● خوێندنەوەی ڕەمزەکان

پەیامی هەرە گەورەی مامۆستای هونەر، شارەزا بوون و خوێندنەوەی ڕەمزەکانە، ڕاستە منداڵان، لە تەمەنی جیاوازدان و لە هەر قۆناغێکی تەمەنیان دا، لە ڕووی خواست و تێگەیشتنی خۆیانەوە بە شێوەیەکی تایبەتی ڕەمزەکان بەکار دەهێنن..

بۆ نموونە: وێنەی «خاچ» لە وولاتانی ڕۆژاوادا ڕەمزە بۆ چەند مانایەك، وەك خۆبەخت کردن لە پێناوی بیرو ڕێبازدا، دانانی «خاچ» لە شوێنە بەرزەکان دا ڕەمزە بۆ بەرزی شەهید.. هەروەها وێنەی «کۆتر» ڕەمزە بۆ ئاشتی، وێنەی «بەران» ڕەمزە بۆ خۆبەخت کردن وەك لە چیرۆکی ئیبراهیم و ئیسماعیلی کوڕی‌دا بیستوومانە، وێنەی «باز» ڕەمزە بۆ بەرزی‌و دەسەڵات، دەم و چاوی «شێر» ڕەمزە بۆ هێز، وێنەی ڕێوی بۆ گوناح، یان تاوان کردن، وێنەی «ماسی» ڕەمزە بۆ چاکە، وێنەی «چاو» ڕەمزە بۆ چاو پێ‌دا هەڵهێنان، وێنەی «دەم» بە گەورەیی ڕەمزە بۆ تووڕەبوون و پێ‌دا هەڵشاخان، وێنەی «حوشتر» ڕەمزە بۆ گەڕانەوە لە حەج، وێنە «دەست» بە درێژی ڕەمزە بۆ دەسەڵاتداری، وێنەی «دەست» بە کورتی ڕەمزە بۆ لاوازی‌و بێ هێزی، هەروەها لە سەردەمی «ئەخناتوون دا» لە میسر وێنەی بازنەیان بۆ خرێتی خۆر بەکارهێناوە ئەو هێڵانەی لە بازنەکەوە هاتوونەتە خوارەوە ڕەمزی ئەو چاکەو خۆشی‌یەن، کە لە خۆرەوە دەستمان دەکەوێت، هەروەها داخستنی بازنە ڕەمزە بۆ دەستەڵاتداریتی‌و خستنە ژێر ڕکێفەوە.... هتد،

● چارەسەرکردنی دەروونی

چارەسەرکردنی دەروونی، لە بەکارهێنانی تیۆرێکی نوێی زانستی‌یانەی دەروونی پێکهاتووە، ئەم تی‌بینیە بۆ گۆڕینی هەڵس و کەوتی مرۆڤی نەخۆش و مامەڵەکردنی لەگەڵ جیهانی دەرەوەو هەست کردن بە بوونی خۆی واتە چارەسەرکردنی دەروونی «کۆن» تێ دەپەڕێنێ‌و بە دوای بەرە بەیانێکی نوێ‌دا دەگەڕێ.. دەتوانیت بڵێیت چارەسەرکەری دەروونی مەج نی‌یە پزیشکێکی دەروونی بێت، بەڵام مەرجە لە بابەتی زانستی دەروونی‌و کۆمەڵایەتی‌و لە شێوەکانی

پەروەردەکـردن دا شارەزابێ، لەبـەر ئەوە دەتـوانـین بڵێـین هەمـووی دەگەڕێتەوە بۆ توانا و شارەزایی و حەزی ئەو کەسە خۆی، واتە چارەسەر کەرە دەروونییەکە..

چارەسەرکردنی دەروونی بە دوو شێوە دەکرێت.

● ا ـ چارەسەرکردنی یەك یەکی.

● ب ـ چارەسەرکردنی گەلەکی.

**ا ـ چارەسەرکردنی یەك یەکی**:ـ واتە دەتوانین تەنها یەك کەس چارەسەر بکەین و بیخەینە ژێر تاقیکردنەوەوە، ئەمیش بە چەند ڕێگایەك وەك:ـ

**شیکردنەوەی** دەروونی لای فرۆید، یان یونگ، یان ئەدلەر، یان کارل رۆجەرز، یان لای وجودییەکان، یان لای فرانکڵ، یان لای جانۆف، هەروەها چارەسەرکردن بە راستکۆکاری، یان بەژێری (هۆشیاری)، یان چارەسەرکردنی بابەتی، یان چارەسەرکردنی بە نووسین، یان بەخەواندنی موگناتیسی، یان بە بەنج کردن (سر کردن)، یان بەیاری، یان بە هونەر، یان ئایین، یان بە رەووشت

● **ب ـ چارەسەرکردنی گەلەکی**..

١ـ چارەسەکردنی دەروونی بە هاوبەش بوونێکی گەلەکی.

٢ـ چارەسەرکردنی گەلەکی ئەزالی.

٣ـ چارەسەرکردنی دەروونی «اجرائی».

٤ـ چارەسەرکردنی دەروونی بە نواندن، «السایکۆدراما».

**ئامانجەکانی چارەسەرکردنی دەروونی**

١ـ نەخـۆشـەکـە لەرووی پەروەردە بوون و، رۆشنبـیرییەوە بگەڕێتەوە دۆخی جارانی، هەڵچوونیشی بەرەو چاکی ئەش و نما بکات..

٢ـ نەخـۆشەکە هەست بەئاسایش بکات و، کرژی و گوشراوی خاو بێتەوەو بگەشێتەوە..

٣ـ ترس و شەرمەزاری و ڕاڕایی نەمێنێ و باوەڕی بە خۆی قایم ببێت..

٤ ـ هەڵ و مەرجێکی وای بۆ برەخسێنرێ کە بە هۆیەوە بروای زیاد بکات، بەو کەسانەی دە ورووپشتی کە هەڵس و کەوتنیان لە گەڵا دەکات..

٥ ـ لە تەنیایی و گۆشەگیری و خۆخواردنەوە دوور بخرێتەوە.

٦ ـ وای لێبێتەوە، کە بتوانێت بە شێوازێکی زانستیانەی راست و رەوان بەرەنگاری ئەو کێشەو کۆسپانە بکات، کە دێنە رێی و بە سەریانا زاڵ ببێت..

٧ ـ نەخۆشەکە دوای چارەسەرکردن وای لێ بێت هەست بەوە بکات، کە مرۆڤێکی بایەخ داری بە نرخ و توانایەو بەفەرو سوود بەخشـە بۆ خێزان و کۆمەڵەکەی و، شانازی بەخۆیەوە بکات، واش بزانێ کە هەندێك ئەرکی کۆمەڵایەتی و نەتەوایەتی بە سەر شانەوەیەو دەبێت بیان هێنێتە دی..

● **دەست نیشان کردنی نەخۆشی دەروونی و چارەسەرکردنی**

پزیشکێکی دەروون ناس تەنهـا ناتـوانێت نەخـۆشییە دەروونییـەکـان دەست نیشـان بکـات و چارەسـەریـان بۆ بدۆزێتەوە، لێکۆڵەرەوەو زانایان و پزیشکان، گەیشتوونەتە ئەو ئەنجـامـەی کە «نیگـار کێشـان و یاری کردن» لەلای منداڵ باشتـرین هۆی یارمـەتی دەرن بۆ چارەسـەرکردن و دەست نیشان کردنی نەخۆشییە دەروونییەکان.

منداڵ لە ڕێگەی وێنە کێشانەوە خودی خۆی دەردەبڕێ و حەز و خواست و خەونەکانی لە سەر پەرەی کاغەز دەردەخات، واتـە کەسایەتی منداڵەکە هەرگیز لە کارە هونەرییەکەی جیا نابێتـەوەو پەیـوەنـدییەکی تونـدو بەهێز لە نێوانیان دا هەیە.. بەهەمان شێوە منداڵ بایەخ بە یاری کردن دەدات و ئاڵوودەی دەبێت و زۆر لەبـارە دەروونییـەکەی لەیارییەکانیدا رەنگ دەداتەوە.. هەروەها منداڵ بە جموجۆڵ خرۆشی دادەمرکێنێ و، پەنـگـاوی کرژێـتـی و دڵ تەنـگـی خۆی بەرەڵا دەکـات و دەحەسێتەوە.. نیگار کێشانیش یارییەکی شاکارەو بەشێکی گرنـگ لە جیهـانی منـداڵ دەگـرێتـە خۆ.. منداڵێك نییە لە تەمـەنـێکی دیـاریکـراو بارو دۆخێکی گونجـاودا وێنـە نەکێشێت.. گەر هاتـوو هیـچ جۆرە کەرەسـەیـەکی تایبـەتی نەخەینە بەردەست، ناچار بۆ وێنەکێشان پەنا دەباتە بەر دارو دیوارو تەختەو سەر زەمین، هەروا بەم جۆرە ئەم پەرە کاغەزەی دەیخـەیتـە بەر دەستی باشتـرین رووبەرە بۆ یاری کردن و تەراتێنی منـداڵەکـە.. شارەزایانی پەروەردەکردن و دەروون ناسی و پزیشکـان پاش گفتـوگۆیەکی زۆر هاتوونەتە سەر ئەو



وێنەی -٦-

بڕوایەی کەپێویستە ئەو پەرە کاغەزەی دەیخەینە بەر دەستی منداڵەکە، لەلای خۆمانەوە بە دوو هێڵی خەیاڵاوی ئەستوون لە سەریەك دابەشی بکەین و؛ لە خاڵێکدا بە یەکیان بگەیەنین و یەکتر ببڕن و پەڕەکە بکەین بە چوار بەشی یەکسانەوە.. پاش ئەم کارە تێبینی منداڵەکە بکرێت: ئایا ئەو بابەتەی دروستی دەکات دەکەوێتە چ بەشێکەوە؟! بۆ ئەمەش لێرەدا باسی بەشەکان دەکەین و گرنگی هەر خانەیەکیان دەردەخەین.. بڕوانە وێنەی ژمارە (٦)

بەشی چەپی پەڕەکە بە هەردوو خانەکەیەوە، بریتییە لە دەربڕینی ئازارو تەنیاییو چوونە ناو قاوغی ترس و شەرم و باوەڕ بەخۆنەبوون و سڵەمینەوە لە دەستپێشخەریو کارکردن و دوورکەوتنەوە لە دانانی هەموو پڕۆژەیێکی دوا ڕۆژ.. هەروەها گەڕان بە دوای لانەیەکی ئاسایشی بێ ئاژاوەدا.. بڕوانە وێنەی ژمارە (٧)

بەشی ڕاستی پەڕەکە بە هەردوو خانەکەیەوە بریتییە: لە جم و جۆڵ و چالاکیو باوەڕ بەخۆبوون؛ بۆ چەسپاندنی کەسایەتی خۆی، حەزی بە دانانی پڕۆژەو سەرکەوتنی پڕۆژەکەی هەیە، حەز لە تێکەڵاو بوونی کەسانی چواردەوری دەکا بە مەرامی جێبەجێ کردنی ئەو ئەرکانەی دەکەوتە سەر شانی.. لەم ڕوانگەیەوە هەر یەك لە خانەکان ڕوون دەکەینەوە..

خانەی چەپی سەرەوەی پەڕەکە بریتییە: لە تەمەڵیو کەم جووڵەیی؛ نوقم بوون لە دەریای خەیاڵ و بێ هودەییدا؛ هێنانەدیی حەزو خواستەکانی لە دەریای خەیاڵ دا. بڕوانە وێنەی ژمارە (٨)

خانەی چەپی خوارەوەی پەڕەکە بریتییە: لەدایك بوونێکی نوێ، هەڵس و کەوتی سەرەتاییو مرۆڤێکی سادە، دایك..

خانەی ڕاستی سەرەوەی پەڕەکە بریتییە لە گەڕان بەدووای هێنانە دیی ئامانج و حەزو خواستەکانی لە دنیای ڕاست و زانست داو خۆبەخت کردن لە پێناویان دا، حەزکردن بە تێکەڵاو بوون بە کۆمەڵ و چواردەورەکەی، هەروەها خانەی ڕاستی خوارەوەی پەڕەکە بریتییە لە کەوتن و هەرەس هێنان و نەهامەتیو بێزارییو خۆ خواردنەوە، زۆربەی وێنەی منداڵە نەخۆشەکان لەم خانەیەدان. لێرەدا دەڵێیت ئەگەر هاتوو بەشی زۆری وێنەکە کەوتبووە خانەیەکەوەو بەشێکی کەمیشی لە خانەیەکی تردا بوو واتای چییە؟. ئەوا لە وەڵام دا دەڵێیت بە بەشە زۆرەکەدا دای دەشکێنین..

زانایان دەڵێن: منداڵ زۆر جار پەنا دەباتە بەر ناوەڕاستی پەڕەکەو وێنەی لەسەر دەکێشێ؛ وێنەکەشی بە شێوەیەکی بچووك نەخش دەکا، لێك دانەوەی ئەم شێوەیە مانای ئەوە

وێنەی -٧-



وێنەی -٨-





- وێنەی ـ ٩ ـ

دەگەیەنێت منداڵەکە دەیەوێت کەسایەتی خۆی بە کەسانی چواردەورەکەی بناسێنێو سەرنجیان رابکێشێ بۆ لای خۆی، کە هەست بەترس دەکات و پێویستی بە یارمەتی دان و خۆشەویستیو سۆز هەیە، بروانە وێنە ژمارە (٩) بەڵام بە پێچەوانەی ئەمیانەوە ئەگەر هاتوو منداڵەکە لە کاتی وێنە کێشاندا لە پەرەکە دەرچوو.. هەموو رووبەری پەرەکەی گرتەوە، بەمەش دەربرینی قین و دوژمنایەتیی خۆی نیشان دەدا دەربارەی کەسانی چواردەورەکەی واتە رقی لێیان دەبێتەوە؛ جۆرە منداڵی تریشمان هەیە کە لە کاتی وێنەکێشان دا بابەتەکە لەسەر یەك کەڵەکەو تێکەڵاو دەکات ئەمەشیان نیشانەی نەخۆشیی بیرکۆڵی منداڵەکەیە. بۆ زیاتر شارەزا بوونمان دەربارەی هەستی دەروونی منداڵەکە دێینە سەر باسی جووڵەی دەستی لە کاتی راکێشانی هێڵەکان دا، ئەمەش هەمووی پەیوەستە بە چۆنێتی باری دەروونی منداڵەکەوە، هێڵ کێشانی ئەستوونی بۆ سەرەوە، رەمزی کراوەیی و هێنانەدیی خواستەکانێتی، بەڵام کێشانی هێڵ بۆ خوارەوە، رەمزی تەمەڵی و خۆ خواردنەوەیەتی.. جا پێویستە ئەو زانا دەروونیانەی دەیانەوێت بە رێگەی وێنەکێشان لە باری دەروونی منداڵ و دەست نیشان کردنی نەخۆشییە دەروونییەکانی شارەزا بین، ئەو شتانەی باسمان کرد ب باشی رەچاو بکەین...

لەم رووەوە «دکتۆر فراسواز مینکۆفسکا» ساڵی ١٩٢٨ بۆ سەرکەوتنی لێکۆڵینەوەکەی دەربارەی گرنگی دان بە وێنەکێشانی منداڵ، بە گشتیو ئەو منداڵانەی نەخۆش بوون، بە تایبەتی چەندەها وێنەی هەڵبژارد کە منداڵانی نەخۆش دروستیان کردبوون، بە تایبەتی ئەو وێنانەی خانوویان تێدا دروست کرابوو. بروانە وێنەی ژمارە (١٠، ١١، ١٢)

لەم لێکۆڵینەوەیەدا چەند خاڵێکی دەست نیشان کرد:ـ

١ ـ پەیوەندی نێوان منداڵەکەوماڵەوە.

٢ ـ ماڵەکە تەنهایە، یان چواردەوری بە ماڵی ترو دارو درەخت گیراوە؟.

٣ ـ نیشانەکانی ماڵەکەو کەرەسەی ماڵەکە نزیکن لە یەکەوە، یان دوورن ؟! گونجاون یا نا ؟!.

وێنەی ـ ١٠ ـ ١١ ـ ١٢ ـ







٤ ـ پەنجەرەکان کراوەن یانْ پەردەیان پێوەیە؟!.
٥ ـ دووکەڵ کێش لە ماڵەکەوە هاتۆتە دەرەوە یا نا ؟!.
٦ ـ دروست کردنی کەسانی خێزانەکەی و دەرکەوتنی هەریەکەیان بەو شێوەیەی منداڵەکە مەبەستی‌یەتی.. هەروەها ساغی کردوەتەوە کە زۆر لەو منداڵانەی لایان داوە، واتە هیچ پەیوەندی‌یەکیان بەخێزانەکەیانەوە نەماوە وێنەی خێزانەکەیان دروست ناکەن..

دەروون ناسەکان، لێکۆڵەرەوەکان گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی کە لە رێگەی وێنە کێشانەوە ناتوانن تەنها بەیەك جار شارەزای دەروونی منداڵەکە ببن و دەست نیشانی نەخۆشی‌یە دەروونی‌یەکەی بکەن، بەڵکو دەبێت ئەم تاقی کردنەوەیە چەند جارێك دووبارە بکرێتەوەو رۆژ لە دوای رۆژ وێنەی منداڵەکە هەڵبگیرێت و، راپۆرتی هەفتانەی لە سەر بنووسرێت.

پێش دەست بەکار بوون و تاقی کردنەوە، لێکۆڵەرەوەکە مەرجە ئەم زانیارانە دەربارەی منداڵەکە بزانێت و رەچاویان بکات:

أ ـ لە سەر لێکۆڵەرەوەکە مەرجە، خۆی نەبەستێتەوە بە دەست نیشان کردن و سنوور دانان بۆ کاتی تاقی کردنەوەکە.

ب ـ ئەم پرسیارانەی لە کەس و کاری منداڵەکە دەکرێت، بە زمانێکی ئاسان بێت..

ج ـ تاقی‌کردنەوەکە چەند جارێك دووبارە بکرێتەوە..

سەبارەت بەو پرسیارانەی کە لە کەس و کاری منداڵەکە دەکرێن، وام بە باش زانی بەچەند خاڵێك زیاتر روونی بکەمەوە ئەمەش خاڵەکانە:

١ ـ زانیاریی دەربارەی نەخۆشەکە.
٢ ـ زانیاریی دەربارەی چواردەوری منداڵەکە.
٣ ـ زانیاریی دەربارەی باری ژیری‌و دەروونی منداڵەکە.

مەبەستی سەرەکیمان لە هەڵبژاردن و دیاری کردنی ئەم خاڵانە، بۆ چۆنیەتی شارەزابوون و دروست بوونی کەسایەتیی منداڵەکەیە..

«کۆرمان»ی دەروون ناسی پەروەردەیی لەم بارەیەوە دەڵێ: وا بە باشتر دەزانرێت بە کۆتایی هاتنی هەر تاقی کردنەوەیەك بزانین تا چ رادەیەك سەرکەوتووین لە رێرەوی کارەکەمان و لە دەست نیشان کردنی نەخۆشیی دەروونیی منداڵەکەو چۆنیەتیی چارەسەرکردنی؛ دیارە بەگرتنە بەری بەرنامەیەکی زانستیانە، کە بزانین منداڵەکە پێی‌دا بروات سەردەکەوێت و لە نەخۆشی‌یەکەی دوور دەکەوێتەوەو رزگار دەبێ..

یەکێك لە گیرو گرفتەکانی پزیشکی دەروونی «کەرەسەیە»، بەڵام ئەو کەرەسەیەی لێرەدا بەکاری دەهێنین «پێنووس، دەفتەری نیگار کێشان، رەنگ»ن ئەمانەش خۆیان لە خۆیان دا پەیدا کردنیان کارێکی ئاسان و سادەیە، دووەمین گیروگرفتیش:

(راستی درکاندن)ە، وا بزانم لە هەموو شتێك خۆشتر ئەوەیە کە پزیشکێکی دەروونی بەرامبەر نەخۆشەکەی رادەوەستێ‌و دەیەوێ لە گەڵیدا، بگاتە ئەنجامێك کە (راستی)یە، ئەو راستی‌یەش دەبێ لە دەمی نەخۆشەکەوە بێتە دەرێ، بەڵام زۆر جار نەخۆشەکە نایەوێ ئەو نەخۆشی‌یەی هەیەتی هەمووی بدرکێنێ‌و باسی بکات، یان شەرم دەکات، یان دەترسێ، یان حەز ناکات بە پەنگ خواردوویی بیهێڵێتەوەو نەیدرکێنێ، واتە لەم حاڵەدا پزیشکەکە سەرکەوتنێکی تەواو بە دەست ناهێنێ‌و ناگاتە مەبەست..

بەڵام دەرخستنی باری دەروونی منداڵەکە بە راستی‌و پاکی‌و بێ‌گەردی‌و بەبێ فێڵ و درۆ لە سەر پەرە کاغەزەکە، باشترین رێگەیە بۆ ناسینەوەو دەست نیشان کردنی نەخۆشی‌یەکەی..

چارەسەرکردنی نەخۆشیی دەروونی لە رێگای هونەرەوە بریتی‌یە: لە شیکردنەوەی رەمزەکان یەك لە دوای یەك و خوێندنەوەیان، نیگار کێشان یان دەربرینی هونەری بە شێوەیەکی تایبەتی؛ باشترین بووارە بۆ منداڵ بە مەبەستی هێنانە دیی حەزو خواستەکانی‌و دەربازبوونی لەو ئازارو هەڵچوونانەی لە ژیانی رۆژانەدا لە رێگای نەستەوە تووشی بووە.

مرۆڤی نەخۆش چەند هەست بە بوون و جۆری نەخۆشی‌یەکەی‌و سەرهەڵدانی بکات ئەوەندە لە ئازارەکەی کەم دەبێتەوە، بەڵام ئەگەر نەیزانی‌و نەیتوانی بەرەنگاری بێتەوەو

دەستەو ئەژنۆ دابنیشێت و پشت گوێی بخات و کەم تەرخەم بێت، ئەوا ئازارەکەی زیاتر دەبێت و زیاتر کار لە بیرو مێشکی دەکات و بەرەو رووخاندنی دەبات، مامۆستای هونەر بۆ دەست نیشان کردن و چارەسەرکردنی نەخۆشی‌یە دەروونی‌یەکەی بە بەکارهێنانی نیگار کێشان پێویستی بە زانینی ئەم خاڵانەش هەیە:

١ ـ پێ زانین.

٢ ـ دەروون زانیی پەروەردەیی منداڵ.

٣ ـ دەست نیشان کردنی جۆری نەخۆشی‌یەکەی.

٤ ـ جیاوازیی نێوان ئەو وێنانەی کە منداڵەکە خۆی دەیکات و ئەو وێنانەی بە زۆر پێی دەکرێ..

.

١ ـ فوبیا «تۆقین» Phobia

٢ ـ شیزۆفرینیا Schizophrenia چەشنەکانی شیزۆفرینیا

أ ـ شیزۆفرینیا سادە. ب ـ هیفرینیا.

ج ـ کاتاتۆنیا. ء ـ بارانۆیا.

هـ ـ شیزۆفرینیایی منداڵێتی ـ و ـ باراڤینیا.

ز ـ مالنخۆلیا..

٣ ـ نەخۆشی سایکۆپاتی Psychopathic ـ

٤ ـ نەخۆشی سایکۆسۆماتی psychosomatic

بۆ روون کردنــەوەی نەخـۆشی‌یەکان وا بە باش دەزانم چەند نموونەیەك باس بکەم کە خۆم تێبینیم کردووە.

نموونەی یەکەم لە سەر نەخۆشی (فۆبیا)..

ئارام قوتابی‌یەکی پۆلی سێ‌یەمی ناوەندی بوو، حەزی بە وێنە کێشان بوو، لە وێنەکانی‌دا زیاتر پیاوی بە شێوەیەکی ناشرین، خوێن، چەقۆ، پارچەکانی لەش بە پچڕ پچڕی دروست کردووە، بەرامبەر بە ژیان و خۆی‌و ئیشە هونەری‌یەکانی نەیدەزانی درۆ بکـات، هەردەم بە پاکی دەی نەخشـاندن، هەمیشە بە تەنیا دادەنیشت، دیـاربوو تەنانەت قوتابی‌یەکانی هاورێیشی نەیان دەوێرا بی‌دوێنن، هەر کاتێك بێزار ببووایە، لە ژوورەکە دەچووە دەرێ، لە وێنـەکانی شارەزا بووم حەزم دەکرد زیاتر خۆیشی بنـاسم، بۆیـە هەوڵم دا لێی نزیـك ببمەوە، چەند پرسیارێکم لێ‌کـرد، باوکت ئیشی چی‌یـە؟. سەری لەقـاندو دڵگیر بوو، لە سەرەتاوە دەمی تێك ئالا، رەنگی زەرد هەڵگەراو، چەند چرکەیەك لە ئاست یەکتر بێ دەنگ بووین، تەمەنم شەش ساڵان ب و.

باوکم پیاوێکی بەدخوو بوو، هەردەم بە سەرخۆشی دەهات وە بۆ ماڵەوە، بەگـژ دایـکم دا دەچـوو، ئازاری دەدا، بینیـی ئەم شانۆگەری‌یە، هەموو رۆژێك دووبارە دەبووەوە، تا رۆژێکیان دەمـەو ئێوارە، خۆم و دایکم لەماڵەوە بووین، خوشکم لە ماڵی دراوسێ‌کـەمان بوو... بە کێردێکەوە هەڵی کوتایە سەر دایکم و دای بە زەوی‌دا، وەك بڵێـی مەر سەر ببـڕێ، سەری بری خوێنـەکـەی بە ژوورەکـەدا هەڵپرژا، لەرز دای گرتبووم نەم دەوێـرا جووڵە بکەم.. چاوەکانی سوور بوو بوون و خوێنیان تێ‌دا زابوو، کێردەکەی بە توندی فڕێ داو، وەك بەرزەکی بانان بۆی دەرچـوو، هەڵم کوتایە سەر لاشەکەی دایکم و، تا هێزم تیادا بوو قیژاندم، کەسانی کۆڵانەکەمان لاشەکەی دایکمیان هەڵگرت و زۆر بە گورجی کارو باری شتن و پێچانەوەیان تەواو کردو بەرەو سەرقەبران ملی رێگەیان گرت، هەر لەو تەمەنەدا زۆر بەزەییم بە خۆم دا دەهاتەوە، چونکە کەسی ترم نەبوو، سۆزم پێ ببـەخشێ، یادگارەکانی شەوانی دایکم، لایە لایە کردنەکەی، زەنگێك بوون لە گوێم دا دەنگیان دەدایەوە، شێوەی دایکم لە بەرچاوم وون نەدەبوو، دەم و چاوە ناشیرینەکەی باوکیشم وەك، گیاندارێکی درندە هەردەم ئازاری دەدام، قیژم لێ دەهاتەوە.

شەش ساڵ بە سەر بەسـەرهـاتـەکەدا تێپەری رۆژێکیان لە قوتابخانە، بەرێوەبەری قوتابخانەکەمان بانگی کردمە دەرەوە، هەواڵی مردنی باوکی پێ گوتم بەڵام ئەم هەواڵەیان وەك خەوێك ببینم وابوو، یادکردنەوەی لە مێشکم دا دووبارە نەدەبووەوە، بەڵام بەسەرهاتەکەی دایکم تەنانەت لە سەربرینی مریشکێك دا بەدی دەکەم و، سەر لەنوێ ئازارەکە دەم خواتەوە... کەواتە دەڵێیت تۆقینەکەی ئارام بریتی بوو لەمانە:

١ ـ داخستن

٢ ـ خەڵك

٣ ـ مردن

٤ ـ خوێن

٥ ـ چەقۆ

٦ ـ توورەبوون
٧ ـ پیاو.

باشترین ڕێگە بۆ چارەسەرکردنی ئەم نەخۆشی‌یە، لە ناوبردنی ئەم مەترسی‌یەیە، کە بەسەری‌دا هاتووەو کاری لێ کردووە، بە ڕێنمایی‌یەکی زانستیانە، ئاگاداری بکەینەوە، کە شتێکی ئاسایی‌و پێویستە خۆ ڕاگر بێت بەرامبەری‌و وردە وردە دوری بخەینەوە..
بڕوانە وێنەی ژمارە (١٣)

● نموونەییکی نەخۆشی سایکۆسۆماتی.
نەخۆشی پێست.

شیکەرەوە دەروونی‌یەکان گەیشتوونەتە ئەو ئەنجامەی، کە پەیوەندی‌یەکی توند هەیە لە نێوان نەخۆشیی پێست و، بەربەرەکانی‌یە دەروونی‌یەکان دا وەك: چێژ وەرگرتن لە ئازاردانی خودی خۆی کە پێی دەگوترێ «ماسۆشیەت».. ئەمیش بە خوراندنی پێست، تا خوێنی لێ دێت، «سەربەست» مندالێکی کەرو لالەو، سەر بە پەیمانگای «هیوا»یە تەمەنی (٧) سالانە، تا بڵێی مندالێکی ترسنۆکە لە هەڵس و کەوتی‌دا، شەرمنەو باوەری بە خۆی نیە.. هەردەم خۆی دەخواتەوە، زۆر بە وردی لە کاتی وێنە کێشان دا تێبینیم دەکرد، هەموو لەشی خۆی دەدا بەسەر پەرە کەداو دایدەپۆشی سەری بەرز نەدەکردەوە، جار جار بە لایەکی چاو بە ڕاست و چەپی خۆی‌دا دەیڕوانی، زیاتر لە چارەکە سەعاتێك، توند قەڵەمەکەی لە پەرەکە توند دەکردو پەیتا پەیتا یەك خاڵ، یان یارنەییکی بچووکی ڕەش دەکردەوە.. بە دەستەکەی تریشی توند پشتی دەستەکەی تری دەخوراند تا خوێنی لێ دەهێنا، واتا هەموو بارە دەروونی‌یەکەی‌و هەڵچوونێکی لە ئازاردانی خۆی‌دا بەتاڵ دەکردەوە، جار جاریش سەیری دەکردم، خووا خووای بوو زووتر بچمە دەرەوە، زیاد لە منداڵەکانی تر گرنگیم پێ دەدا هەرچی‌یەکی لەسەر پەرە کاغەزەکە، دروست بکردایە.. گەر خاڵێك یا هێڵێکی بکێشایە، دەفتەری وێنە کێشانەکەیم بەرز دەکردەوەو نیشانی قوتابی‌یەکانم دەداو پێم دەگوتن چەپڵەی بۆ لێدەن، واتە سەر سورمانی خۆمم بەرامبەر بەوەی کە دروستی کردووە نیشان دەدا، وای لێهات خۆی هەرچییکی دروست بکردایە، دەستی دەجووڵاندو بانگی دەکردم و نیشانی دەدام، ئا بەم جۆرە مندالەکە لە خۆخواردنەوەو ترس و شەرمەکەی ڕزگاری بوو.



وێنەی ـ ١٣ ـ


ئەو سەرچاوانەی سوودم لێ وەرگرتووە..
١ ـ د. محمود بسیونی. اسس التربیه الفنیه. ط١ مطبعة دار المعارف بمصر ١٩٧٢.
٢ ـ د. علی کمال. النفس. ط٢. دار العربیه / بغداد ١٩٨٣.
٣ ـ د. محمود بسیونی. التربیه الفنیەو التحلیل النفسی. دار المعارف بمصر ١٩٧٢.
٤ ـ د. عطوف محمود یاسین. دراسات سیکولوجیه. ط١. بیروت ـ لبنان ١٩٨١.
٥ ـ د. فخری الدباغ. العلاج النفسی / انواعه، اسالیبه، مدارسه، موسوعة الصغیرة (٧٠). دار الجاحظ. ١٩٨٠.
٦ ـ د. مصطفیٰ حجازی. الفحص النفسانی. مبادئی الممارسة النفسانیة، تقنیاتها. خطواتها، واشکالها. دار الطلیعة بیروت ـ الطبعة الاولی ١٩٧٩.
٧ ـ محمد حسین جودی. الرسم والاشغال الیدویة في المدرسة الابتدائیة.
٨ ـ د. احمد عزت راجح. الامراض النفسیەو العقلیة اسبابها، وعلاجها واثارها الاجتماعیة.
٩ ـ د. مالك بدری. سیکولوجیة رسوم الاطفال.
اختیار رسم الانسان وتطبیقاتها علی اطفال البلاد العربیه. ط١. دار الفتح. بیروت ١٩٦٦.


ە

# چەند راو سەرنجێك دەربارەی نووسینی چیرۆك بۆ منداڵان

ئیسماعیل رۆژبەیانی

**لەبەر ئەوەی منداڵان ئاواتی دوا رۆژمانن. ئەستێرە گەشەی ئاسمانی ژیانمانن.. پارێزەری دەستكەوتەكانی خۆمان و باو باپیرانمانن.. پیاوی دوا رۆژی وڵاتن.. جا بۆیە هەر لە كۆنەوە لەم روانگانەوە تەماشاكراون (چی لەلایەن دایك و باوكەوە چیش لەلایەن مامۆستاو هونەرمەندو رووناك بیرەكانی دیكەوە)، لە پێناوی پەروەردە كرد نیشیان دا جۆرەها رێگای راست و لەبار گیراوەتە بەر. یەك لەو رێگایانەش ئەدەبە، بەتایبەتی چیرۆك «چونكە چیرۆك لە هەموو لقەكانی دیكەی ئەدەب زیاتر تەعبیر لە واقیع دەكات چی بۆ گەورە بێ چی بۆ منداڵ. جا بۆیە بەچاكترین هۆ دادەنرێت بۆ پەردە لابردن لەسەر نهێنی یەكانی ژیان.**

**هەر ئەم هۆیەشە وای لەم لقە ئەدەبی یە كردووە بەم پانتاییە بڵاو ببێتەوە.»[1]**

**من بە خۆم چارەكە سەدەیەك زیاترە مامۆستای سەرەتاییم لەم ماوەیەدا زۆر بە چاكی بۆم روون بۆتەوە ئەو وانانەی وا بەشێوەی چیرۆك ڤاڵایان دەكەمەوە گەلەك بە ئاسانی و پوختەیی لێی دەگەن، چونكە منداڵ زۆر بە تاسووقەی ئەوەوەیە گوێ رایەڵی چیرۆك بێ.**

**لەم كاتەش دا بە هەموو بیرو سۆزو هۆشی یەوە تێكەڵاوی رووداوەكانی دەبێت. هەر وەها لەگەڵ كەسەكانی نێو چیرۆكەكەش دا دەژێت، بە ئارەزوویەكی بە تینیشەوە** چاوەروانی ئەنجامی رووداوەكانی دەكات. جاری وا هەبووە لە گێرانەوەی چیرۆكێك دا نەگەیشتوومەتە ئەنجام كەچی زەنگی پشوودان لێی داوە بەڵام منداڵەكان بە ئیلحاحەوە ناچاریان كردووم بۆیانی تەواو بكەم.

**چۆن بیرۆكەی چیرۆكی منداڵان هەڵدەبژێرین ؟**

بیرۆكەی چیرۆكی منداڵان هەرچەندێ پتەوو شیاو بێ ناتوانێت نیشان بپێكێت ئەگەر لەلایەن یەكێكی شارەزاو و لێ هاتووەدا نەرێژرێت. «ئەوەیشی لەگەڵ منداڵ دا مامەڵەی نەبێت چی وەكو باوك و دایك چی وەكو مامۆستا ناتوانێت بە تەواوەتی بخزێتە نێو جیهانی منداڵانەوە، ئەم ئەركە گرنگەش بەزۆری مامۆستایانی منداڵان دەتوانن لێی سەركەوتووبن»[2]

چیرۆك نووسی سەركەوتوو ئەو كەسەیە بیرۆكەكانی لە واقیعی منداڵانی وڵاتەكەیەوە هەڵدەبژێرێت نەوەكو چیرۆكێك بهێنێتەوە بۆن و تامی نامۆیەتی بچێت بە گژ خوێنەرەكەیدا چونكە لەم حاڵەتەدا وەكو ئەوەی لێ دێت لە جیاتی شەمامە گوژاڵك یان بدەیت بەدەستەوە. دەبێ بیری چیرۆكی منداڵان لە حاڵەتە گشتی یەكانی مرۆڤایەتی یەوە وەربگیردرێت وەكو:

دۆستایەتی. خۆشەویستی (بەهەموو جۆرەكانیەوە).

پاڵەوانیەتی. ئازادی.. هتد»[3] چونكە چاندنی ئەم سیفەتانە لە دڵ و دەروونی منداڵ دا ئەنجامێكی ئیجابی دەبێت لە پاشە رۆژدا. «چیرۆك نووسی منداڵان دەبێت بیری چیرۆكەكانی لە ئەزموونی خۆیو رووداوە راستەقینەكانەوە هەڵبهێنجێنێت. هە،

وەها دەبێت مەبەستێکی لەدواوە بێ. کاتێکیش دەچێتە سەر کاغز پێویستە ببێت بە پردێك لە نێوانی واقیع و پاشە ڕۆژدا بۆ ئەمەش دەبێ لایەنی مرۆڤایەتی بەسەریدا زاڵ بێ وەکو: ڕاستگۆیی. دڵسۆزی. خۆشەویستی خاك و نەتەوە.»[4] لەگەڵ گشت ئەمانەش دا دەبێت لایەنی زانیاری‌و تەکنەلۆجیای هاوچەرخی تێدا لەبیر نەکرێت.

هەر وەها هەوڵی ئەوە بدرێت سوود لە کەلەپووری نەتەوەکەشمان وەربگیردرێت.

«دەبێت چیرۆك نووس بە شێوەیەکی وا چیرۆکەکانی بنووسێت ڕەنگدانەوەی ئارەزووەکانی ئەو کەسانەی تێدا بەدی بکرێت وا بۆیان نووسراوە (ئەم جۆرە نووسینانەش لە ئەنجامی هەڵبژاردنی بیرۆکەی چیرۆکەکەوە دیتە گۆڕی ـ نووسەر)[*] لەم بارەوە زەکریا ئامر دەڵێت:

«هەردەم هەوڵی ئەوەم داوە چیرۆکەکانم بکەم بە زەمینەیەکی پتەو بۆ ئەوەی منداڵ بتوانی بە سەریەوە خۆی ڕابگرێت تاوەکو بە هۆیەوە دۆست و دوژمنی خۆی لێك جیابکاتەوە.»[6]

**مەبەست لە نووسینی چیرۆکی منداڵان چی‌یە؟**

لەبەر ئەوەی منداڵ ئاوات و هیوای دوا ڕۆژمانە جا بۆیە دەبێت زۆر بەشارەزایی‌و هونەرمەندانەوە بە پیریانەوە بچین و دەستیان بگرین.. بۆ ئەوەی لە دەوروبەری خۆیان بگەن و زیاتر بخزێنە نێو ژیانەوە تاوەکو ئەزموونیان پتەوترو دەوڵەمەندتر بێ، هەڵبەتە ئەم شتەش فێری خۆشەویستی‌و برایەتی‌و دڵسۆزیان.. دەکات. ساغیش بۆتەوە ئەم سیفەتانە زۆر بەئاسانی بەهۆی چیرۆکەوە لای منداڵ دەروێت و پەرەش دەسێنێت.

مەبەستی سەرەکیش لە چیرۆکی منداڵان ئەوەیە منداڵ بە هۆیەوە پەی بەشتە نهێنی‌و شاراوەکانی دەورو بەری‌و جیهان دەبات.

ئەو مەبەستانەش وا لە پێناویان دا چیرۆکەکان دەنووسرێن لەم خاڵانەدا کۆدەبنەوە:

١ـ چونکە منداڵ هەڵگری ئومێدو ئاواتی دوا ڕۆژمانن.

٢ـ تاوەکو منداڵ فێری بەزەیی هاتنەوەو دڵسۆزی‌و ئازایەتی‌و سیفەتە باشەکانیان بکەین.

٣ـ تاوەکو بەهۆی ئەو نووسینانەوە منداڵ لە سیفەتە خراپەکان دوور بخەینەوە.

٤ـ أ ـ لەبەر ئەوە بۆیان دەنووسین تاوەکو نووسینەکانمان باڵا بە (ئاوەز. سۆز. هەڵچوون ویژدان. زمان. جوانی.. زەوق...) یان بکات

ب ـ بۆیە بۆیان دەنووسین تاوەکو بتوانین بە هۆی نووسینەکانمانەوە ئەو بەهرانەی وا هەیانە دابتاشرێن و بتەقنەوە.

جـ ـ نووسینەکانمان دەبێت ڕایان بهێنێت لەسەر ئەوەی چۆن چێژ لە جوانی (الجماليات) وەردەگرن»[7]

**بۆچی منداڵ چیرۆکی بەلاوە خۆشە؟**

منداڵ زۆر حەز بە (گوێ گرتن ـ خوێندنەوە)ی چیرۆك دەکات. بەویێ وەکو خواردن ڕۆژی سێ جەم بگرە زیاتریش بە چیرۆکی خۆش و بەتام بیروهۆشی پاراو بکرێت. من ئەم دیاردەیەم زۆر بەزەقی بەلای منداڵانەوە تێبینی کردووە، جا بۆیە هەمیشە هەوڵم داوە دڵ و دەروونی (قوتابیەکانم هەر وەها منداڵەکانی خۆمیش) بەم جۆرە چیرۆکانە فێنك بکەمەوە. ڕاکردن و پەرۆش بوونی منداڵ بەدوای چیرۆك دا دەگەڕێتەوە سەر یەکێك لەم هۆیانە:

١ـ ئارەزووی پەی بردن بەشتە نهێنی‌یەکان.

چیرۆك بەلای منداڵەوە وەکو جۆرە کلیلێکی ئەفسووناوی وایە بە هۆیەوە دەتوانێت دەرگای کۆشکە تەلیسماویەکان بکاتەوە. کاتێ ئەو دەرگایەشی بۆ دەکرێتەوە ئیتر بە جوانی شتە سەیرو نهێنی‌یەکانی ئەو دیوی دەرگاکانی بۆ ڕوون دەبێتەوە. لەوانەیە چاوی بەشتی وا بکەوێت لەمەڵبەندەکەی خۆیدا نەبێت، جا بەم پێیە دەتوانین چیرۆك بەسەرچاوەی تێرکردنی ئارەزووەکانی منداڵ دابنێین. هەروەها هاندەرێکی فرە کاریگەریشە بۆ فێر بوون و شارەزایی.

٢ـ چڕ بوونەوەی خەیاڵ:

منداڵ بۆیە حەز بە چیرۆك دەکات و مێشی ئارەزووی بەدەوری شیلەیدا گێنگڵە دەکات چونکە لەم جیهانەدا (جیهانی چیرۆکی منداڵان) بوارێکی فرەوان بەدی دەکات بۆ فڕینی مەلی خەیاڵی.

٣ـ منداڵ بۆیە حەز بە چیرۆك دەکات چونکە هەست و سۆزی دەبزوێنێت. چیرۆکی سەرکەوتوو وەکو ئەو پەنجە ناسك و شارەزایەیە وا تەلی هەست و سۆزی منداڵ دەبزوێنێت و زۆر بە باشیش تێکەڵی ڕووداوەکانی نێو خۆیی دەکات. لەگەڵ خۆشی‌و سەرکەوتنی چیرۆکەکەدا دڵەفرکێی شادمانی پێدەکەوێت. لەگەڵ ناخۆشی‌یەکانیشیدا سیمای دەگۆڕێت.

جاری وا هەبووە لەکاتی گێڕانەوەی چیرۆکێك دا چەند قوتابی‌یەك کانیاوی چاوەکانیان تەقیونەتەوەو دەستیان کردووە بە گریان. یا بە پێچەوانەوە بە پێکەنین و چەپڵەلێدان پاڵەوانی چیرۆکەکەیان پێشوازی کردووە.

٤ـ مندالّ بۆیە چیرۆکی خۆش دەوێت چونکە بە هۆیەوە شارەزاییەکی باشی دەست گیر دەبێت دەربارەی خورسکی ئەو شتانە وا لە ژیان دا هەیە.

**«چیرۆك چی سوودێك بە مندالّ دەگەیەنێت» ؟**

چیرۆکی باش و سەرکەوتوو ئەم سوودانەی لای خوارەوە بە مندالّ دەبەخشێت:

١ـ مندالّ ئەگەر هات و بەهەمەوو هەست و نەستییەوە تێکەلاّوی چیرۆکێك بوو ئەوە دەتوانێن خودی خۆی لە تۆولۆی ئەو چیرۆکەدا بدۆزێتەوە، چونکە لەم حالّەتەدا هەنگاوی پڕ لە جورئەت دەهاوێت بۆ پێشەوە. ئەمەش ئەوجۆرە چیرۆکانە دەتوانن بە دییبهێنن وا بەشێوەیەکی هونەریانە دادەرێژرێن. لەم حالّەتەش دا مندالّ (خوێنەری چیرۆکەکە) بەرەو جیهانێکی پڕ لە خەیالّ بالّ دەگرێتەوە.

٢ـ چیرۆك هۆیەکی گەلەك گرنگە بۆ تێرو تەسەلا کردنی ئارەزووی یاریکردن بەلای مندالّەوە چونکە دەتوانرێت ئەو چیرۆکانە بکرێن بەیاری. بۆ نموونە کاتی چیرۆکی (تیشك)م[8] بۆ کورە بچووکەکەم خوێندەوە ئەو یەکسەر هەستا ئاوێنەیەکی گرت بە دەستەوەو دەستیکرد بەتیشك هاویشتن بۆ نێو ئەو ژوورەی وا لێی دانیشتبووین.

٣ـ مندالّ بەهۆی چیرۆکەوە شارەزاییەکی چاکی دەست دەکەوێت لەبارەی کەلەپووری میللەتەکەیەوە. هەر ئەم شارەزاییەش دەبێتە کلیلێك و دەرگای نهێنییەکانی دەوروبەری بۆ دەکاتەوە. جا بەم شێوەیە پەردە لەسەرئەو کارە مەزنانە لادەبرێت وا پێشینان پێی هەستاون.

٤ـ چیرۆکی سەرکەوتوو دەبێتە کۆترێك و ئەو مندالّەی وا دەیخوێنێتەوە یا گوێی لێ دەبێت بەسەر بالّەکانیەوە گەشتی پڕ خەیالاّوی خۆی ئەنجام دەدات.

٥ـ مندالّ بەهۆی چیرۆکەوە هۆشیاری پەرە دەستێنێت و مێشکی دەکرێتەوە چونکە ئەو وشەو زاراوە تازانە وا بۆ یەکەم جار گوێی لێدەبێت دەبنە چەند مەلۆیەك و دەخرێنە سەر فەرهەنگی قسەکردن بەلایەوە.

٦ـ چیرۆك بەیەکێك لەو هۆیانە دەژمێردرێت وا بیرو هۆشی مندالّ دەورووژێنێت بۆ پەی بردن بەشتە شاراوەکانی دەوروبەر «چونکە مندالّ زۆر بەسووکیو ئاسانی دەچێت بەرەو گۆرانکاری.

جا ئێمەش دەبێت شتێکی وا بکەین رەوتی ئەو چوونەی بەرەو سەرکەوتن بەرین تاوەکو توانا جۆراو جۆرەکانی دەست بکەن بە نماو گەشەکردن.»[9]

٧ـ لەبەر ئەوەی چیرۆك بەسودترین خواردەمەنی زانراوە بۆبیرو هۆشی مندالّ جا بۆیە دەبێ چیرۆکەکانیان لە [illegible] و خەیالّیانەوە نزیك بێ بۆ ئەوەی وەکو شەمالّێکی بێ گەرد چاوی خەوا لّوویان بکاتەوە.

٨ـ لەبەر ئەوەی چیرۆك شانەکانی تێگەیشتنی مندالّی پێ پەروەردە دەکرێت ئیتر بە هۆیەکی پیرۆز دەزانرێت بۆ ئەو مەبەستە.

٩ـ نووسینی چیرۆك بۆ مندالاّن فێری خوێندنەوەی بەر دەوامییان دەکات. «ئاشکراشە ئەم خوێنەرە بچووکانەی ئەمرۆ خوێنەری گەورەی سبەو دوون. خووگرتنیش لەسەر خوێندنەوە لە خوێندنەوەی مندالاّنەوە دەست پێ دەکات.»[10]

**«زەمانی نووسین لە چیرۆکی مندالاّن»**

ئێمە کاتێ بۆ مندالاّن دەنووسین پێویستە لەسەرمان ئاگامان لە هەست و نەستیان بێ.. سۆزو ئارەزوویان پێ شێل نەکەین. دەبێت نووسینەکانمان بەو زمانە سادەو بێ گرێیە بن کە مندالاّن لە نێو خۆیان دا قسانی پێدەکەن. هەر وەها دەبێت لە هێنانەوەی وشەو زاراوەی ناوچەیی دووربکەوینەوە.

هەولّی ئەوەش بدەین بەو جۆرە بۆیان بنووسین وا لە کتێبی قوتابخانەکان دا پەیرەوی دەکرێت.

«وێرای ئەمانەش دەبێ دوور بێ لە هەلّەی زمانەوانیو رێنووسی.»[11] مەبەستی سەرەکیش لێرەدا ئەوەیە مندالّ بە کوردییەکی خاوێن قسە بکات و بنووسێت.

ئەو چیرۆکەیشی بۆ مندالّ دەنووسرێت نابێت شل و شاویو درێژدا دری تێدا بەدی بکرێت.

هەروەها «لەکاتی نووسین دا بۆ مندالاّن گەرەکە:

١ـ سەیری سامانی زمانەوانی مندالاّن بکرێت و ئەوەی تێی دەگەن و زۆرتری بەکار دەهێنن ئەوان هەلّبژێردرێن.

٢ـ زیاتر ئەو وشەو رستانە بەکاربێت کە وشەگرانەکان بۆ قۆناغی دواتری پێگەیشتنیان هەلّبگیرێت.»[12] ئەو چیرۆکەی وا بۆ مندالّ دەنووسرێت دەبێ ئەوەندە جوان و بریقەدارو پڕ واتا بێ لەدور را پەپوولەی ئارەزووی مندالّ راکێش بکات «ئەمەش لە کاتێك دا دێتە دی چیرۆکەکە بێ گرێو گۆلّ بێ بۆ ئەوەی رامان و تێفکرینی مندالّە خوێنەرەکە بەرەو ئاسۆیەکی رووناك پەل کێش بکات.»[13]

**«جۆرەکانی چیرۆکی مندالاّن»**

چیرۆکی مندالاّن بە پێی قۆناغەکانی تەمەنیان دەگۆرێت. جا بەم پێیە دەتوانین چیرۆکەکانیان بکەین بەم بەشانەوە:

١ـ قوناغی (٣ـ٥) سالّی:

لەم قۆنــاغــەدا ئەو چیرۆکـانــە بۆ منـدالآن دەنـووسرێت یا دەگــێردرێتــەوە وا منـدالّ پالّەوانەکەیی بەلاوە ئاشنایە وەکو: چیرۆکی پشیلە و مشك. مریشك چوّلّەکە.
بووکە شووشە...

٢ـ چیرۆکەکانی قۆناغی (٥ـ٩) سالّی.
لەم تەمەنەدا مندالّ زیاتر حەز بە چیرۆکی خەیالّی دەکات وەکو: دیو و درنج. ئەسپی بالّدار. ئونگوستیلەی سیحری. لەگەلّ ئەم چیرۆکانەدا خەیالّی بالّ دەگرێت و دەکات بەدورگەی مەبەستی. لێرەدا دەبێ مندالّ تێ بگەیندرێت کەوا ئەم جۆرە چیرۆکانە لە راستی‌یەوە دوورن.
٣ـ چیروکەکانی قوناغی (٩ـ١٢) سالّی
لەم قۆنــاغــەدا مندالّ هەست بەهێزو توانای خۆی دەکات جا بۆیە دەبێت چیروکەکانی ئەم قۆناغە بریتی‌بن لە:
أـ چیرۆکی پالّەوانیەتی: وەکو باس کردنی ئەو پالّەوانانەی وا جۆرە ئیشێکی مەزنیــان راپەراندووە وەکو: «دوانزدە سوارەی مەریوان شیخ محمودی نەمر ـ رۆستەمی زالّ..)
ب ـ چیرۆکی مێژوویی:
کردنی مێــژوو بەســەرچــاوەو هامیــانی چیرۆك لەم قوناغەدا مەرجێکی سەرەکی‌یــە بۆ ئەوەی نەوەی ئێستــامــان لەگــەلّ مێژووی دێرینمان دا پەیوەندی‌یەکی نەپچراوی هەبێت.
وەکـو «مێــژووی خانی لەپ زێرین و قەلآی دەمدم خانزاد و لەشکری.. پاشای رەواندووزو جەنگەکانی لەگەلّ دەولّەتی عوسمانی‌دا ...هتد»
٤ـ چیرۆکەکانی قۆناغی (١٢ـ١٥) سـالّی
چیروکەکانی ئەم قۆناخەش دەبێت بەدوو بەشەوە:
أـ چیروکی زانیاری: وەکو چۆنیەتی گەیشتنی مرۆڤ بەمانگ و ئەستێرەکان. دۆزینەوەی هێزی کارەبا..
ئەمانەو گەلێشتی تری لەم چەشنە.
ب ـ چیرۆکی ئەنـدیشــە (الخیال). مندالّ لەم قۆناخەدا گەلێ پێــویستی بەم جۆرە چیرۆکانە هەیە چونکە لەوەتی بیروهۆشی چوزەرە دەکێشێت دەست دەکـات بە بیرکردنەوە لە چۆنیەتی نهێنی‌یەکانی دەورووبەری هەر چەندیش دەکات ناتوانێ وەلام ەٚ ئەو پرسیارانە بدۆزێتەوە وا لەناخی‌دا ئەوتیان خواردوّتەوە.
«بــەلام کاتێ ئێمــە بەهــۆی چیرۆکی خەیالّی‌یەوە کەروێشکی خەولّی د‌وتووی بیرو هۆشی وریا دەکەینەوە ئیتر رۆژ بەرۆژ ئەم جیهــانــەی لە پێش چاو تازەتر دەبێتەوە. هەر خەیالّیشە هێز دەخاتە مۆخـ ئیسکە نەرمەکانیانەوە. بۆ ئەوەی بتوانێت پەی بەنهێنی‌یەکانی گەردوون و دەورو بەریان بەرێ‌و گۆرانیان پێدا هەلّدات»[١٤]
٥ـ چیرۆکەکانی قۆناخی (١٥) سالّی واتە قوناخی هەرزەکاری.
لەم قونــاخــەدا منــدالّ ئەو منـدالّەی جاران نامێنی بەلّکـو فسیولۆجیەتی بەتەواوەتی دەگۆرێ. بەزۆریش حەز لە چیرۆکی دلّداری دەکات. جا پێویستە ئەو چیرۆکانەی وا بۆ ئەم قۆناخە دەنووسرێن تەعبیر لە خۆشەویستی پاك و خاوێن بکەن.
«وێرای ئەمەش دەبێ کەلەپوور بکرێت بەهامیانی چیرۆکی ئەم قۆناخە بەزووریش هەولّ بدرێت..
چیرۆکــەکــانی ئەم قۆناخە بەهامیانی برایەتی‌و خۆشەویستی بناسێندرێت بۆ ئەوەی خوێندرەکەی بتوانێت بەرانبەر زولّم و زۆرداری بەرانگار ببێتەوەو شانیش بدات بەشانی حەقەوە.»[١٥].


پەراوێزەکان

١ـ الدکتور. رشاد رشدی ـ فن القصه القصیره. ط[٢] دار العوده ـ بیروت ـ ١٩٧٥. ص (١٤).
٢ـ لورنس. جی. توماس ـ معنی التقدم في التربیة التربیة والاشراف ١٩٤٦ـ٣٩٩١/
٣ـ اسمــاعیـل رۆژبەیانی ـ کۆمەلّە چیروکی (شەمشەمەکوێرە) چاپخانەی ئەمانەتی گشتی رۆشبیری و لاوان ـ ١٩٨٨
٤ـ دکتور / عمر الطالب القصه القصیره الحدیثه في العراق مطبعة مؤسسه دار الکتب للطباعه و النشر ـ جامعه الموصل ١٩٧٩ ص (١١١).
٥ـ الموسوعة الصغیره (١٣٩) القصه البولیسیه ـ ترجمه / الدکتور علي القاسمي ـ دار الحریه للطباعه بغداد ١٩٨٤. ص (٢٣)
٦ـ د. عبدالعزیز المقالح ـ الوجه الضائع ـ دراسة عن الادب و الطفل العربي / طبع بمطابع دار الشؤون الثقافیة العامه وزاره الثقافه والاعلام ـ بغداد ـ ١٩٨٦ ص (٣١)
٧ـ محمد مصطفیٰ یحییٰ ـ المعلم الجدید ـ الجزء الثاني مایس ـ ١٩٧٤ ـ ص (٢٢).
٨ـ اسماعیل رۆژبەیانی ـ کۆمەلّە چیروکی شەمشە کوێرە.
٩ـ دي. جی. کورنورو ـ مقدمة في فلسفة التربیه ـ ترجمه . د. محمد سیف الدین فهمي ـ ص (١٢٩ ـ١٣٩)
١٠ـ د. عبدالعزیز المقالح ـ الوجه الضائع.
دراسة عن الادب و الطفل العربي ـ طبع ف مطابع دار الشؤون الثقافیه العامه ـ وزاره الثقافه و الاعلام ـ بغداد ـ ١٩٨٦ ص (٣١)
١١ـ د. عمر الطالب ـ القصه القصیره الحدیثه في العراق. ص (١١١)
١٢ـ عبدالرزاق بیمار ـ سەرەتایەکی ئەدەبی مندالآن نووسەری کورد ژماره (٣) ١٩٨٣ ل (٢٣)
١٣ـ ابراهیم عبدالله غلوم ـ القصه القصیره في الخلیج العربي الطبعة الاولیٰ ـ مطبعه الارشاد ـ بغداد ـ ص ٣٧٧ سنه الطبع غیر موجود.
١٤ـ ماریان بیسر ـ التنشئة العلمیه ـ ترجمه محمد سلیمان الدار المصریه للتألیف و الترجمه ـ القاهره ـ ١٩٦٦ ص (٤١)
١٥ـ هادي نعمان الهیتی ـ
ادب الاطفال ـ فلسفته ـ فنونه ـ وسائطه منشورات وزاره الاعلام ـ دار الحریة للطباعه ـ بغداد ١٩٨٧ ص (١٩٨).
١٦ـ ئەزموونی (٢٧) سالّی مامۆستایەتی خۆم.




# كاروان



مجلة ثقافية شهرية تصدرها الامانة العامة لادارة الثقافة والشباب باللغتين الكردية والعربية

رئيس التحرير
حكمت حاجي سليم

نائب رئيس التحرير
حسين رشواني

٨٩

ايلول / تشرين الاول
١٩٩٠

السنة التاسعة

الثمن «٥٠٠» فلس


في هذا العدد


كلمة العدد
وابتدأت المنازلة الكبرى — رئيس التحرير — ١٠٢

عودة الحقائق
عراقية الكويت بين المنطقية التأريخية والجغرافية — اعداد مجلة كاروان — ١٠٥

احاديث من القلب
المبادرة الحل . المجزرة الجريمة
الأطفال أحباب الله والقائد — بقلم سەرکەوت — ١١٢

مسرحية كردية مترجمة
قضية الرحيل واللارحيل — تاليف واخراج احمد سالار — ترجمة كمال غمبار — ١١٦



العنوان: اربيل — الامانة العامة لادارة الثقافة والشباب مجلة كاروان: هاتف — ٢٠٨٨٢


● المقالات التي لاتصلح للنشر لاتعاد الى كاتبها.



# وابتدأت المنازلة الكبرى

بقلم : رئيس التحرير

« اننا لن نسمح لكائن من يكون أن يخنق بالطوفان شعب العراق من غير أن يختنق.. واذا ما شعرنا بان شعب العراق يختنق.. وهنالك من يوجه له ضربة دموية فاننا سنجعل كل المسببين يختنقون وستصبح ارض النفط في السعودية وغيرها من دول المنطقة.. وكل منشآت النفط غير قادرة للاستجابة لطلبات الذين جاؤا الينا محتلين يستحوذوا على سيادتنا وكرامتنا وثروتنا.. وسيشمل «اسرائيل» ما يشمل تلك الديار التي تربع فيها السوء والمحتلون ولم يبق فيها من هو طاهر غير المقدسات والخيرين الذين يرفضون هذا الظلم والعدوان..»

من بيان الاجتماع المشترك لمجلس قيادة الثورة
والقيادة القطرية لحزب البعث العربي الاشتراكي
في ٢٣ / ايلول / ١٩٩٠

المنازلة الكبرىٰ التي ابتدات بين الجمع المؤمن كله ممثلاً بالعراق المتوحد الصابر الصامد.. وبين الجمع الكافر كله ممثلاً بامريكا وحلفائها الاطلسيين.. واذنابها من الملوك والحكام العرب المتساقطين هذه المنازلة الكبرىٰ تعني اول ما تعني جملة حقائق مهمة لا بد من الوقوف امامها.. وهي:

★ ان العراق قد بدأ الصحوة الكبرىٰ التي اخافت المستعمرين الصهاينة.. فاندفعت في طريق تحجيم دوره وابقائه في خانة الضعفاء.

★ ان العراق قد تجاوز الخطوط الحمراء التي رسمتها امريكا وبقية حلفائها.. وطلبوا من دول العالم الثالث عدم تجاوزها فتجاوزها العراق فحق عليه في شرعة امريكا العقاب.
★ ان العراق صار يتبع نهجا تنموياً ضخماً يعوض عن كل فرص الضياع في حياته السابقة مما افزع امريكا من بروز قوة دولية جديدة تمتلك التطور والتقنية الحديثة.
★ ان العراق امتلك قراره السياسي والحياتي واختار المسار الحر المتمرد في سلوك الحياة مما افزع الصهيونية وامريكا من بروز هذه القوة التي ستكون بؤرة للتمرد وقدوة للشعوب الاخرى.
★ ان العراق امتلك ناصية العلم.. فراح يطور قدراته ويدخل عوالم التقنية المتقدمة مما يفزع امريكا من بروز هذه القوة الدولية الجديدة المهددة لاطماعه الاقتصادية المستمرة.

★ ان العراق ومن خلال انتصاره في القادسية الثانية.. قد امتلك ناحية القدرة الدفاعية وحقق لنفسه قوة ردع متكاملة متناهية متقدمة تمتلك الخبرة والجرأة والتخطيط. بما يجعل العراق في استعداد دائم ضد محاولات العدوان الاسرائيلي الطامع الى مد حدوده الى (الفرات) شرقاً والى (النيل) غرباً.. فكان لا بد من (تحجيم قوته).
★ ان العراق وقد برزت فيه قيادة تأريخية جريئة وعقلانية ووطنية وقومية مؤمنة وحريصة ونزيهة وحكيمة ممثلة في القائد الرمز صدام حسين.. يعني ظهور قيادة ستكون الراصد لكل مخططات الامتداد والتوسع وهو ما ترفضه امريكا والصهيونية.
★ ان العراق بقدرته العسكرية.. وامكاناته البشرية والمادية.. وستراتيجيته المستقبلية يريد ان يحقق التواصل مع عمق الاصالة التأريخية.. وعمق الاستشراق المستقبلي بماخلق الدولة الجديدة النموذجية المتطورة المتقدمة المؤهلة لقيادة جمع الامة.. ورفع الانقاض عن التحجر والتقوقع والبقاء في خانة الاستجداء من الاجنبي.. وطبيعي ان تطوراً مثل هذا يحققه العراق ترفضه امريكا.. وحلفاؤها.. والصهيونية من هنا كان سعار امريكا شديداً ضد العراق.. وبدأت خطط العدوان تترى ضد العراق.

**حتى اذا ما اقدم العراق على خطوته الوطنية والقومية في اعادة (الفرع) المسلوخ من الوطن (الكويت) الى (الاصل والام) العراق.. بدأت الفرصة مواتية لامريكا وبمباركة وتشجيع المتساقطين والخائنين والخائفين على عروشهم وتيجانهم ومناصبهم..**
**وبين ليلة وضحاها.. وحتى قبل ان يصدر مجلس الامن اي قرار كانت قوات الغزو الامريكي والبريطاني تصل ارض الجزيرة العربية بحجة واهية.. وهي الدفاع عن (ملك) آل (سعود !!) الخونة.. مدنسين اقدس المقدسات المسلمين.. وبيت الحرام وقبر الرسول الكريم (ص).**

اذن.. فالمنازلة قد بدأت.. وقد اختار الامريكان وبوش توقيتها فالعراق الذي مارس حقه في توحيد ارضه ووطنه.. ولم يعتد على احد.. ولم يرسل جيوشه الى بلدان احد كائن من كان.. لكنه الشرك والكفر والخيانة توحدت كلها..

**فكانت غزواً ضخماً..**
**وحصاراً شديداً..**
**وتهديداً مجنوناً..**

لكن امريكا نسيت عن غباء او جهل او تقصد ان منطق العصر والقرن والزمن قد عفا عن عنجهية عصر وزمان كانت الاعتداءات العسكرية وسياسة الاحتلال هما صولجان النجاح ان نهاية القرن العشرين ليس كبدايته.
وتسعينات القرن العشرين ليس كعقوده الاولى يوم زحف بيرسي كوكس والجنرال مود والجنرال غورو وغيرهم على العراق وسوريا فاحتلوها وفعلوا ما طاب لهم فعله..
تسعينات القرن العشرين.. وبالنسبة للعراق يشهد جملة مستجدات وحقائق منها.
★ ان في العراق قائداً استجمع كل شروط القيادة الحكيمه والناجحة والجريئة.
★ وان في العراق شعباً واعياً ومدركاً ومقتدراً استطاع ان يبعد

عدواناً امتد ثماني سنوات وخرج منها منتصراً.

★ وان في العراق جيشاً مدرباً متكامل الاعداد والتسليح يمتلك القدرة والخبرة والمقدرة والعدد والتسليح والتعبئة بما يمكنه من تحقيق النصر.

★ وان في العراق ارادة جبارة لا تقهر من حيث التحمل والصمود والجلد وروح المنازلة.

★ وان العراق قد صار ضمير الامة وقدرها.. وقدوتها.. واملها في تفجير الصحوة العربية التقدمية.

★ وان العـراق صار بؤرة الاحـرار.. وصوت الحق.. ولسان المستضعفين.. وامل فقراء وكادحي العالم الثالث بشكل خاص..

★ ان العراق تحكمه خيارات الحرية والمبادئ والمنطق الحق.. في الايمان بحق الشعوب في بناء قدراتها.

★ وان العراق هو امل الامة في استرجاع الحق المغتصب في فلسطين.. وتحريرها.

**من هنا كانت جموع الظالمين والمعتدين والغزاة والغاصبين والمتخلفين والخونة والعملاء.. لذلك..**

**فان المنـازلة الكبرى بين العراق من جهة وكل قوى الشر والعمالة والخسة والاطماع من جهة اخرى صارت تعني.**

★ منازلة بين الروح التي يمثلها العراق واعادة التي يمثلها الغزاة.

★ ومنازلة بين الحق الذي يحمل العراق لواءه وبين الباطل الذي تتزعمه امريكا وبريطانيا ودول الحلف الاطلسي..

★ ومنازلة بين الجمع المؤمن في العالم بقيادة العراق.. والجمع الكافر الذي تمثله امريكا.. ورئيسها بوش.

ولقد امتدت المنازلة.. واتخذت اشكال متعددة.. بعض مظاهرها.

★ قعقعة السلاح بكل انواعه تتصاعد من ارض نجد والحجاز.

★ التهديد المتصل بغزو العراق عسكرياً وبضربة (صاعقة)

★ الحصار الاقتصادي الشديد على العراق.. المؤمن الصابر المجاهد.. حتى وصل الحصار لمنع الدواء وحليب الاطفال.

لكن....

لكن الله الذي اختار هذه الامة لتكون شاهداً على الانسانية والحقيقة التي تجسد العمق الحضاري لشعب العراق الممتد في احقـاب الزمن والقـدر الذي حمله الله لهـذة الامة.. ولشعب العراق منها بوجه خاص لتلعب دورها القائد دوماً.

كل ذلك يرسم التهديدات الاكيدة والمحتومة من ان المنازلة لن تقود الا الى نصر العراق وقائده.. والعراقيين وارادتهم.

ان امريكا في سلوكها البشع والحقير والاثم في استمرار تهديدها للعـراق.. وفي تشـديد حصارها لتجويع شعبه.. وقطع الدواء والغذاء عنه فأنما ترتكب اثماً وفعلاً شنيعاً لم تعرفه الانسانية من قبل ابداً...

لذلك.. وايمـاناً بالله والقائد المنصور صدام حسين.. والوعد الالهي للمؤمنين بالنصر نرى الافق يزهو امامنا..

فالتاريخ سيكتب صفحات خوالد لكل الرجال والنساء العراقيات الذين يقفون صفاً منيعاً ضد الغزو والغزاة..

والتأريخ سيسجل بطولة اطفال العراق الذين رفضوابشهامة ان يستجدي اباؤهم الحليب لهم من الكفرة والفجار..

وسيهـزم شعب العراق كل الطغاة وسيسقطون (اسطورة!!!) الدولة (العظمى!!) عن امريكا قائد جمع الشر والغزو والسرقة والعدوان.

★★★★★★★

**اما العراق..**

**فله :**

**★ اله واحد احد يحميه ويمده بجند من عنده**

**★ وقائد فذ شجاع متمرس مؤمن يقود معركته الى النصر**

**★ وشعب.. وتاريخ.. وماض.. وتراث.. ومستقبل.**

**اما اعداء العراق..**

**فلهم :**

**★ امريكا وحلفاؤها الغزاة والعار والخزي والهزيمة.**

**★ الحكام الخـونـة من ملوك ورؤسـاء وامـراء، والعار والسقوط تحت اقدام جماهير بلادهم.. يوم ينبلج الصباح والفجر المتألق..**



عودة الحقائق

# عراقية الكويت بين المنطقية التأريخية والجغرافية

## اعداد مجلة كاروان

(استمر أعمال مؤتمر العقير عام (١٩٢٢) اسبوعاً كاملاً دون التوصل الى صيغة واضحة مما حدا بالسير (برسي كوكس) المقيم السياسي البريطاني في الخليج العربي ان يحدد بنفسه الحدود.. حيث فتح خارطة الخليج والجزيرة العربية وأخذ بيده قلماً احمر ورسم عليها خطاً للحدود يبدأ من الخليج العربي الى جبل عنيران.. وبرسم هذا الخط الاحمر اقتطع من العراق ارض الكويت..
والى الغرب والجنوب من مدينة الكويت رسم منطقتي حياد سميت الاولى منطقة الكويت الحيادية.. وسميت الثانية منطقة العراق الحيادية..)

من كتاب تاريخ الكويت السياسي
للسيد حسين خلف الشيخ خزعل
ص ١٤١ الجزء الخامس / القسم الاول..
طبع دار الكتب بيروت / ١٩٧٠

**الوعد الملعون**

هو وعد اعطته بريطانيا لعائلة الصباح بناء على ما قدموه لها من خدمات.. وتأييدهم المطلق للقوات البريطانية وهي تجتاح العراق في بداية الحرب العالمية الاولى..
وهو وعد وتعهدات قطعتها بريطانيا على نفسها بمكافأة اسرة الصباح، وتشكيل كيان هزيل لهم ضمن محمياتهم لقاء ما قدمته هذه الاسرة من خيانة للامة وتسهيل مهمام القوات البريطانية في احتلال مناطق الخليج.. ثم الوصول الى الفاو.. والبصرة.. وامتداداً منها الى العراق وارجائه الاخرى..
لقد تنازلت الدولة العجوز (الدولة العثمانية) بعد هزيمتها في الحرب العالمية الاولى ١٩١٤ ـ ١٩١٨ عن كل ما لها من حقوق وامتيازات وسيادة على المناطق العربية لبريطانيا وحلفائها وبموجب معاهدة لوزان ومن جملة ما تنازلت عنه العراق (والكويت من ضمنه باعتباره احد اقضية ولاية البصرة) وبموجب تقسيمات معاهدة سايكس بيكو السرية في تقسيم املاك الامبراطورية العثمانية بين انكلترا وفرنسا..
لذ لك فقد اندفع آل صباح في اظهار ولائهم لبريطانيا.. واعطائها التعهدات بالبقاء خدماً طائعين لها من اجل فصل منطقتهم عن العراق وتنصيبهم حكاماً عليها..
لقد كانت عقدة بريطانيا.. ورغم انها احتلت العراق وكانت تحكمه بالاحتلال ثم بالانتداب كانت العقدة ان العراق غير مضمون الولاء لها.. رغم النظام الملكي الذي جاءت به... والمعاهدات التي كبلته بموجبها..
فبريطانيا لا تنسى مقاومة العراقيين الشرسة والصعبة لمحاولات احتلالها للعراق.::: وبريطانيا لاتنسى خسائرها الكبيرة جراء الثورة العراقية (حزيران ١٩٢٠) تلك الثورة التي افزعت بريطانيا.. بعد أن اثبت لها العراقيون انهم شعب لا يقبل الاحتلال..
لذلك فان فكرة ايجاد قاعدة محمية لهم ـ محسومة الولاء.. وتبقى دملة في الجسم العراقي امر مطلوب حسب وجهة نظر الاستعمار البريطاني من هنا كان مؤتمر العقير (١٩٢٢) الذى حضره ممثل عن العراق والملك عبدالعزيز السعود نفسه بينما لم يحضره عن اسرة الصباح احد بل حضر عن الكويت الوكيل




# ■ كانت الكويت جزءاً من العراق منذ القدم ■

السياسي البريطاني.. اذ كانت الكويت قد اعلنت محمية بريطانية وبموجب هذه الحماية فليس لال صباح حق التصرف بالشؤون الخارجية..

وهكذا شكل الانكليز تشكيلاً هزيلاً لكيان مقتطع من العراق مكافأة لال صباح.. وفي هذا يقول المؤرخ الفرنسي (جان جاك بيرى) في كتابه (الخليج العربي) ترجمة نجدة هاجر والمطبوع في بيروت عام ١٩٥٩ «انه لولا وعود بريطانية لظلت الكويت على حالها جزءاً لايتجزءا من الاراضي العراقية..»

لكنها بريطانيا التي (ما تقاتلت سمكتان في عمق البحر الاوكان السبب بريطانيا) كما يقول الزعيم الهندى الخالد (غاندى)

هذه الخدمات استمرت من آل صباح للانكليز.. حتى يومنا هذا.. وهكذا رأينا الجيش البريطاني يهرع (لحماية) اسرة الصباح عام ١٩٦١ حينما اعلن العراق حقه في الكويت..

ويبقى ولاء حكام الكويت لبريطانيا.. حتى اذا ما برزت امريكا في الميدان.. بدأ الولاء تتقاسمه الدولتان.. ثم زاد الولاء لامريكا.. بفضل الخدمات (الخاصة) التي قدمها احمد جابر الصباح (لبوش) في مشاريعه (المالية) وفي (حملته الانتخابية).. من هنا كانت الخطوة الحمقاء والمجنونة من بوش في خيبة امله وهو يرى (ازلامه) في الكويت تخسف بهم الارض في لحظة ثورية ما كان يحسب حسابها..

لقد ازداد تمسك بريطانيا بوعودها لحكام الكويت بعد اكتشاف النفط فهي في بداية ارادت (كيان الكويت) مخفراً «متقدماً» لها على الحدود التي رسمها بيرسي كوكس في لحظة غضب بالقلم الاحمر.. لكنها صارت منبع نفط لايجب التفريط به..

من هنا.. وعودة الى متابعة مراحل (نشوء !!) هذا الكيان الذي ارادته بريطانيا (دملة) في الجسم العراقي، هو امر

مطلوب.. فلنتابع الاحداث اذن..

## الكويت العراقية

عراقية الكويت لا جدال فيها.. وهي مسألة محسومة.. فعلى مرعصور التأريخ كانت الكويت بقعة من بقاع ارض العراق وكانت جزءاً منه..

فالعراق.. او بلاد ما بين النهرين كما عرف سابقاً امتداد طبيعي من اقصى شماله حتى يصل الخليج.. هذه الحقيقة المنطقية تمتد من عهود الاشوريين والبابليين حتى الفتح الاسلامي.. ثم امتداداً الى اوائل هذا القرن.. حيث بدأ الاستعمار الغربي يعمد الى ايجاد مواطئ اقدام له في هذه المنطقة التي عرفت دوماً باهمية موقعها.. وتوقع اكتشاف كنوزها المعدنية..

## عراقية الكويت تاريخياً..

لقد كانت المساحة التي ضمت الكويت جزءاً اصيلاً من العراق ولقد عثرت البعثات الاثارية التنقيبية على العديد من الاختام الاسطوانية التي تحمل علامات عراقية تعود الى العهد الاشورى الذى امتد من شمال العراق الى جنوبه.. كما عثرت بعثة اثارية دانماركية على تمثال طيني صلصالي يشبه في نموذجيته وصنعه ومواصفاته ملوك الاشوريين وبقايا تماثيلهم.

● اما في العهد الجاهلي الذي سبق مجئ الاسلام.. فان المنطقة المعروفة اليوم (بالكويت) كانت من جملة اصقاع بلاد المناذرة.. ولقد ذكر البلدانيون المؤرخون مشارف للبصرة هي (الكاظمة)و (اوارة) اللتان كانتا مسكناً لعشائر بني تميم.. وتذكر احداث التأريخ الحملة التأديبية التي شنها الملك العربي عمرو بن هند ملك الحيرة على بني تميم.. كما اكتشف في (الكاظمة) بقايا قصر الاميرة ابنة الملك المنذر..

واذا كانت (كاظمة)و (اوارة) مواقع مازالت موجودة ومعروفة في الكويت في هذه الايام فان المنطق الجغرافي يؤكد ان هذه المنطقة كانت تابعة لسلطة المناذرة العراقية.. والا فكيف يجوز بناء قصر للاستراحة لابنة الملك خارج مناطق دولته ونفوذه..؟؟.

● اما في العهد الاسلامي.. وبعد بناء البصرة.. وصيرورتها مركز استقطاب اسلامي في عصر معين.. فان المشارف والمناطق المجاورة صارت تتبعها رغم حداثتها بطبيعة المواقع السياسي والفكرى والعسكرى المستجد

وفي العهد الاموى

ظلت منطقة كاظمة (يومذاك) الكويت (حالياً) خاضعة للدولة الاموية وتابعة لولاية البصرة.. ونذكر سيرة الشاعر الفرزدق ان والي البصرة زياد بن ابيه حينما اصدر اوامره باعتقال الفرزدق لم يلق القبض عليه الا مختفياً في مسكن امرأة من بني قيس في الكاظمة

وفي العهد العباسي..

وبسبب من مركزية الحكم.. وهيمنة الدولة الواسعة.. صارت منطقة الكويت تتبع بغداد (مركز الخلافة)

وتسقط بغداد.. وتتشرذم الدولة بين دويلات ودويلات.. لكن تبقى منطقة الكويت جزءاً مهماً من مناطق البصرة.. تتشابه بينهما العادات و الاخلاق والتقاليد واللهجات.. وتمتزج مابين البصرة والزبير والكويت الوشائج حينما تقوى بالنسب والمصاهرة حتى وجدنا المؤرخ المعروف عثمان بن سند البصرى المولود في جزيرة (فيلكة) احدى جزر الكويت ينتسب الى البصرة..

## ظهور اسم الكويت

كانت المنطقة اذن تعرف باسم (الكاظمة).. ثم حينما بدأت طموحات الاجانب تمتد الى المنطقة.. إبتنى الملاحون البرتغاليون (الطلائع الاولى للاستعمار الغربي) حصناً في جزيرة تقابل موقع الكويت الان.. اعتبروها منطلق نشاطهم للغزو والاستيطان الاجنبي هذه الجريرة اسمها (القرين) ووردت في المؤلفات الانكليزية والبرتغالية بتسميات عدة منها:

CRAiN .

CRANE .

KUREiN .

اما تسمية الكويت فلم تظهر الا في العقد الثاني من القرن الثامن عشر وتحديداً عام ١٧٠٦ كما يذكر ذلك المؤرخ لوريمر.. حيث ظهرت ولاول مرة على خرائط المنطقة بعد ان انشأ شيخ بني خالد مدينة جديدة في موقع كانت فيه قرية صغيرة اتخذها بعض الصيادين من البدو مقراً لهم.

